# ڕۆشنتر لە ڕۆشنایی

## ڕاست کردنەوەی چەمکە هەڵەکان سەبارەت بە تێگەیشتن لە قورئان

عبد القادر علی



ناوی کتێب: ڕۆشنترلە ڕۆشنایی

نووسەر: م.عبدالقادر علي

تایپ: شیروان ئیبراهیم

نەخشەسازی بەرگ: بێساران فەیروز حەسەن

شوێنی چاپ: چاپەمەنی گەنج

چاپ: چاپی یەکەم

تیراژ: ١٠٠٠

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٦٤٩)ی ساڵی ٢٠١٠ی پێدراوە

# ڕۆشنتر

# لە

# ڕۆشنایی

ڕاستکردنەوەی چەمکە هەڵەکان سەبارەت بە تێگەیشتن لە قورئان

نووسینی

عبدالقادر علی

چاپی یەکەم

٢٠١١

روشنتر له روشنایی

بسم الله الرحمن الرحیم

﴿ ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴾

البقرة/٢

﴿ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنزَلَ عَلَى عَبْدِهِ الْكِتَابَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُ عِوَجًا ﴾

الكهف/١

## پێشکەش بێت بە:

ئەو خۆشەویستانەی بەهاری تەمەنیان لە خۆشەویستی خواو پەیام و پەیامبەرەکەی ﷺ بەیەکەوە بەسەر برد، بەڵام پلەو پۆست و پارەلەیەکی کردن. . . . . .

وەفایەك بۆ ئەو ڕۆژگارە نورینە. . . .

## پێشەکی:

ئەو دەمەی شەڕی (المنصورة) بە بەدیل گرتنی ـ لویسی نۆیەم ـ کۆتایی پێ هات، لەگەڵ خۆیدا جاری وەستانی شەڕی ـ سەربازی ـ خاچ پەرستی بوو دژ بە وڵاتانی ئیسلامی. ئەم شکستە سەربازییەی ڕۆژئاوا گەیاندیە ئەو قەناعەتەی کە داگیرکاری سەربازی ئا بەو جۆرە مەبەست ناپێکێت کە ئەمان وەك شەڕێکی کلاسیکی نەخشەیان بۆ دانابوو بە داگیرکاری ـ سەربازی ـ بتوانن ناسنامەی ئوممەتێکی خاوەن شارستانیەت لەناو بەرن و پاشان دەم لە خێرو بێری ڕۆژهەلاتی ئیسلامی وەردەن. ئەم شکستەیان بەو قەناعەتەی گەیاندن کە شەڕی سەربازی و داگیرکاری وڵاتان ـ وەك کۆتا مەبەست ـ دەستبەردار بن و بەڵکو تەنها وەك ئامراز بیهێڵنەوە تا لە میانەی ئەم داگیرکاریە سەربازیەوە بکەونە هەوڵی سڕینەوەی ناسنامەو شارستانیەتی ئیسلامی.

ئەوان لە میانەی گەڕانیان بە دوای نهێنی مانەوەی مسوڵمان بەو هێزو گەرم و گوڕیە بە ئایینەکەیان سەرەڕای ئەو هەموو کۆسپ و لەمپەرە گەورانەی دەخرایە بەردەم مسوڵمانان تێگەیشتن کە ئەوە ـ قورئانە ـ هێزی داینەمۆی بزاوتن و دەست گرتن بە پەیامی ئیسلامی و سوربوونە لەسەر پاراستنی ناسنامەی ئیسلامی بوون.

بۆیە ئەو دەمەی ـ گلادتسۆن ـ ی وەزیری بەریتانی دەڵێت:( تا ئەم قورئانە لە ناو مسوڵماناندا بمێنێت ئەوا ئێمە هیچمان بۆ بە هیچ ناکرێت ).

قسەکردن نەبێت لە نەخشەی داهاتوو هێندەی پەردە لادان بێت لە ڕاستیەك کە ئەو بەمانای وشە هەستی بە بوونی کردووە. ئەمەش ئەوەی لێ

خواستن کە دەست بەرداری شەڕی کلاسیکی جاران بن و پێ بنێنە قۆناغێکی تری شەڕ، کە ئەمجارەیان شەڕ شەڕی باروت و خوێن ڕژان و کاولکاری نیە، شەڕی ئەمجارە سەربازەکانی نوسەرو هونەرمەندو شانۆکارو توێژەرو پێنوس و کامێراو ... هتد. بە کورتی ئەوان لە دوو سەنگەری جیاواز لە یەك، بەلاّم بۆ یەك مەبەست کەوتنە پەلاماردانی لاشەی گەلانی مسولّمان .

لە هەردوو بەرەی:

**یەکەم/ بەرەی شەڕی ئارەزوبازی( الشهوات )**

کە تایبەت بوو بە جولاّندنی غەریزەو رەهاکردنی غەریزەی جنسی بەبێ لەبەر چاوگرتنی بەهاو ئایین وداب و نەریتێکی رەسەنی کۆمەلّگا. دیارە پشکی شێری ئەم شەڕە کەوتە ئەستۆی سینەماو شانۆو دراماو هونەر بە گشتی. کە تیایا چەقی خالّی بایەخدانیان لە خوار پشتوێن بوو، ئەمەش پرۆسەی دابەزاندنی پلەو پایەی مرۆڤە بۆ دنیای خوار خۆی کە دنیای گیاندارانە. لێرەوە گەنج و لاوی رۆژهەلاّتی بەدمەستی بادەی هونەرێکی قێزەون و لادەر لە خواستی هونەری بەرزو زەوقی هونەری بوون . دیارە ئەم خالّە بۆ کەسانی پسپۆڕی خۆی جێدەهێلّین.

**دووەم/ بەرەی شەڕی گومان دروستکردن ( الشبهات )**

لەم شەڕگەیەدا ـ گومان ـ دروست دەکرێت گومان و دوو دلّی لەسەر بونی خوا، قورئانی پیرۆز، پێغەمبەر(د.خ)، بنەماکانی ئیسلام . .... هتد . خالّی چەقی بایەخدانی ئەم لە پشتوێن بەرەو سەرووترە. واتە بیرو هۆش دەکەنە ئامانجی مەبەستیان تا لەسەر راستە شەقام لایدەن و بەلاڕێ و هەلّدێردا ببەن. یان لانی کەم کەمەندکێشی هەمان بیروبۆچونی خۆیانی بکەن.

ریشەی مێژووی ئەم شەڕە کۆنە، بەڵام لەم چەند سەدەی رابردوودا کەوتۆتە قۆناغێکی بەرنامە بۆ داڕێژراو و دامەزراوەوە.

بەگشتی ـ رۆژهەڵاتناسان ـ خاڵی دەسپێکی ئەم جۆرە شەڕەن، ئەو دەمەی بەشی هەرەزۆریان بە پشتگیری دەوڵەتەکانیان کەوتنە خوێندنەوەی رۆژهەڵات بە گشتی و ئیسلام بە تایبەتی لێرەوە بە پێی ویستی خۆیان مامەڵەیان لەگەڵ دەقەکانی قورئان و فەرموودەدا کردووە، بە ئارەزووی خۆیان کەوتونەتە دنیای ناشرینکردنی ئیسلام، لە لایەك وەك جۆرێك بەرگری بۆ خۆیان تا بە هۆی ئەو کاریگەریە توندەی کە هەیەتی ئیسلام کاریگەریان لەسەر دروست نەکات. لەولاتر کە ئەمەیان مەبەستمانە بە بیانوی زانستی بوون، بێ لایەنی بوون، ...... هتد . کەوتونەتە داتاشینی ـ شبهة ـ ی جۆراوجۆر کە ئەمە قۆناغی دروستکردنەو قۆناغی دوای ئەمیش کارەکە کەوتۆتە ئەستۆی مژدەدەرەکان ـ مبشرین ـ هەستن بە بلاْوکردنەوەی، چونکە کاری ـ رۆژهەڵاتناسەکان ـ بەندی کتێب و نوسینەکان بوو، بەڵام مژدەدەرەکان لەو کاتەوە تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت دەکەونە بلاْوکردنەوەو پەرەدان بەو راوبۆچون و ـ شبهة ـ انەی کە رۆژهەڵاتناسان خستویانەتە بەردەستیان. لێرەوە لێقەوماوی و دواکەوتویی و بارگرانی ژیانی ولاْتانی ئیسلامیان بەدەرفەت قۆستەوە کە لە هەر قۆناغێك لەو قۆناغانە لەژێر دروشمی فریا گوزاری و کاری مرۆیی و بەهاناچوون و لەگەڵ دەنکێك حەب و پاروە نانێك ـ گومانێك ـ تێکەڵاْو بکەن، دیارە لەبەر ئەوەی بیروباوەڕی خۆیان هێندە ئاڵۆزو نازانستیە جێگای پەسەندی هیچ تاکێکی ئاسایی نیە کەلە بارودۆخی دەروونی و ژیان و گوزەرانی ئاسایی بێت بۆیە لە جیاتی مژدەدان کەوتنە شکاندن و تۆمەتبارکردن و بەد گومانی

لەسەر ئیسلام، وەك ئەوەی بە لایانەوە گرنگ نەبێت ئاخۆ کەسی بەرامبەریان بڕوا بە ئەوان دەهێنن یان نا، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە چۆن لە بازنەی ئیسلام بیانکەنە دەرەوە، ئیتر دیارە کەلەبازنەی ئیسلام چووە دەرەوە ئەوا زۆر ئاسانە چیت بوێت لێی دروست دەکەیت و پێی دروست دەکەیت، لەم بەشە شەڕی - شبهات - بەشی هەرە زۆری ئاڕاستەی قورئان کراوە، ئەمیش هەروا لە خۆڕا نیە، چونکە قورئان یەکەمین سەرچاوەی دەستووری ژیانی مسوڵمانەو پەیامی ڕاستەوخۆی پەروەردگارە بۆ بەندەکانی. بۆیە گەر تاکی مسوڵمان ئاگادارو هۆشیار نەبێت ئەوا ئاڵاندنی گومان و دروستکردنی جۆرەها تۆمەتی نادروست لەسەر قورئان دوچار بە خزین و ترازان لە ئیسلامی دەکاتەوە، ئاشکراشە بەشێکی تری ئەم یەکدەنگی - شبهات - دروستکردنە لەسەر قورئان بۆ ئەوەیە کە ئەوان خۆیان خاوەنی کتێبێکی ئاسمانی یەکدەنگ نین بەڵکو لانی کەم ٤ جۆر - ئنجیل - یان لایە کە هەریەکەیان بە جۆرێك جیاواز لەوی تری نوسیەتەوە، پەردەپۆش کردنی خاڵی لاوازیان بە هێرش کردنە سەر قورئان ئەنجام دەدەن. وە خاڵێکی تر مانەوەی قورئان بە پارێزراوی و بێ هیچ دەستکاری و کەم و کوڕیەك بە پانتایی جوگرافیای زەوی و بە قوڵایی مێژوو جێگای ئیرەیی و هەڵشاخانیانە بە قورئان.

هەروەك قورئان جێگای یەکدەنگی مسوڵمانانە ئەگەر ئەوان بەد گومانی لەسەر قورئان دروست بکەن، ئەوا شتێکی تر نامێنێت کە یەکدەنگی مسلمانان بپارێزێت.

ئەمانەو زۆر خاڵی تریش هەن کە وایان کرد لەم کتێبەی بەردەستاندا تەنها ئاماژە بەو - شبهات - انە بکەم کە دژ بە قورئان دروست دەکرێت، کە بە

داخـەوە کتێبخانـەی ئیـسلامـی کـوردی زۆر لـەوە هـەژار حـاڵترە کـە خـاوەنی خانەیەکی تایبەت بێت بە پاراستنی نەوەکانی نوێ دژ بەو ـ شبهات ـ انـەی کـە ئاڕاستەی قورئان دەکرێن، ئەمـەش لە کاتێکدا کە ئەگەر پەنجەی کەم و کـورتی و هەڵە بدەیتە پاڵ کەسێك (کە شـایەنی هەڵەیـە ) بـا ٣٠٠ـ ٤٠٠ سـاڵ دوای دابەزینی قورئانیش ژیابێت ئەوا لە شەوو رۆژێکدا وەڵامدەدرێتـەوەو بگـرە بـێ بەزەییانە کەسی رەخنەگر دەکەوێتە بەر تانەو تەشەر کەچی قورئـانی پـیرۆز بـەو بەرزی و پارێزراویەی بە نوێـژی نیـوەڕۆ لـە بـەر چـاویاندا دوچـار بـە هەڵمـەتی ناشرینکردنی مـاناو هێرش کردنـە سـەر دەبێتـەوە کەچـی ئەمانـە جوڵـەیان لێ نایەت وەك ئەوەی زەمـەن ١٥٠٠ ساڵ لەمەو پـێش بێـت و ئـەمانیش لەبـەردەم هێرشی ـ ئەبرەهە ـ دا بڵێن ( إنَّ للكعبةِ رب يحميه ) .

راستە خوای گەورە پەیمانی پاراستنی قورئانی داوە. کە لە هەموو کـەم و کورتی و دەستکاری کردنێك بپارێزێت {إِنَّـا نَحْـنُ نَزَّلْنَـا الـذِّكْرَ وَإِنَّـا لَـهُ لَحَافِظُونَ}خوای گەورە پەیمانی پاراستنی خودی قورئانەکەی داوە کـە بەرچـاوەو هەموومـان دەیبینین، بەڵام پەیمانی پاراستنی لە گومـان و تێگەیشتنی هەڵـەی نەداوە.

ئەوە زانایانن کە دەبێت بەر بـەو گومـان دروسـتکردنە بگـرن بـە ئـەرکی مێژویی خۆیان هەڵسن کە پاراستنی نەوەکانـە لـەو لافـاوە هێرشـەی روبـەروی قورئانی پیرۆز دەبێتەوە.

عبدالقادر علی

سلێمانی

هەر کە گەیشتینە گەراج خزمان مالّاواییمان لێکردم، کاکی شۆفێر کە بینیمی خێرا خێرا هاواری دەکرد:

سلێمانی دوو نەفەر ........ سلێمانی دوو نەفەر ...

دیار بوو ئەو لای وا بوو زۆرین، بەلاّم کە بە تەنها بەرەو لای چووم و لە خزمان جیابوومەوە .. ئیتر تێگەیشت کە بە تەنهام بۆیە بە جۆرێك لە ناچاریەوە وتی:

سەرکەوە خوا کەریمە بۆ نەفەرێکی تر.

تەکسیەکە سێ نەفەری تری تیایابوو دوان لە پێشەوەو نەفەرێکی تر لە دواوە لە لای چەپی دەرگاکە دانیشتبوو..... هەر سێکیان هەر بۆڵەبۆڵیان بوو ..

دەمێکە چاوەڕێین، تاقەتمان نەما، ئاخر کاکە گیان هەموو ئیش و کاری دائیرەمان هەیەو فریا ناکەوین، ئەگەر هەر نەڕوات ئەوا خۆمان پارەی نەفەرەکەی تری بۆ کۆدەکەینەوە، یەکێك لەوانەی پێشەوە ئاوڕی بەلامدا دایەوەو وتی:

مامۆستا تۆ دەڵێی چی، با دوا نەکەوین ؟!

منیش ووتم:

لە ڕاستیدا من خۆم پەلەم نی یە حەزیش ناکەم ئەوەندە سەر بخەینە سەر کاکی سایەق و خێرا لێبخوڕێت، بەلاّم مادام بەڕێزتان هاوڕێی ڕێگامن و هەریەکەتان کارو ئیشی تایبەتی خۆی لە فەرمانگەی حکومەتدا هەیە، ئەوا منیش پێم باشە وەك بەڕێزتان بە هەر چوارمان پارەی نەفەرەکەی تر کۆبکەینەوە و زوو دەرچین.

کاکی شۆفێریش هەر لە دڵە راوکەدا بوو حەزی دەکرد زوو دەرچین بەڵام دیار بوو حەزیشی نەدەکرد داوای کرێی ئەو نەفەرەمان لێبکات بۆیە چاوەڕێی زەمەن بوو وەك چارەسەری حاڵەتەکە. چونکە لای وابوو ئەو رۆژانە ئەگەر کاروانێك بکات کاروانەکەش کرێی تەواوی دەست نەکەوێت ئەوا ناکرێت چونکە مەسروف گرانە. لە گەرمەی ئەم بەر خودەدا بووین، لاوێکی ٢٥-٣٠ ساڵە جانتایەکی لە کۆڵ و ئەوی تریشیانی بە دەستەوە بوو لە سەیارەیەکی تر دابەزی و رووەو لای ئێمە هات، بە جل و بەرگ و سەرو سیمای وا دیار بوو کە لە دەرەوە ژیا بێت و ئێستا بیەوێت بگەڕێتەوە بۆ کوردستان. وورده وورده لە سەیارەکەمان نزیك بۆوەو وتی:

سلێمانیە..... ؟

نەفەرەکان و شۆفێرەکە لە خۆشیا بەیەکەوە ووتیان:

بەڵێ .. بەڵێ ... سەرکەوە ئەرەوەڵا خۆیەتی .

کاکی سایەق خێرا دەرگای سندوقی بۆ کردەوە و جانتاکانی خستە ناوی... ئیتر کامێرایەکی ڤیدۆیی بچوك و بوتڵێك ئاوی بە دەستەوە گرت و هات و سەرکەوت و وتی:

باشن ... !؟

ئەم جارەش نەفەرەکان ووتیان:

باشین..... ئەگەر خێرا سەرکەویت و بڕۆین ئەوا باشتریش دەبین .

ئەویش وتی:

منیش پەلەمەو وەکو ئێوە حەز دەکەم زوو بڕۆین، بەڵام یەك تۆز بوارم بدەن با هەندێك پارە بگۆڕمەوە، چونکە لە تمەن و دۆلار زیاتر هیچی ترم پێ نیە.

چەند مەترێکی کەم لەولای سەیارەکەمانەوە کۆمەڵێك گەنج یەکی دەستەیەك پارەی جۆراو جۆریان بە دەستەوە بوو ...... هاواریان دەکرد ....

-دۆلار تمەن- دەکڕین و دەفرۆشین.

دیار وو شارەزای کارەکەی خۆیان بوون دەیانزانی ئەم برادەرە گەڕاوەتەوەو نێچیرێکی باشە بۆیە خێرا رووبەڕووی بوونەوە، بەڵام خۆشیەکەیان کەمی خایاند چونکە یەکێك لە نەفەرەکانی پێشەوە بە برادەرەکەیان ووت:

کاکە گیان پارەکەت هەمووی مەگۆڕەوە لە شار بیگۆڕیتەوە باشە، ئێستا تەنها ٥٠ دۆلاریەکت لێ زیادیشە .

برادەرانی پارە گۆڕەرەوە ئەم قسەیان پێ ناخۆش بوو بۆیە ناوچەوانیان دا بەیەکداو وەك بەیەکەوە بڵێن:

ئەرێ تۆ سەلکی سیری، یان قنچکی پیاز- تۆ حەقت چی یە کابرا بەپێی خۆی هاتۆتە بەردەستمان.

بۆ ئەوەی ئەمانیش تای تەرازوو بەلای خۆیاندا بشکێننەوە و وەڵامی ئەم برادەرە بدەنەوە یەکێکیان وتی:

خاڵە گیان ئێمەش کاسبین ... ئێمە ئەوە نین کە لێی دەترسن.... لە قۆڵبڕە گەورەکان بترسە....!

ئەم دەستەواژەیەم لا سەیر بوو دەبێت مەبەستی کێ بێت لە -قۆڵبڕە گەورەکان- ئایا مەبەستی بازرگانە یان سیاسی ؟ چونکە بە داخەوە قۆڵبڕ

جاران تەنها لە مەزاد خانەدا بووکەچی ئێستا لە پشت مێزو مایك و کۆنگرەو کۆنفراس و....... هتدو خۆیان مەلاس داوە، جڵەوی خەیاڵم شل کرد.

یاللە با بڕۆین.....ی کاکی شۆفێر بە ئاگای هێنامەوە.

وورده وورده کەوتینە ڕێ ئەم برادەرە حەزی دەکرد زیاتر سەیری ڕێگاو بان و دەشت و چیاکان بکات، لەگەڵ دنیای دەرەوەی سەیارەکە تێکەڵ بوو بوو، جار جار کامێراکەی دەردەکرد و بە کاکی سایەقی دەووت:

تکایە یەك تۆز هێواشی بکەرەوە، با ئەم دیمەنە جوانە بگرم، دەمێکە تامەزرۆی ئەم دیمەنانەم، لەگەڵ کابرای لای چەپم وورده وورده کەوتینە قسەکردن زۆر بێتاقەت بوو لە کاری فەرمانگەکان، لای وابوو هێندەیان هاتووچۆ پێکردووە برستی ئەوەی لێبڕاوە، گوایە بەتەما بوو بە هۆی نەخۆشیەوە خۆی خانەنشین بکات، بۆیە سەری نا بەسەر دەرگای سەیارەکەوەو کەوتە خەوتن، تەنها لە چاڵ و چۆڵی تاسەکان و وەستانی بازگەکان وەخەبەر دەهات، جامانەکەی سەر چاوی ڕاست دەکردەوە، دوو برادەرەکەی پێشەوەش لە نێوان خۆیاندا سەرقاڵی قسەکردن و خۆخەریك کردن بە مۆبایلەکانیانەوە بوون، تاونا تاو دەیان دایە قاقای پێکەنینێکی کورت چونکە خێرا یەکێکیان شانێکی لەوی تریان دەدا کە ئاگاداربە.کاکی سایەقیش کۆمەڵێ کاسێتی دەرهێناو یەکێکیانی خستە ناو تەسجیلەکەو وورده وورده خۆشی لەگەڵیدا دەیووتەوە. منیش نامیلکەیەکم لە کیسەکەی بەردەستم دەر هێناو کەوتمە خوێندنەوە. هەریەکەمان لە دنیای خەیاڵ و خەونی جیا لەیەکدا بووین، ئەوەی کە کۆی کردبووینەوە تەنها دانیشتنی ناو سەیارەکە بوو، ئەویش بە مەبەستی گەیشتن بە سلێمانی ، کاکی سایەق بۆ پشوودانێکی کەم لایدایە یەکێك لە

دوکانەکانی قەراغ ڕێگا، دیاربوو من و ئەم برادەرەی لای راستم پێمان باش بوو کە پشوویەکی کورت بدەین، بەلاّم سێ کەسەکەی تر کردیانە بۆڵەبۆڵ بەسەر سایەقەکەدا.

- کاکە وەستانی چی!! ئاوا بڕۆین فریای هیچ ناکەوین.

کاکی سایەقیش دیارە رۆژانە لەگەڵ ئەم دەستەواژەیەدا دەست و پەنجە نەرم دەکات بۆیە وتی:

کاکە گیان وەڵا لە ئێوە زیاترم پێخۆشە کە زوو بگەین، بەلاّم سەیارەکە گەرمی کردووەو پێویستە مەکینەکەی سارد بکەمەوە ـ وە خەمیشتان نەبێت ـ إنشاء الله ناهێڵم دوا بکەون.

ئیتر هەموو دابەزین و هەریەکەمان بە خواردنەوەی ساردیەك پشوویەکمان داو بای باڵی خۆمان داو خێرا کاکی سایەق ئاگاداری کردینەوە کە سەرکەوینەوەو بڕۆین.

لە کاتی سواربوونەوەدا چونکە من لە ناوەڕاستدا بووم خێرا سەرکەوتمەوە، برادەرەکەی لای راستم کە سەرکەوتەوە سەری دانەواند ملوانکەکەی گەردنی شۆڕبۆوە کە ـ خاچ ـ ێکی زێڕین بوو، یەکسەر خستیەوە باخەڵی و قۆپچەی کراسەکەی بەسەردا داخستەوە، دیارە ئەمەش هێمای ئەوەیە کە ئەم برادەرە ـ مەسیحیە ـ چونکە بە لایانەوە شتێکی پیرۆزە!! وا گومانم برد کە ئەم برادەرە یەکێك بێت لە هاوولاّتیانی مەسیحی ئەم شارە کە مێژوویەکە لەگەڵماندا خەم و شادیەکان بەش دەکەن و ئەوانیش لە خەم و ناسۆریەکاندا هاوبەشمان بوون، وە لەسەردەمی — شێخ مەحموود - دا کەسایەتی وەك کەریمی عەلەکە یان هەبووە

کە ناسراو بووە بە هەژار دۆستی و درێژکردنی دەستی یارمەتی بۆ بێ نەوایان و لێقەوماوان. ئیتر لەلای خۆم بوونی ئەم برادەرەم بەباش زانی کە ئەحواڵی چەند هاوڕێیەکی سەردەمی منالی و قوتابخانەو چەند مامۆستایەکی لێ بپرسم، بۆیە ووتم:

- وا دیارە جەنابتان لە هاندەران بووبن و ئێستا گەڕابنەوە؟

+ وتی : بەڵێ.

- چەند ساڵە؟

+ حەوت ساڵە .

بەم جۆرە گۆمی مەنگی بێدەنگیمان شکاند، ئەو تامەزرۆی هەواڵ و باسی لای خۆمان بوو، دەیویست جیا لە شاشەی کەناڵە ئاسمانیەکان کە هەندێکیان وێنەیەکی ناڕاستی بارودۆخی ژیانی ئەم دەڤەرە نیشان رای دەرەوە دەدەن. بزانێت وقەناعەتی بە قسەکانی ئەوان نەبوو، ئیتر هەردووکمان بۆ یەکتر بووینە هاودەمی ڕێگا.

حەزم نەکرد قسە لەسەر خاچەکەی گەردنی بکەم و ئەوە بکەمە دەسپێکێکی قسەکانم، چونکە لام وابوو ئەم ملوانکەیە دوای قەناعەت وباوەڕێك بە ئاینێك وەك شانازی دەربڕین لە گەردن کراوە، کەواتە دەبێت قسە لەسەر ئەسڵی مەسەلەکە بکەین.

وە یان ئەوەتە وەك لاساییکردنەوەیەك لە ڕۆژئاوا بینیویەتی و ئیتر ئەمیش کەوتۆتە لاساییکردنەوە، کە بە ڕای کەسێکی وەك - ابن خلدون - کەسی و گەلانی ژێر دەستە حەز بە لاساییکردنەوەی کەس و گەلانی دەسەڵاتدار دەکەن چونکە کەمو کورییەکانی خۆیانی پێ دادەپۆشن، واتە -

شعور بالنقص ـ هەستی خۆ بەکەم زانین ـ یان تیایە ئەمەش دووبارە پێویستی بە چارەسەری تایبەت هەیە بۆیە لام وابوو کە قسە لەسەر مەسەلە سەرەکیەکە بکەم و خۆم لە خۆ خەریك کردن بە شتە ڕوالەتیەکان ببوێرم کە زیاتر شتی عاتفین و بواری عەقلکاری نین، وە بە قسە پێوتن و گاڵتەکاری ناکرێت قەناعەتی کەس بگۆڕیت، بەڵکو بەبەر خودی هێمنانەو بەڵگە هێنانەوە کاریگەری دروست دەکەیت.

هەروەها قسە پێوتن و تانەو تەشەر لە هەر ڕێبازو بیروباوەڕێك شوێنکەوتووانی دووچار بە ـ استفزازـ دەکەیت و دەشێ دەرەنجامی نەشیاوی لێبکەوێتەوە.

منیش خەزم بەمانە نەبوو، بۆیە هێواش هێواش دەمویست سەرەداوی قسەکردن بەدەستەوە بگرم و هێدی هێدی بچمە ناو مەبەستەوە، لەوانەیە ئەویش خولیایەکی لەو شێوەیەی لە مێشکدا بووبێت کە بزانێت من چ جۆرە بیروبۆچونێکم هەیە، وە چۆن دەڕوانمە ژیان و دنیا بینیم چۆنە تا ئەویش کاڵای خۆی بخاتە ڕوو یان لانی کەم ڕێگای درێژی سەفەری پێ کورت بکاتەوە.

من لە قوڵایی بیرکەوتنەوەدا بووم ئاوڕێکی بەلامدا دایەوەو پەنجەی ئاڕاستەی مزگەوتێکی بچکۆلانەی یەکێك لە گوندەکانی سەر ڕێگا کردو وتی:

سەیرکە لە جیاتی ئائەمە قوتابخانەیەك یان نەخۆشخانەیەك دروست بکردایە باشتر نەبوو؟ تۆ سەیری کە ماڵەکانی خۆیان لە گڵە کەچی ئەمەیان لە کۆنکرێت دروست کردووە.

زانیم کە دەرگای وتووێژ بەبێ ویستی من خرایە سەرپشت، بۆیە وتم:

بەشێکی قسەکانی بەڕێزتانم قەبوڵە، بەلاّم بەشەکەی تریان سەرنج و قسەم لەسەری هەیە.

- وتی: بۆ؟!

+ ووتم: منیش هاوڕای جەنابتانم کە بوونی قوتابخانەو نەخۆشخانە لە پێداویستیە سەرەتاییەکانی ژیانن بەلاّم...

قسەکەی پێ بڕیم و وتی:

- بەلاّم مزگەوت نا ... ؟!

+ ووتم:

مزگەوت لە کوردەواری لای خۆمان روویەکی شوێنی ئەنجامدانی عیبادەتە، بەلاّم ئاشکراشە روویەکی تری لەخۆگرتنی زۆر بۆنەی کۆمەلاّیەتی جیاوازە، وەك پرسەی مردو وکۆبوونەوەی ئاشتەوایی و ......هتد، هەموو ئەمانە زەرورەتی بونی مزگەوت وەك دامەزراوەیەك دەسەلێنن، لە لایەکی تریشەوە ئایین بەشێکی سەرەکیە لە پێکهاتەی کەسایەتی تاکی کورد، خەخواردنمان لە کەسایەتی تاکی کورد بەبێ فەراهەمهێنانی پێداویستیەکانی پێکهاتەی کەسایەتی لارو ناهاوسەنگە.

پاشان قسەی منی مسولّمان نیە، بەلّکو قسەی مێژوونوسێکی مەسیحی رۆژئاوایە وەك ـ بلوتارك ـ د کە دەلّێت:( کاتێك لە مێژوودا قوولّدەبیتەوە، دەبینیت گەلی واهەبوو نەیزانیوە قەلاّ واتای چیە، وە هەبووە کۆشك و تەلاری نەزانیوەو نەبینیوە ..... بەلاّم هیچ گەلێك بەبێ بونی پەرستگایەکی تایبەت بە خۆیانت دەست ناکەوێت، هەرچەندە ئایین و پەرستشەکەیان لە شێوەیەکی زۆر سەرەتاییدا بووبێت ) ئەمەش ئەوە دەردەخات کە بونی پەرستگاو شوێنی

خواپەرستی لانی کەم پێداویستیەکی روحیە کە کەس ناتوانێت دەست بەرداری بێت. بێگومان تاکی کوردیش لەم هاوکێشەیە بەدەر نی یە بە تایبەت دوای ئەوەی رژێمی بەعس ـ مزگەوتەکانی رووخاند ئەوا خەڵکی شانبەشانی خانووەکانی خۆیان مزگەوتەکانیان دروستکردووە.

سەیرم کرد باش گوێی لێ گرتووم بۆیە بۆ ئەوەی نەبمە وتاربێژ پرسیارم لێ کردو ووتم:

- بەرێزتان سەیری ئەوەتان نەکردووە لە رۆژئاوادا چەندە کەنیسەی گەورە بونیان هەیە، هەندێکیان مێژووی دروست کردنیان دەگەرێتەوە بۆ مێژوویەکی زۆر کۆن؟

+ وتی:بەڵێ وایە ..... بەلاَم لەوێ ئابەم جۆرەی ئێرەی نیە کە هەر ٥ـ٦ ماڵ مزگەوتێکیان قوت کردۆتەوە، ئەڵێ ی ئەم خەڵکە کارو ئیشیان نیە تەنیا چوونە مزگەوت نەبێت.

ووتم: خەڵکی لەوێ خشتەی کاتی چوونە کەنیسەیان چۆنە؟

وتی: تەنها یەك شەممان خەڵکی سەردانی کەنیسە دەکات.

- ووتم: واتە هەفتەی یەك نوێژ دەکەن؟

+ وتی: بەڵێ .

ووتم: کەواتە هەر تاکێکی مسوڵمان ٣٥ ئەوەندەی تاکێکی مەسیحی پێویستی بە مزگەوت هەیە .

وتی: چۆن لە مەبەستت تێ ناگەم.

ووتم: هەفتەیەك ٧ رۆژە هەر رۆژەش ٥ نوێژی تیایا فەرز کراوە.

کەواتە مسوڵمان بەرامبەر بە یەکجار چوونە کەنیسەی مەسیحیەك ئەم ٣٥ جار دەچێتە مزگەوت.

وتی: جیاوازی زۆر هەیە لە نێوان کەنیسەو مزگەوت، کەنیسە لانکەی ئارامی و خۆشەویستی یە، بەلام مزگەوت جێگای شەڕو شۆڕو ترساندن و پرۆسەی لە خشتەبردنی خەڵکە.

وتم: ببوورە ئەم قسانە ـ ادعاء ـ ی بێ بەڵگەن هێندەی لە پۆستەرو دروشم دەچێت کەمترین پانتایی لە راستیەوە نزیك نیە، دەبێت بابەتیانە قسە لەسەر شتەکان بکەین نەك بە ئایدۆلۆژیایەکی پەنهانەوە ئاماژە وەرگریت، وە ئەگەر مزگەوت بەو شێوەیە بێت کە باسی دەکەیت دەبوایە لەلای ئێمە چەندین هۆلاکۆ و جەنگیزخانی بەرهەم بهێنانە، کەچی دەبینین دەرچوانی و گۆشکراوانی مزگەوت کەسانی پلەیەکن لە رۆشنبیری و ئەدیب و زاناو سەرکردەی جۆراوجۆر کە هەوڵ و کۆششیان بەبەرژەوەندی خاك و میللەتەکەیان شکاوەتەوەو .....

بێ دەنگیەك کەوتە نێوانمان، کاکی شۆفێر سەرێکی بادایەوە بە لاماندا و وتی:

زەحمەت نەبێ جامەکان بکەنەوە وا گەیشتینە بازگەکە.

ئیتر ئەم برادەرە کامێراکەی خستە جانتا بچوکەکەو جامەکەی دادایەوە، لە بازگەکەش بە ئاسانی رەت بووین و گرفتمان نەبوو.

بۆیە جارێکی تر من چاوەڕێ بوم ئەو قسەی خۆی بکات، پێم خۆش نەبوو بکەومە کوتان و تەنگە پێ هەڵچنینی بۆ هێنانە ناو باسێك کە ئەو حەز بە

چوونە ناوی نەکات، بەلاّم وا دیاربوو ئەویش لە خولیای ئەوەدا بوو کە باسەکە درێژە بکێشێت، بۆیە ئەمجارە وتی:

تۆ لە روانگەی دینەکەتەوە سەیری مزگەوت دەکەیت، بەلاّم من سەیری دەرەنجامی ئەوە ئەکەم ئاخۆ مزگەوت چ کارەساتێکی بەرهەم هێناوە !!!

ووتم: من باسی دینم بۆ نەکردیت و لە روانگەی ئیسلامەوە باسی گرنگی مزگەوتم بۆ نەکردی، بەڵکو دەرەنجامی هەوڵ و کۆششی مزگەوتم لە چەند سەدەی رابردوودا بۆ باسکردی.

بە دەرفەتم زانی ئاراستەی وتووێژەکە ببمە پێشترو لە دەوری بازنەیەکی بچوك خول نەخۆین، بۆیە هەر بە دوای ئەوەدا ووتم:

بەلاّم لە راستیدا ئەم راوبۆچوونەی بەرێزتانم لا سەیرە، چونکە مەسیحیەکانی ئەم شارە کە هاوولاّتی خۆمانن، ئەم جۆرە بۆچونەی جەنابتانیان نیەو ئەوان ئاوا ببورە گەر بڵێم داخ لە دڵ نین بەرامبەر مزگەوت. ئەم لێبووردنەش سیمایەکی جوانە کە رەگەزی هاولاّتی بوون بەهێز دەکات هەرچەندە باوەڕو ئایدۆلۆژیا لە یەك جیاوازبن، بە بێ هیچ پێشەکیەك یەکسەر وتی:

- جا ئەوانە چوزانن... ؟! ئەوانە کەی مەسیحین...؟!

+ووتم: بۆ کاکە گیان، ئەوان بۆ هیچ نازانن؟ بۆ کەنیسەو ئینجیل و پیاوی ئایینیان نیە ؟ بەرێزت بە چ حەقێك ئەم مافە بە خۆت دەدەیت کەلە بازنەی مەسیحیەت بەبێ ئاگایان بدەیتە قەڵەم .. ؟

- کەمێك وەستام منیش ئەوەی ناوبڕێك بخاتە قسەکانم دووبارە ووتم:

بەڕێزتان ئەوەندەی لە رۆژئاوان لەویَ وەك خوێندن لە زانکۆ تایبەتـەکانی ئەوێدا تایبەت بە مەسیحیەت هیچت خوێندۆتەوە .؟

+ وتی: وەك خوێندن نـەخێر هیـچم نەخوێنـدوە ؟ بـەلاَم چـەند دەورەیـەکم بینیوە، لەویَ ـ مەسیح ـ م ناسی دەرگای دلّم بۆ خستە سەر پشت .

ووتم: وادیارە کە پێشتر ـ مەسیحی ـ نەبون واتە هاولاَتیـە مەسـیحیەکانی ئەم شارەی خۆمان نەبون.

وتی: بەلّیَ وایە من لەویَ بومە مەسیحی . !!

ووتم: دیارە کوردەواری دەلّێت: کاسە لە کەوچك گەرمترە.

زەردەخەنەیەکی شەرمنانەی کرد. ویـستم هیلاکـی نەکـەم و یـان جۆرێـك ئیحراجی لە لا دروست نەبێت، بۆیە ووتم:

خوای گەورە مرۆڤی ـ سەربەست ـ کردووە، بەلاَم گرنگ ئەوەیە ئـەوەی کـە هەلّی دەبژێریت لە دوای ووردبوونەوەو قەناعەتێکی زانستی پتـەوەو بێـت نـەك رۆژێك لە رۆژانی ناچاریو بارودۆخی تایبەت دووچار بەوەیان کردبێت.

ئەگەر بەڕێزت بەوپەڕی قەناعەت و دوای بەراووردکاریەکی وورد بەم کـارە هەستا بیت ئـەوا مـن و تـۆ قـسەمان دەبێـت. بـەلاَم خـۆ ئەگـەر بـارودۆخێکی تایبەتیش پالّی پێوە ناویت، ئەوا دەشێت بلّێم: جێی خۆیـەتی بـەڕێزت چـاوێك بەو بڕیارە چارەنووس سازەدا بگێڕتەوە. چی دی رووداوەکان پەلکێش نەکەن، تۆ رووداو دروست بکە.

وتی: دڵنیا بە ـ بڕیاری خۆم بوە ـ و منیش حەز دەکەم قسە بکەین، بەڵام واش نەزانی من هیچ لە ئیسلام و قورئان نازانم، لە مەلایەکی ١٢ عیلم زیاتر دەزانم !! وە لە خانەوادەیەکم کە هەموویان ئیسلامن .. !!

- ووتم: ڕێزم بۆ یەکەیەکەی خانەوادەکەت هەیە، بەڵام خۆت پێشتر بیرو بۆچونت چۆن بوو.؟

+ وتی: ئەو دەم لەگەڵ چەپەکان کارم دەکردو لە ژێر کاریگەری ئەدەبیاتی ئەواندا بووم. بەڵام وەك باسم کرد دوایی لە ئەوروپا وازم لێ هێنان.

یەکێك لە نەفەرەکان وتی:

کاکە گیان ئا لەم ناوەدا دادەبەزم. ئاگاداری کردینەوە کە ئێمە لە قەراغ شارداین، بۆیە پێم باش بوو ئەو ماوەی چەند ساڵە شاری نەدیوە بێ دەنگ بم تا بە ئارەزووی خۆی لە دەروازەی شار وردبێتەوەو بکەویتە شەن و کەوکردنی یادەوەریەکانی...

دیارە ئەویش حەزی لە قسەکردن بوو، ئەویش خۆی بە خاوەنی پەیامێك دەزانی دەیویست بیگەیەنێت، بۆیە وتی:

ببورە مامۆستا وا گەیشتینە ناو شار بەڵام قسەکانمان نیوە چڵن و ئەگەر پێت خۆش بێت و بوارت هەبێت ئەوا پێم خۆشە زیاتر بەیەکەوە بدوێین، بەڵام نازانم چۆن یەکتری ببینین، چونکە من بۆ ماوەی ٧ـ١٠ ڕۆژ بە هۆی میوانەوە لەوانە نیە، بوارم بۆ بڕەخسێت، بۆیە وا باشە ژمارە تەلەفۆنەکەتم بدەیتێ کە بوار ڕەخسا خۆم ئاگادارت دەکەمەوە.

ووتم: منیش پێم خۆشە، بەڵام دەبێت پێشتر دیاری بکەین قسە لەسەر چی بکەین تا گفتوگۆکەمان هەم زانستیانەو هەم بەرهەمدار بێت، بۆیە منیش

- کەمێك وەستام منیش ئەوەی ناوبڕێك بخاتە قسەکانم دووبارە ووتم:

بەڕێزتان ئەوەندەی لە رۆژئاوان لەویّ وەك خوێندن لە زانکۆ تایبەتەکانی ئەوێدا تایبەت بە مەسیحیەت هیچت خوێندۆتەوە .؟

+ وتی: وەك خوێندن نەخێر هیچم نەخوێندوە ؟ بەلاّم چەند دەورەیەکم بینیوە، لەویّ ـ مەسیح ـ م ناسی دەرگای دلّم بۆ خستە سەر پشت .

ووتم: وادیارە کە پێشتر ـ مەسیحی ـ نەبون واتە هاولاّتیە مەسیحیەکانی ئەم شارەی خۆمان نەبون.

وتی: بەلّیّ وایە من لەویّ بومە مەسیحی . !!

ووتم: دیارە کوردەواری دەلّێت: کاسە لە کەوچك گەرمترە.

زەردەخەنەیەکی شەرمنانەی کرد. ویستم هیلاکی نەکەم و یان جۆرێك ئیحراجی لە لا دروست نەبێت، بۆیە ووتم:

خوای گەورە مرۆڤی ـ سەربەست ـ کردووە، بەلاّم گرنگ ئەوەیە ئەوەی کە هەلّی دەبژێریت لە دوای ووردبوونەوەو قەناعەتێکی زانستی پتەوەو بێت نەك رۆژێك لە رۆژانی ناچاریەو بارودۆخی تایبەت دووچار بەوەیان کردبێت.

ئەگەر بەڕێزت بەوپەڕی قەناعەت و دوای بەراووردکاریەکی وورد بەم کارە هەستا بیت ئەوا من و تۆ قسەمان دەبێت. بەلاّم خۆ ئەگەر بارودۆخێکی تایبەتیش پالّی پێوە ناویت، ئەوا دەشێت بلّێم: جێی خۆیەتی بەڕێزت چاوێك بەو بڕیارە چارەنووس سازەدا بگێڕتەوە. چی دی ڕووداوەکان پەلکێش نەکەن، تۆ ڕووداو دروست بکە.

وتی: دڵنیا بە ـ بڕیاری خۆم بوە ـ و منیش حەز دەکەم قسە بکەین، بەڵام واش نەزانی من هیچ لە ئیسلام و قورئان نازانم، لە مەلایەکی ١٢ عیلم زیاتر دەزانم !! وە لە خانەوادەیەکم کە هەموویان ئیسلامن .. !!

- ووتم: رێزم بۆ یەکەیەکەی خانەوادەکەت هەیە، بەڵام خۆت پێشتر بیرو بۆچونت چۆن بوو.؟

+ وتی: ئەو دەم لەگەڵ چەپەکان کارم دەکردو لە ژێر کاریگەری ئەدەبیاتی ئەواندا بووم. بەڵام وەك باسم کرد دوایی لە ئەورووپا وازم لێ هێنان.

یەکێك لە نەفەرەکان وتی:

کاکە گیان ئا لەم ناوەدا دادەبەزم. ئاگاداری کردینەوە کە ئێمە لە قەراغ شارداین، بۆیە پێم باش بوو ئەو ماوەی چەند ساڵە شاری نەدیوە بێ دەنگ بم تا بە ئارەزووی خۆی لە دەروازەی شار وردبێتەوەو بکەویتە شەن و کەوکردنی یادەوەریەکانی...

دیارە ئەویش حەزی لە قسەکردن بوو، ئەویش خۆی بە خاوەنی پەیامێك دەزانی دەیویست بیگەیەنێت، بۆیە وتی:

ببورە مامۆستا وا گەیشتینە ناو شار بەڵام قسەکانمان نیوە چڵن و ئەگەر پێت خۆش بێت و بوارت هەبێت ئەوا پێم خۆشە زیاتر بەیەکەوە بدوێین، بەڵام نازانم چۆن یەکتری ببینین، چونکە من بۆ ماوەی ٧ـ١٠ رۆژ بە هۆی میوانەوە لەوانە نیە، بوارم بۆ بڕەخسێت، بۆیە وا باشە ژمارە تەلەفۆنەکەتم بدەیتێ کە بوار رەخسا خۆم ئاگادارت دەکەمەوە.

ووتم: منیش پێم خۆشە، بەڵام دەبێت پێشتر دیاری بکەین قسە لەسەر چی بکەین تا گفتووگۆکەمان هەم زانستیانەو هەم بەرهەمدار بێت، بۆیە منیش

خۆشحاڵم، ئیتر ناوو ژمارەم پێدا هەر لەوێدا لە یەك جیابووینەوە، من بەرەو ماڵ گەڕامەوەو ئەویش بەسواری تەکسیەك لە من جیابۆوە.

هەفتەیەك تێپەڕیو هیچ پەیوەندیەکم پێ نەگەیشت، بەڵام ڕۆژی دواتر زەنگی تەلەفۆن لێیدا خۆی بوو، خێرا خۆی ناساندەوەو وتی:

ببورە ئەم ماوەیە بە هۆی سەرقاڵیەوە پێم نەکرا پەیوەندیت پێوە بگرم. خۆشم دەمزانی هەروا دەبێت بۆیە وتم:

٧ـ١٠ ڕۆژ بوارم بۆ نارەخسێت، بەڵام بڕوا بکە هەر لەخەیاڵمدا بویت، ئێستا کە دەست بە تاڵ بوم حەز دەکەم کات و شوێنێك دیاری بکەیت و بەیەکەوە بەر خوردێك بکەیت.

منیش لای خۆمەوە خۆشحاڵی خۆم دەربڕی و بڕیارماندا سبەینێ سەر لەبەیانی لە کتێبخانەی گشتی یەکتری ببینین.

وورده وورده ماڵەوەم بەجێ هێشت و بە پێ بەرەو کتێبخانە بەرێ کەوتم، بەپێ ڕۆیشتن هەروەك بۆ تەندروستی باشە زۆر یاریدەی بیرکردنەوەم دەدات، لەبەر ئەوەی زوو لە ماڵ دەرچوبووم کاتێك کە گەیشتمە کتێبخانە هێشتا چەند دەقیقەیەکی کەمی مابوو بۆ کاتی دیاری کراو چوومە ژوورەوەو دەفتەرە بچووکەکەی باخەڵم دەرهێنا خەریکی تۆمارکردنی سات و ڕۆژی ئەم یەکەم دانیشتنە بووم. زەنگی مۆبایل لێیدا وتی: بەرێگاوەم بۆ لات، بەس ڕێگاو بان قەرەباڵغە، نەك دواکەوم داوای لێبوردن دەکەم.

هێندە لە کاتی دیاری کراو تێنەپەڕی کە خۆی بە ژووردا کرد، بەڵام ئەمجارە سەرو سیمای خۆی گۆڕی بوو ڕەنگی خۆماڵی لێ نیشتبوو.

لە کتێبخانە ئارام ترو شیاوترمان دەست نەکەوت کە تیایا قسەبکەین ناو بازاڕو شوێنە گشتیەکان بۆ ئەم جۆرە دانیشتنانە دەست نادەن، هەر چەند زۆرینەی ئەوانەی کە لە کتێبخانە بوون قوتابی قۆناغی جیاجیای خوێندن بوون و بۆ سەعی کردن هاتبوونە ئەوێ، دووبارە وەك لانەیەکی ئارام پەنایان بۆ هێناوە.

بۆیە ئێمە هەردووکمان لەلای خۆمانەوە هەستمان بە جۆرێك ـ احراج ـ بوون دەکرد، چونکە کەش و هەوای ئەوێ ئەوەندەی بۆ خوێندن و خوێندنەوە بوو ئەوەندە بۆ قسە کردن شیاو نەبوو، قسەکردنێکیش کە وتووێژو ڕاگۆڕینەوە بێت، بەلاّم چارمان ناچار بوو شوێنێکی کەنارمان دۆزیەوەو بڕیارماندا هێندەش دەنگ هەڵنەبڕین کە بەرامبەرەکانمان بێزار بکەین.

هەر کە دانیشتین من دەفتەرو قەڵەمەکەم لە سەر مێزەکە دانا، ئەویش دەستی کرد بە گیرفانیدا پاکەت و چەرخەکەی خستە سەرمێزەکەو لە نزیك دەفتەرەکەم داینا.

ووتم: لە کتێبی پیرۆزدا ـ وا هاتووە کە ـ سەرەتا ووشە بوو ـ کەواتە دەبێت بە ووشە دەست پێ بکەین، بەلاّم دیارە پێش ووشە، پێویستمان بەیەکتر ناسینێکی زیاتر هەیە، وا بزانم ئەو ڕۆژە لە سەیارەکەدا ئەوەی قسەمان لی نەکرد یان بە پێویستمان نەزانی یەکتر ناسین بوو، بۆیە لام وایە باشترین دەستپێك یەکتر ناسینە.... . یەکسەر وتی.

من ناوم ئازادە، تەمەنم ٢٨ ساڵە، خوێندنی ئامادەییم تەواو کردووە، ٧ ساڵە لە هەندەرانم، پێشتر ـ ئیسلام ـ بووم!! ( بە پێکەنینەوە) ئیستاش ئەوەم کە دەم بینی ـ مەسیحی ـ م بە قەناعەتیشەوە ئەم بڕیارەم داوە بۆ ئامادەی

ڕووبەڕووبونەوەم، لەگەڵ خوێندنەوەش باشم، هەرچەندە وەك زمان لە کوردی زیاتر ناتوانم بخوێنمەوە، ووتم:

- ئەی ژیانی هاوسەریت پێك نەهێناوە؟

+ وتی: نەخێر.

- ووتم: ـ بە پێکەنینەوە ـ کەواتە بوخچەی نەکراوەی؟

+ وتی: یەکێك لە مەبەستەکانی هاتنەوەم ئەمجارەیان هەر ئەو باسەیە.

دواتر منیش خۆمم ناساند، ووتم: منیش تەمەنم ٣٥ ساڵەو دەرچووی زانکۆم و ئێستاش خێزاندارم.

ئیتر کاتی ئەوەیە بچینە ناو باسەکەی خۆمانەوە.

ئەویش ووتی:

منیش پێم باشە بەڵام یەکتر ناسینیش پێویست بوو...

سەرە هاتە سەر من و ئەمجارەیان قەڵەمەکەم بە دەستەوە گرت و ووتم:

بەڕێزت وەك خۆت ئاماژەت پێدا وادیارە پێشتر مسوڵمان.. !! بوویت. بەڵام دوایی لەهەر بارودۆخێك و هۆکارێکدا بوویت ئەم بڕیارەت داوە کە ئایینی خۆت بگۆڕیت، ببورە گەر بڵێم پێشتر ـ مسوڵمان ـ بوویت !!! چونکە تەنها نوسینی ـ مسلم ـ لە ناسنامەدا نابێتە مایەی پەیامدار بوونی کەسێك و تێگەیشتنی دروست و پێویست لەو ئایینە، تۆ دەستبەرداری ئایینێك بویت و چویتە سەر ئایینێکی تر بۆیە دەبێت قسەکانمان بکەینە دوو تەوەری تەواو لە یەك جیاو هەوڵ دەدەین تێکەڵاویان نەکەین.

## تەوەرەی یەکەم:

- تۆ چۆن دەستبەرداری ئیسلام بویت؟ چەندە لە ئیسلام گەیشتویت تا ئاوا دەستبەرداری بوویت ؟ ئایا مسوڵمان بوونی تۆ لە پێشتردا بە قەناعەتەوە بوو یان وەك هەر تاکێکی ئاسایی لە خێزانێکدا گەورە بویت کە مسوڵمان بوون بەڵام هیچیان لە ئیسلام نەزانیوە، تەنها ئەوەندە نەبێت کە ئیسلام واتە نوێژو ڕۆژوو؟!!!

جەنابت ئاماژەت بەوەدا کە ئاستی خوێندنت لە ئامادەیی تێپەڕاندووە، دوایی لەگەڵ ڕەوتی چەپ و چەپ ڕەویدا تێکەڵاو بوویت، دیارە هەڵوێست و ئەدەبیاتی ئەوانیش دیارە کە چەندە بە ئیسلامدا هەڵدەشاخێن، چونکە شکستی ئایدۆلۆژی خۆیان و لەدەستدانی بنکەی جەماوەریان بەدەستی ئەو دەزانن.

واتە تۆ هێشتا ئیسلامت نەناسی لەسەر رق لێبوونەوەی گۆشکراوی؟ وە ئایا بەڕێزت کە ئاماژەت بەوەدا خوێندنەوەت زۆرە چ سەرچاوەیەکت خوێندۆتەوە؟ لەو سەرچاوانەت خوێندۆتەوە کە نوسەرە عەلمانی و لیبراڵی و بگرە مەسیحیەکان لەسەر ئیسلامیان نوسیوە! خۆت بێ لایەنانە حوکم بدە بزانە ئایا ئەمانە هیچ قسەیەکیان لێ وەردەگیرێت. چونکە سەرەتایی ترین مەرجی نوسین ئەوەیە کە بابەتی بوون و بێ لایەنی بێت، ئەمانە لەیەکەم دێڕی نوسینیانەوە لە دەستیان داوە.

ئیتر تۆ چۆن دەتوانی ئەوە بە من بڵێیت - ئیسلام - بوونی خۆت بەسەر منەوە بکەیتە ماڵ، کە تۆ تەمەن و خوێندن وخوێندنەوە پەروەردەی خێزان و زۆری تر هێشتا قسەیان لەسەرە.

## تەوەرەی دووەم:

- ئەم تەوەرەم زیاتر لە لا جێگای قسەکردنە جەنابتان بەو هەموو تێبینیە کە هەمان بوو لەسەر قۆناغی کە خۆت ناوی دەبەیت تیایا - مسوڵمان - بویت، کەچی بویتە هەڵگری ئایینێکی تر کە سەرانسەر دنیا بینینیان لە یەك جیاوازە - گۆڕین و دەستبەرداری ئایین - وەك گۆڕینی پارت و رێکخراو نیە، کە بەرژەوەندیەکی پلەو پۆست و پارە تیایا تەوەرەی باسە، ئایین تێڕوانینێکی قوڵ و خوێندنەوەی گەردون و ژیان و تێگەیشتن لە ژیان و مرۆڤ و ناسینی پەروەردگارە، هەڵوێستە لەسەر کەسایەتی پێغەمبەران و پەیامە ئاسمانیەکانی تر... وە ئایا ئەوەی کە هەر چۆنێك بێت ئەمڕۆ خۆت قەناعەتت پێیەتی تا چەندە بە قەناعەت و شیتەڵکردن و ووردبوونەوە وەرتگرتووە؟! ئایا لە رقی پێشوو ئەمەت هەڵبژاردووە یان ئەوەتا پایە بە پایەی ئەم ئایینە تازەت شەن وکەو کردووە ئەوسا بڕیارت داوە. بۆیە وام پێ باشە ئەم تەوەرە بخەینە دواوە سەرەتا لەسەر تەوەرەی یەکەم بدوێین، کە لە تەوەرەی یەکەم تەواو بووین ئەوسا قسە لەسەر تەوەرەی دووەم دەکەین.

- وتی: تەواو بویت؟

+ ووتم: بەڵێ فەرموو بەڕێزت چیت هەیە گوێم لێتە.

وتی: پێم باشە کاتژمێرێك دانێین و کاتەکان بەش کەین.

ووتم: من زۆر لەلام گرنگ نیە ، گرنگ ئەوەیە تا بەڕێزتان قسە بکەن ئەوا من گوێتان لێ دەگرم، وە هەوڵ دەدەم لە هەمان کاتدا وەلامی بەڕێزتان بدەمەوە، بەلاشمەوە گرنگ نیە تۆ زیاتر بدوێیت یان من، بەلام دەبێت ئەوەت

لە خەیاڵدا بێت کە تۆ پرسیار دەکەیت بەڵام من وەڵامت دەدەمەوە، بۆیە ئاساییە کە من پێویستیم بە کاتی زیاترە.

زەردەخەنەیەکی کردو وتی: دیارە دەتەوێت بڵێی بڕوام بە یەکسانی نیە.

ووتم: دیارە یەکسانی لەمەدا نابێت بەڵکو دادگەری زیاتر شیاوە، خۆشت دەزانی ئەم دوو چەمکە لە یەك جیاوازن، ئەمە لە لایەك لە لایەکی ترەوە ئەوەت بیر دەهێنمەوە جەنابت ئێستا پرسیار دەکەیت و ئازادی چۆن پرسیار دەکەیت لە بارەی قورئان و ئیسلامەوە، هیچ گل مەدەرەوەو ئەم جۆرە دانیشتنانە خاترو خۆی تیا نیە، بۆیە وام پێ باشە هەرچیت هەیە بەوپەڕی ئازادیەوە راوبۆچوونەکانت بخەیتە روو، جا هەر کات کە تەواو بوویت، ئەوا منیش قسەم هەیە لەسەر چەمك و پێکهاتەو پایەکانی مەسیحیەت، پێم باشە راشکاوانە لەسەری بدوێین.

ئەویش بەوپەری متمانەو باوەڕ بەخۆبوونەوە، وتی:

تۆ چۆنت پێ باشە منیش هەروا، بەڵام لەوانەیە قسەی زۆری ئاراستەی قورئانەکەتان بێت، ئەو کتێبەی کە لاتان وایە پەیامی خوایەو ـ معجزە ـ یە، وە نابێت دڵگران بیت ئەگەر من بە زەقی دابەزمە سەری چونکە من قەناعەتم خۆم وایە کە قورئان ئەوە نیە کە ئێوە تێی گەیشتوون.

ووتم: زۆر باشە. بەڵام گەر بکرێت پێم باشە ئەو تێبینی و رەخنەو گازندانەی کە هەتە بە نوسراوی بخەیتە روو. تا سوود لە کاتەکانمان وەربگرین ئەوەی کە قسەمان لەسەر کرد جارێکی تر نەگەڕێینەوە سەری.

وتی: پێویستیم بە نووسین نیە، چونکە خۆم لە هزری خۆمدا گەلاڵم کردوون و بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدا بووم گەر قسەم لەگەڵ یەکێکدا کردبێت ئەوا خستوومنەتە روو.

ووتم: دیارە ئەم پرسیارانەت لە لای خۆت بە گرێ کوێرەیەك داناوە. لات وابووە کە بێ وەلاّمن، وە ئەمەشت کردووە بە گۆشتی قولاپەکەت بۆ راوکردنی ماسیەکان، ئێستا تۆ لای خۆت یەك لایەنە ئەو بڕیارەت داوە کە ئەم پرسیارانە بێ وەلاّمن. بەلاّم لە رووی زانستیەوە ئەم گریمانەیە راست نیە، هەرکات وەلاّمت بەبەڵگەوە هاتە بەردەست دەبێ قەناعەت بکەیت. چونکە راستی زۆر لەوە گەورەترە کە بە عینادی و خۆ پەسەندی بەری بگریت. من کارم بە قەناعەتی تۆ نیە ئەوەندەی کار بۆ خستنەرووی راستیەکان و رەواندنەوەی گومانەکان دەکەم. لەولاشەوە شەن و کەوێکی ئەم بیروباوەڕە تازەیەت لەگەڵدا دەکەم. بزانم ئەو هەوڵ و خۆماندووکردنەت بۆ رەخنەگرتن لە قورئان سەرچاوەیەکی زانستیە یان دەمارگیریەکی بێ وێنەیە لە پشتەوە ئاڕاستەکاری دەکات. چونکە من بێ گومانم بە چارەکی چارەکێکی هەوڵ و خۆماندووکردنەکەت بۆ رەخنە داتاشین لە قورئان گەر سەیری بیروباوەڕی تازەی خۆتی پێ بکەیت ئەوا دەزانیت تۆ حەقیقەتت جێهێشتووەو دەستت بەخەیاڵەوە گرتووە، بەلاّم بێگومان دەرگاش لەسەر پشتەو بفەرموو چیت هەیە با قسەی لەسەر بکەین.

ئەویش زەردەخەنەیەکی کردو وتی:

سوپاس منیش پێم باشە ئاوا راشکاوانە بدوێین، حەز دەکەم سەرەتا قسە لەسەر قورئان بکەین هەر ئەو قورئانەی کە پێشتر ووتم لاتان وایە تاکە ـ

معجزە ـ ی بەردەوامە بەلاَم من لای خۆمەوە قسەی زۆرم هەیە کە ئەم قورئانە ـ محمد ـ خۆی نووسیویەتی خۆی دایرشتووەو رازاندویەتیەوەو معجزەی جۆراو جۆری تێکردووە پاشان داویەتیەوە پالْ خوا. وە ووتویەتی ئەمە وەحی خوایە. تا جۆرێك پیرۆزی بۆ خۆی فەراهەم بهێنێت.رێزو حورمەتی خەلْکی بۆ لای خۆی راکێشێت و ببێتە جێگای متمانەی خەلْکی، تا لێرەوە ئارەزووە دونیاویستیەکەی خۆی لە حوکم و سەرکردایەتی و پاوانخوازی بەدی بهێنێت.

ووتم: تەواو.

وتی: بەلْێ.

- ووتم: کاتێك کە هاتیتە ژوور پیاوێکی ٥٠ سالْەت بینی کە کارگوزار بوو لە باخەکەدا خەریکی باخەوانی بوو، بێگومان نەخوێندەوارە، پێش ئەوەی وەلاَمی پرسیارەکەت بدەمەوە تا چەندە قەناعەت دەکەیت کە ئەم پیاوە نەخوێندەوارە نەخشە سازی چەندین ساختمانی هەور بڕ، ناطحات السحاب ـ ی لە رۆژئاوا وەکو دوو تاوەرەکەی ١١/سیبتمبر کردبێت؟

+ وتی: بێگومان باوەڕ ناکەم.

- ووتم: ئەی تا چەندە لە باوەڕ بەوە دەکەیت کە ئەم پیاوە نەخوێندەوارە ـ چیرۆکی شارستانیەتیەکان ـ ی نووسیبێت ؟ یان رۆمانی ـ دایك ـ یان شانۆگەری بازرگانی ـ ڤنیسیا ـ ی نووسیبێت.

+ وتی: ئەوەندەی من بزانم چیرۆکی شارستانیەتیەکان لە نووسینی (ولیۆ دۆرانت)ە کە چەندین بەرگە، وە رۆمانی دایك لە نووسینی ( مکسیم گۆرگیێ)یە شانۆگەریەکەش لە نووسینی (شکسپیر)ە، بێگومان قەناعەت ناکەم ، بەلاَم تکایە ئەمە بەوەی پێشووەوە مەبەستەوە؟

ووتم: کاکە گیان من وەلامی پرسیارەکەت دەدەمەوە بەلاّم حەزم کرد بزانم تا چەندە ـ قەناعەت ـ ت سەربەخۆیە. چونکە ئەگەر مەسەلەکە ـ قەناعەت ـ بوایە دەبوایە ئیتر ئەو قسەیەت نەکردایە چونکە ئەو کتێبانە لە چاو قورئانـدا هەر هیچ نین و بەراوورد ناکرێن.

قورئان ١٤٠٠ ساڵە ڕەوتی ژیانی مرۆڤایەتی گۆڕیوە چۆن هەروا سادەو ساکار بۆی دەڕوانی بەلاّم بەهەر حاڵ بێینەوە سەر قسەکانی بەڕێزتان ئەگەر قورئان وتەی پێغەمبەر بووایە ـ د.خ ـ ئەوا ئاشکرایە کە فەرموودەکانی خۆی کە لەزاری خۆیەوە دەرچووە هەرگیز وەکو قورئان نین، ئەمەش هەموو عەربی زانێک بەچاوپیاخشاندنێکی خێرا جیاوازی ئەو دوو جۆرە قسەیەی بۆ دەردەکەوێت، ئەگەر بە قسەی بەڕێزتان بووایە نەدەبوایە فەرموودەی ببوایە، دەبوو هەموو قسەکانی قورئان بونایە، چونکە دیارە کە ئەمە زۆر زۆر لە قسەی ئاسایی کاریگەرترو ڕەوانبێژترە.

جیاوازی ئەو دوو جۆرە لە قسەکردن زۆر زۆر روونەو پێویست بە خۆماندوو کردن ناکات.

قورئان خاوەنی گەر بگونجێت بڵێم شێوازو ستایڵ و سەبکی تایبەت بە خۆیەتی، چونکە قورئان وەك ـ معجزە ـ هاتۆتە خوارەوەو ـ تحدی ـ ی هەموو خەڵکی زمانزان وزمانپاراوی ئەو سەردەمەی خۆی کردووە کە هەموویان لە ئاستیدا دەستە پاچەبوون. کەس نەیتوانیوە بەرەنگاری ببێتەوە یان ڕەخنەی لێ بگرێت یان وەکو ئەو بیڵێتەوە یان هەرنا دەستکاری بکات و لە مانای خۆی لای بدات، بەلاّم ـ قورئان ـ قورئانەو بەس.

وتی: بەلاّم مامۆستا قسەكانی ـ محمد ـ دووجۆرە: جۆرێكیان ئەوە بووە كە قورئانە، بە هێواشی و لەسەرخۆ نوسراوە، تا وورد وورد پیایا بڕۆنەوەو چاكی بكەن، جۆرەكەی تریشیان ئەوەیە كە خۆت بە ـ فەرموودە ـ ناوی دەبەیت، كە تیایا یەكسەر ووتراوە لە پێشەوە ئامادە باشی بۆ نەكراوە.

ووتم: ئەم قسەیەی بەڕێزتان بچوكترین خالّی راستی تیا نیە، چونكە زۆربەی هەرە زۆری قورئان لە ناكاوو لە پڕ دابەزیوە، چاوەڕوانكراو نەبوو، تا بە هێواشی وورد وورد بنوسرێتەوە. ( كەسێكیش كە خۆی هەر خوێندەواری نەبووە) بە هەمان شێوە ـ فەرموودەكان ـ ی پێغەمبەر ـ د.خ ـ خۆیشی هەندێكیان چاوەڕوانكراو و هەندێكی تریان لە ناكاو ووتراوە، كەچی هەردوو شێوازەكە كە خاوەنی یەك جۆر دەربڕینن. بەلاّم جیاوازی نێوان قورئان و فەرموودە ـ كورد ووتەنی خۆمان ـ ئاسمان و رێسمانە.

پاشان ئەگەر وەك ئێوە بانگەشەی دەكەن قورئان لە لایەن پێغەمبەر ـ د.خ ـ خۆیەوە نوسرابێت !!! ئەوا دەبوایە ئەم هەولّ و ماندووبوونەی بدایەوە پالّ خۆی و بانگەشەی خوایەتی بكردایە نەك پێغەمبەرایەتی، زیاتر پیرۆزی لە خۆی كۆ دەكردەوەو خەلّكی زیاتری لیّ كۆدەبووە. زیاتر جلّەوی دەسەلاّتی خەلّكی دەگرتە دەست وە ئەگەر قورئان لە لایەن خودی پێغەمبەر ـ د.خ ـ بوایە ئەوا لەگەلّ فەرموودەدا لە یەك جیا نەدەكرانەوە، بەلاّم ئەوەی كە نەیارە سەرسەختەكانیشی شایەتی بۆ دەدەن ئەوەیە كە ئەو خوازیاری پلەو پایەو سامان نەبووە زۆر بە سادەیی بە كابرایەكی دەشتەكی دەفەرموێت: ( ئارام بە، من كوڕی ئافرەتێكم لە مەككە كە نانە رەقەی دەخوارد ) پاشان كاكە ئازاد:

ئەگــەر قورئــان لــە لایــەن پێغەمبــەردەوە نوســرابێت !!! ئــەوا پــسپۆرو شــارەزایانی بــواری رەوانبێــژی و زمانپــاراوی عــەرەب دەبوایــە بیانزانیایــەو ئاشکرایان بکردایە، ئەمەشیان بۆ ئاسان بـوو ئەگـەر وابوایـە، چونکە ئەوسا دەیـانتوانی ـ پێغەمبـەرایـەتی ـ پێغەمبـەر ـ د.خ ـ هەڵوەشێننەوە بـەوەی کـە دەڵێت: ( ئەم قورئانە لە لایـەن خواوەیـە) بـەوەی خۆشـیان قورئـانێکی تریـان بنوسیایەتەوە، بـەڵام قورئـانی پـیرۆز بـەو رەوانبێـژی و پاراویـەی خـۆی دەسـتە پاچـەی کـردن و لــە مــاڵی خۆیانـدا گۆشەنـشینی کـردن و هەرچـی قـسەو قسەلۆکیان هەبوو هەمووی لەناو برد، بەڵام ئایا ئەوان توانیان بێنە گۆڕەپـانی ـ تحدی ـ ی قورئـان بـە ـ ٣ ـ ئایـەت سـەرەڕای ئـەو هـەموو لێهـاتوویی و بـە تواناییەیان، بێگومـان گردەنشین مـان و جوڵەیان لە خۆیان بڕی.

یەکسەر وتی:

ئەی بۆ نەیان کرد؟

ووتم: سـەرەڕای ئـەو نەفامیـە ئەوەنـدەیان دەزانـی کـە گوێزانـەوەی چـیای پیرەمەگرون بە کەوچکە چایەك بۆ دەشتی کۆیە ـ قسە لەسـەر کردنـی پیـشەی کـەس ـ یـان پیـشەی ژێـر نیـە، چ جـای ئـەوەی بکەویتـە نـاو کاریکـاتۆری کردەوەکەی.

هەروەها کاکە ئازاد، ئەگەر قورئـان لـە لایـەن پێغەمبـەر ـ د.خ ـ خۆیـەوە بوایە ئەوا زۆر ئاسایی بوو کە حاڵەتی رووداني هـەر رووداوێـك یەکـسەر خێـرا وەڵامی دەدایەوەو نەیدەهێشت دوا بکـەوێت، دوژمنـانی پێـی دڵـشاد بـبن. بـۆ نموونـە لـە کـاتی رووداوی ـ الإفـك ـ دا کـە خێـزان و هاوسـەری ژیـانی تیایـا تاوانبار کرا، نزیکەی مانگێـك ئـەوەی پێـی بووترێـت تـامی ژیـان لـە مـاڵی

پێغەمبەردا ـ د.خ ـ نەما، وەحی دواکەوت. ئەگەر بەو جۆرە بوایە کـە جـەنابتان پێیان وایە ئەوا هەر یەکسەر گەرماوگەرم بەرپەرچی نـەیارەکانی دەدایـەوەو لـە یەکەم هەنگاویاندا دەمکوتی دەکردن.

هەروەها مەسەلەی گـۆڕانی ـ قیبلـە ـ ش لـە ـ بیـت المقـدس ـ بـۆ ـ بیـت الحرام ـ بەرچاوە کە پێغەمبەر ـ د.خ ـ چەندەی حەز دەکرد بـەڵام پـاش نزیکـەی ساڵ ونیوێك ئەوسا خوای گەورە فەرمانی گۆڕینی ـ قیبلە ـ ی پێدان، گەر بـەو جۆرەی جەنابتان باسی دەکەن پێویستی بەو ساڵ و نیوە نەدەکرد.

هەروەها لـە مەسـەلەی پرسـیارکردنی جولەکـەکان لـە بـارەی ـ أصـحاب الکهف ـ وە نزیکەی ـ٤٠ ـ ڕۆژ وەڵامی نەدانەوە گەر بە ویستی خۆی بوایە ئەوا یەکسەر وەڵامی دەدانەوە.

دوا قسەشم ـ ببورە درێژەم پێدا ـ ئەوەیـە ئەگـەر قورئـان لـە لایـەن خـودی پێغەمبەر ـ د.خ ـ بوایە، چۆن ئەو گلەیی و گازندەی خوای گەورەی تیایا دەبوو کە ئاڕاستەی پێغەمبەر ـ د.خ ـ کراوە. چـۆن خـۆی گلـەیی و گازنـدە لـە خـۆی دەکـات و خـۆی بـە هەڵـە دادەنێـت ! بێگومـان هـەموو حـەز دەکـەین کـە کەموکورتی بشارینەوەو ڕاستیەکان دەرخەین.

پاڵێکی دایەوەو دەستی برد بۆ پاکەتەکەی دوایی بیری کردەوە کە جێگـای جگەرە کێشان نیە، ووتی:

هەرچەندە حەزم لێیەتی بەس وابزانم جێگای ئەمە نیە . خستیەوە گیرفـانی و ئەنیشکی خستە سەر مێزەکەو وتی:

مەرج نیە خۆی نوسیبێتی ئەی لە ـ بوحەیرا ـ وە وەری نەگرتووە یان ـ وەرەقەی کوڕی نەوفل ـ یان ئەو ئاسنگەرەی کە لە مەککە دابوو، لەوانەیە لە ئەوانەوە وەری گرتبێت.

ووتم: جارێ بەڕێزتان مادام ووتتان ـ لەوانەیە ـ ئەوا لە رووی لۆژیکەوە قسەکانت هەڵدەوەشێتەوە چونکە ( الدليل إذا أصابه اِحتمال بطل به الاستدلال ) واتە ئەگەر بەڵگە ئەگەری تێکەوت ئەوا بە کەڵکی بەڵگ هێنانەوە نایەت، چونکە بەڵگە دەبێت روون و ئاشکرا بێت، نەك ـ ئەگەر ـ بەکار بێت، بەلاّم وەلاّمت دەدەمەوە چونکە مێژوو رووداوو شایەدو ژینگە هەمووی پشتگیری من دەکات و ئەم ـ ئەگەرەی ـ جەنابتان هەڵدەتەکێنێت.

ئەو ـ راهیب ـ ەی کە جەنابت باسی دەکەیت و ناوی ـ بوحیرا ـ یە ئەوا روونە کە ـ سیرە ـ نووسانی ژیانی پێغەمبەر بە روونی و بێ پەردە ئاماژەیان پێ داوە کە پێغەمبەر ـ د.خ ـ یەکجار لە منالّیدا کە تەمەنی ١٢ سالاّن بووە لەگەڵ مامی ـ ابوطالب ـ و سەرجەم کاروانچیەکانی تر بینیویەتی و ماوەی بینینەکەش زۆر کەم بووەو شتێکی پەنهان و شاراوەی تیایا نیە چونکە پێش ئەوەی جەنابت دوای ١٤٣٠ ساڵ گومان لەم رووداوە بەریت ئەوا بێ باوەڕانی قورەیش کە ـ ابوطالب ـ یەکێکە لەوانەو زۆر بە توندی چاودێری کردووە خۆ ئەگەر ئاوا بوایە، ئەوا ئەوان هەر زوو ئاماژەیان بەوە دەکردو سەری خۆیان نەدەهێشاند، ئەمە لە لایەك وە لە لایەکی ترەوە ئەم منالّە گەڕایەوە لە سەفەرو هیچی نەوت، سالّێك تێپەڕی و هیچی نەوت، دووان سیان تێپەڕین هیچی نەوت، نەخێر منالّی و هەرزەکاری تێپەڕاندو ووشەیەکی لەو قورئانە بە زاردا نەهات، نەخێر بووە هاوسەرو خێزانی پێکەوە ناو هیچی نەوت، بوو بەخاوەن

ماڵ و مناڵ و هیچی نەوت، دوای ـ ٢٨ ـ ساڵ لەم رووداوە تەمەنی دەگاتە ـ ٤٠ ـ ساڵ. باشە ئەم ماوە بێدەنگیە واتای چی؟ بێگومانم کە تۆش دەزانی هیچ نەگوزەراوە بۆیە ئەو ماوە دوورو درێژە بەبێ دەنگی بەرێ کراوە.

پاشان هەموو ئەوەی کەلەم ماوە زۆر کەمەدا روویداوە بە ئاگاداری سەرجەم هاورێیانی سەفەری بووە. ئەوە بووە کە ئەم ـ بحیرا ـ یە لە دەرئەنجامی خوێندنەوەی کتێبە ئایینیەکان بۆی دەرکەوتووە کە پێغەمبەری مژدە پێدراو لە لایەن پێغەمبەر ـ موسی ـ و ـ عیسی ـ سەلامی خوایان لێ بێت، بۆیە ئامۆژگاری مامی کردووە کە بیگێڕێتەوەو نەهێڵێت جولەکەکان ببینن با دووچاری گرفت نەیەت، ئەمە هەموو بەسەرهاتی ـ بحیرا ـ یە، وە سەبارەت بەو ئاسنگەرەش کە ئاماژەت پێدا ئەوا دەبێ بڵێین عەرەب نەبووەو بیانی بووە، هیچ ئاگاداریەکی بەسەر زانستی زمانی عەرەبیدا نەبووە. بەکورتی ئەم کارە زیندووە لە کەسێکی مردوو وەرناگیرێت.

دوا سەرنجیشم لەسەر ـ وەرقەی کوڕی نوفل ـ ە، لەراستیدا پێغەمبەر ـ د.خ ـ پەیوەندی پێوەی نەبورە، ئەوە خەدیجەی هاوسەریەتی کە بردوویەتیە لای، پاشان کە چووە لای ـ وەردقەی کوڕی نوفل ـ شایەتی ئەوەی بۆدا کە دەبێتە پەیامبەر نەك ئەوەی فێری شتی بکات، تەنانەت لە کۆتایی ئەم باسەدا وەرەقە بە پێغەمبەر ـ د.خ ـ دەڵێت: ئەم پەیامە ـ مەبەستی وەحیی ئاسمانە ـ هەمان پەیامە کە بۆ ـ موسی ـ دابەزیوە، وە بۆ هەر کەس دابەزی بێت ئەوا لی لایەن گەلەکەیەوە دووچار تەنگژەو دەرکردن هاتۆتەوە، خۆزگە ئەو دەمەی گەلەکەت دەرت دەکەن زیندوو بوومایە تا پشتگیریم لێ بکردیتایە، پێغەمبەر ـ د.خ ـ فەرمووی: بۆ گەلەکەم دەرم دەکەن؟ وتی بەڵێ. هەرکەس ئەم پەیامەی وەك تۆی

پـێ گەیـشتبێت ئـەوا ئـازاردراوە، ئەگـەر ئـەو رۆژە زیندووبومایـە پـشتگیریم دەکردی.

پاش ماوەیەکی کەم لەم دیـدارە ـ وەرەقـە ـ مـرد، پاشـان زۆر روونـە ئـەم زانست و زانیاریەی قورئان کوا ـ وەرەقە ـ هەیبووە.

کوا رۆڵ و توانای ـ وەرەقە ـ لـەهیچ جومگەیـەکی مێـژووی ئـەم پەیامـەو پێشتر ئەم کابرایە سەرەداوێکی بەدەستەوە نەبوو، هەر تەنها لەبەر شایەتیدانێك کە گەر یەکێك ئێستاش ـ ئینجیل و تەورات ـ بخوێنێتەوە بێ خۆمانـدووکردن، ئەوەی ـ وەرەقە ـ شایەتی بۆ داوە دەست هەموو لایەك دەکـەوێت سـەرەڕای ئـەو هەموو هەوڵەش کە بۆ چەواشـەکاری لـەم بـوارەدا دەدرێـت، بەڵگـەکان روون و ئاشکران.

تۆزێك لەسەر کورسیەکەی کشایەوە دواوە وتی:

دەی ـ محمد ـ خۆی زۆر بلیمەت و عەبقەری بووە !!! زۆر بە توانا بووە، هەر خۆی نووسیویەتی.

ووتم: چاوەکەم، ئێمە پێشتر ئەوەمان باسکرد کە ئەو سەردەمەو ئێـستاشی لەگەڵدا بێت ناتوانی ـ بلیمـەتی ـ لـە کەسـێکدا کـۆت و بەنـد بکـەیت و ئـەو خەڵکـەی تـر بـە نەشـارەزا لـە قەڵـەم بـدەیت. ئـەو دەمـە ئەگـەر بـە تاکەکـەس نەیانتوانی بێت بەرەنگاری قورئان ببنەوە، ئەی بۆ هـەموویان کۆنەبوونـەوە تـا بەیەکەوە ـ تحدّی ـ ی قورئان بکەن، خۆ بەرێزت لانی کەم وەك مـن دەزانـی کـە هۆنراوەیـەك کۆمـەڵێك شـاعیر بینووسـن، لـەو هۆنراوەیـە بـەهێزترە کـە تاکـە شاعیرێك بینووسێت. بەڵام بە شایەتی خۆیان ئەم کـارە لـە توانـای نـەك ئـەوان بگرە هەرچی مرۆڤە کۆببنەوە بێ بەرهەمە. وە لە هەمووی گـرنگتر ئەوەیـە کـە

قورئان دەرگای ـ تحدّی ـ ی خستۆتە سەر پشت بۆ هەر کەسێك کە زاتی ئەوە بکات، بەڵام دەستەپاچەیی و بێ دەسەڵاتی لە ئاست بەرزی وبڵندی قورئان هەموویانی گردەنشین کردووە.

ووتم: بەردەوام بم یان قسەت هەیە.

وتی: بەردەوامبە، قسەم هەیە بەڵام تۆ جارێ قسەی خۆت بکە گوێم لێتە.

ووتم: جەنابت ووشەی ـ بلیمەت ـ ت بەکارهێنا، ئایا دەزانی مەسەلەی بلیمەتی تەنها بۆ ئێستاو ئایندە دەشێت لە هەندێ بواردا دروست بێت تۆ کەباس لە رابردوو دەکەیت وەك ئەوەی قورئان زۆر بە ووردی باس لە هەندێ بواردا رووداوو دیمەن دەکات وەك ژمارەی ساڵی بەسەردا تێپەربووی ـ أصحاب الکهف ـ بەکارهێنانی ووشەی ـ مەلیك ـ فرعەون ـ لە ناوچوونی هەندێ گەلانی پێشین، ئەمانە هەرگیز پشت بە بلیمەتی نابەستێت ئەوەندەی توێژینەوەو خوێندنەوەو بەراووردکاریەو خستنەڕووی دەقەکان و ..... هتد دەوێت. ئەمەش دەدەیتە پاڵ کەسێك کە نەك لە ناوچەیەکی دوواکەوتوو دوور لە زانست و زانیاری و سەرچاوە بووە، بگرە هەر خوێندەواریشی نەبووە.

خۆشت باش دەزانی مێژوو نووسین و قسە لەسەر رابردوو بە ـ عەقڵ ـ کاری ئەگەر بواری هەبێت، تەنها بۆ شیتەڵ کردنی رووداوەکان و پەند وەرگرتنە کەواتە باس و خواسی مێژوو و رووداوەکانی رابردوو لە دەرەوەی زاتی کەسەکانەوەن، نەك هەڵقولاوی خودی کەسەکان بن.

ئەمە لە لایەك خۆ ئەگەر بێت و بێینە سەر لایەنی دووەم لە بلیمەتی کە قسە کردنە لەسەر رووداوەکانی داهاتوو ئەمەش لێ ووردبوونەوەی دەوێت تا

قسەکانمان زانستی بن، چونکە قسەکردن لەسەر گەیشتنە دەرەنجام بە پێوانە کردن لەگەڵ ڕووداوەکانی رابردوو ئەمەش گومانکاریە.

بەڵام هەرگیز ناگەیتە یەقین مەگەر بە ـ وحی ـ نەبێت.

یەکسەر وتی:

تکایە روونتر بدوێ با بە ووردی لە مەبەستت تێ بگەم.

ووتم: بەڵێ ، ئەگەر روونتر بدوێم ئەوا دەڵێین مەسەلەی قسەکردن و پێشبینی کردنی داهاتوو، بەو جۆرە دەبێت کەکەسەکە سوود لە تاقیمانەی پێش خۆی وەربگرێت و بیکاتە مەشخەڵی دەستی تا دوا رۆژی بە روونی ببینێت، واتە لە هەنگاوەکانی رابردوو بەهرەمەند دەبێت، ئیتر بەم جۆرە دەکەوێتە پێوانەکاری ـ قیاسی ـ داهاتوو بە رابوردوو، یان بڵێین نەبینراو ـ قیاس ـ دەکات و لای خۆیەوە دەرەنجامێك دەست دەخات، ئەوسا بەوپەڕی بەئاگایی و وورباییەوە دەڵێت:( ئەگەر کارەکە بەو جۆرە بڕوات کە لە رابردوودا رۆیشتووە ئەوە ئاوا دەبێت، ئەوەی کە چاوەڕوان دەکرا وا دەرنەچوو) بەڵام ئەوەی زۆر بە توندی و ئەوپەڕی قەناعەتەوە قسەکانی خۆی لە گومانکاری بەدوور دەگرێت دوو جۆر کەسن:

١ـ کەسانی سەرکێش ـ مجازف ـ کە بەلایانەوە گرنگ نیە دوایی لە لایەن خەڵکەوە بە درۆزن دەربچن، ئەمەش فاڵچی و بورج ناس و فەلەکی و ئەستێرە ناسەکانن.

٢ـ یان ئەوەتا پێغەمبەرانن. کە بەوپەڕی قەناعەت و بڕواوە کە پشت ئەستورن بە وەحی خوایی و لە ئاسمانەوە پەیامیان پێ دەگات.

جا کاکە ئازاد:

تۆ خۆت سەیریکە بزانە ئەم پیاوە کە پێغەمبەری خوایە ـ د.خ ـ لە کامیانە؟! ئایا بە خوێندنەوەیەکی سەرپێی ژیانی ناگەیتە ئەو قەناعەتەی کەلە ماوەی ٦٣ تەمەنی پیرۆزیدا بۆ ساتێك لە ساتەکان قسەو کردەوەو هەڵوێستی لەو جۆرە کەسە فاڵچی و ئەستێرە ناسانە نەبووە تێکەڵاویان نەبووە نەشی زانیوە ئەم خەڵك لە خشتە بردنە چۆن لەناو خەڵکیدا دەستاو دەست دەکات. ئەو پەیامەی ئەم کە چەندین هەواڵ و پێشبینی لەم جۆرەی تیادایە ڕۆژێك لە ڕۆژان دووچار بە هەڵەو ناڕاست دەرچوون نەبۆتەوە، لەگەڵ ئەوەی کە غەیب زان نەبووە بەڵام هەموو ئەو پێشبینییانەی کە لە قورئاندا بۆ خەڵکی روون کردۆتەوە وەك ڕۆژی روون شایەتی لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتی ئەم دەدەن.

لەوانەیە تا ئێرە بە قسەکردن لەسەر خاڵە ماندووم کردبێت بۆیە ئێستا بۆ ئەوەی قسەکانم لە چوارچێوەی قسەی رووت دەرچن چەندین نموونەت دەخەمە بەرچاو، کە ڕاستی قسەکانی من دەردەخەن.

أـ باس کردن لە حەتمیەتی سەرکەوتنی ـ قورئان ـ ئیسلام ـ پێغەمبەر ـ د.خ ـ بەسەر بێ باوەڕاندا. بە شێوەیەك کە هیچ دوودڵیەکی تیایا نەهێشتۆتەوە، ئەم ئایەتانەش کاتێك هاتونەتە خوار کە سەردەم سەردەمی مەککەو ئەشکەنجەدانی مسوڵمانان بەوە ژمارەی مسوڵمانەکان زۆر کەم و بێ دەسەڵات بوون کەچی قورئان سەرکەوتنی ئەم کۆمەڵە خەڵکەو پەیامە یان لە داهاتوویەکی چاوەڕوانکراودا باس دەکات. هەروەك لە سورەتی( إبراهيم: ٢٤ـ٢٥)

﴿أَلَمۡ تَرَ كَيۡفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا كَلِمَةٗ طَيِّبَةٗ كَشَجَرَةٖ طَيِّبَةٍ أَصۡلُهَا ثَابِتٞ وَفَرۡعُهَا

فِي ٱلسَّمَآءِ﴾پاشان لە سورەتی (التوبة: ٣٢-٣٣) ﴿يُرِيدُونَ أَن يُطۡفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَيَأۡبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾.

**ب ـ خاڵێکی تر کە قورئان جەختی لەسەر دەکاتەوە کە سەرجەم مرۆڤایەتی زۆر لەوە دەستە پاچەترن بتوانن بە درێژایی زەمەن ـ تحدّی ـ ی قورئان بکەن ئەمەش لەوەدا بەرچاوە کە قورئان داوا دەکات کە قورئانێکی هاوشێوەی بهێنین یان ـ ١٠ ـ سورەت وە یان سورەتێکی وەکو ئەو بهێنن، نەتوانیان و نە توانایان لە داهاتوودا بەڵگەیەکی بەرچاوە هەروەك لە سورەتی (** الإسراء: ٨٨ **) دا هاتووە** ﴿قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا ﴿٨٨﴾ ﴾ **وە هەروەها سورەتی** (البقرة: ٢٣-٢٤): ﴿وَإِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّمَّا نَزَّلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّن مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾

**ج ـ قورئانی پیرۆز لە مەککەدا مژدەی سەرکەوتنی بە مسوڵمانەکاندا. هەروەك لە سورەتی** (القمر:٤٣-٤٥) **دا دەفەرموێت:** ﴿أَكُفَّارُكُمۡ خَيۡرٞ مِّنۡ أُوْلَٰٓئِكُمۡ أَمۡ لَكُم بَرَآءَةٞ فِي ٱلزُّبُرِ ﴿٤٣﴾ أَمۡ يَقُولُونَ نَحۡنُ جَمِيعٞ مُّنتَصِرٞ ﴿٤٤﴾ سَيُهۡزَمُ ٱلۡجَمۡعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ﴿٤٥﴾ ئەوە بوو لە ـ بدر ـ دا **کۆمەڵی بێ باوەڕان تێکشکان کەمینیەکی باوەڕدار بەسەر زۆرینەی بێ باوەڕدا سەرکەوتن.**

د ـ جەخت کردنەوەی قورئان لەسەر سەرکەوتنی ـ رۆم ـ ەکان بەسەر فارسەکاندا لە چەند ساڵی داهاتوودا. هەروەك لە سورەتی (الروم ١ تا ٦) دا دەفەرمویت: ﴿الٓمٓ ۝ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ۝ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ۝ فِي بِضۡعِ سِنِينَۗ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ مِن قَبۡلُ وَمِنۢ بَعۡدُۚ وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ۝ بِنَصۡرِ ٱللَّهِۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ۝ وَعۡدَ ٱللَّهِۖ لَا يُخۡلِفُ ٱللَّهُ وَعۡدَهُۥ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ۝﴾ قورئان جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە لە ئێستادا کە رۆمەکان لە سەر دەستی فارسەکان تێکشکاون وشکستیان هێناوە ئەوا لە چەند ساڵێکی کەمدا رۆمەکان بەسەر فارسەکاندا سەردەکەونەوە. قورئان ماوەی سەرکەوتنە چاوەڕوانکراوەکەی بە ووشەی ـ بضع ـ بەکار هێناوە کە لە زمانی عەرەبیدا لە ـ ٣ ـ وە تا ـ ١٠ ـ دەکات ئەوە بوو لە ماوەی ـ ٧ ـ ساڵدا رۆمەکان سەرکەوتنەوەو پێشبینیەکەی ـ ٧ ـ ساڵ پێش ئەوەی قورئان بەدی هات.

هـ ـ هەواڵدانی قورئان کە مسوڵمانان بۆ بەجێ هێنانی ـ عمرة القضاء ـ دەچنەوە مەککە.

هەروەك لە سورەتی ( الفتح:٢٧ ) دا هاتووە ﴿لَّقَدۡ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءۡيَا بِٱلۡحَقِّۖ لَتَدۡخُلُنَّ ٱلۡمَسۡجِدَ ٱلۡحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ

رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ ۖ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿٢٧﴾ ﴾ ئەم ئایەتە کاتێك هاتە خوار کە مسوڵمانەکان لە - صلح الحديبية - لە لایەن بێ باوەڕەکانەوە ڕێگری ئەوەیان لێ کرا بە مەبەستی ئەنجامدانی عەمرە بچنەوە مەککە، بەڵام مژدەکەی قورئان وەدی هات و ساڵی داهاتوو مسوڵمانەکان چوونەوە مەککەو -٣- شەوو ڕۆژ تیایا مانەوە تەنانەت گەورە پیاوانی قوڕەیش چاویان بەو دیمەنە هەڵنەدەهات و ئەو ماوەیە مەککەیان بەجێ هێشت و چوونە دەرەوەی مەککە.

و - دوا خاڵ ببورە کە درێژەشم پێدا ئەوەیە:

کە خۆت ڕۆژانە سەیری ڕوپەڕی ڕۆژنامە ناوخۆیی و دەرەکیەکان بکە کە چەندە دۆلارو دینارو زێڕو زیو دەبەخشرێتەوە تا بەر بە ئیسلام و پەیامی مسوڵمانیەتی بگرن... کەچی ئیسلام زۆر بێ باکانە پشت ئەستوور بە پەیامی خوا ڕۆژ بە ڕۆژ درەوشاوەتر دەبێت. هەروەك لە ئایەتی - ٣٦- ی سورەتی - الانفال - دا هاتووە: ﴿لَقَدْ صَدَقَ اللَّهُ رَسُولَهُ الرُّؤْيَا بِالْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ آمِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لا تَخَافُونَ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا فَجَعَلَ مِنْ دُونِ ذَلِكَ فَتْحاً قَرِيباً﴾

سەیرێکی سەعاتەکەی کردو وتی:

دیارە هێشتا قسەی زۆرمان ماوە، بەڵام وا هەست دەکەم درەنگ بێت، من لە ماڵی پورم دەعوەتم، حەز دەکەم جەنابیشت لەگەڵم بیت، ئەوانیش هەموویان حەز بەم جۆرە باسانە دەکەن.

ووتم: سوپاس بۆ گوێگرتنت و خولقکردنەکەت، ببورە دەبێت منیش بچمەوە ماڵ ئەگەر وەعدت بە ماڵی پورت نەداوە حەز دەکەم بچینەوە ماڵ لەوێ لە خزمەتتدا دەبم و قسەی خۆشمان دەکەین، بەلاّم ببورە کە ناتوانم لەگەڵت بێم، ئەگەر ماڵی پوریشت وەك خۆت فەرمووت پێیان خۆشە لەم جۆرە باسانە قسە بکەن ئەوا لە دەرفەتێکی تردا منیش پێم خۆشە گفتووگۆکە فراوان بکەین، بەلاّم وا دیارە جەنابت وەك ئامازەت دا زۆرت لە لایە، پێم خۆشە کاتێکی تر دابنیشین چیت هەیە بیخەیتە روو.

وتی زۆر سوپاس خۆم ئاگادارت دەکەمەوە.

ووتم: بەس پێم باشە ئەم جارە لە ماڵی خۆمان بێت و کەش و هەوای ئارام زیاتر رەخساوە.

وتی: باشە.

بەیەکەوە لەکتێبخانە هاتینە دەرەوە، لەوێ لەیەکتر جیابووینەوە من بەرەو ماڵەوەو ئەویش بەرەو ماڵی پوری ......

دەمەو عەسر لە ماڵەوە خەریکی خوێندنەوە بووم زەنگی مۆبایلەکە لێیداو کاك ئازاد وتی:

مامۆستا چۆنیت . من ئەم عەسرە تا ئێوارە کاتی ئەوەم هەیە بەیەکەوە بدوێین، نازانم جەنابتان پێتان چۆنە؟

ووتم: منیش پێم باشە بەلاّم وەك ووتم: با لە ماڵی خۆمان بێت چونکە دەرەوە بە شیاوی ئەم جۆرە باسانە نازانم. با ئەمەکیشمان بکەیت. ئێوارە لە ماڵی خۆمان بە.

زۆر باشە ناونیشانم بدەرێ خۆم دێمە خزمەتت، بەلاّم وەك ووتم تا ئێوارە بوارم هەیە، ئێوارە وەعدم داوە ناتوانم.

ناونیشانم پێدا نیو سەعاتی بەسەردا تێپەڕی هەر لە هاتووچۆدا بووم چومە بەر دەرگا لەوسەری کۆلاّنەوە تەکسیەك وەستاو ئەویش لە تەکسیەکە دابەزی و بەچواردەوری خۆیدا دەیڕوانی، نزیك بومەوە لێی و بانگم کرد.

بەرەو لام هات بەیەکەوە چوینە ماڵ لە ماڵەوە بەخێرهاتنێکی گەرممان لێ کردن سەیرێکی خێرای کتێبخانەکەی کرد بەلاّم دەستی لە هیچیان نەدا، ئاوڕێکی دایەوەو وتی: ئەمەت لە پشتە بۆیە دەڵێی چیت هەیە بیڵێ... !!

منیش سەرم داخست و هیچم نەوت: دانیشت یەکسەر وتی:

مامۆستا قسەکانی ئەو ڕۆژەت ڕاستە بەدڵم بوون بەلاّم وانەزانی تەسلیم بووم. چونکە منیش لای خۆمەوە زۆرم لایە، حەز دەکەم بیانخەمە ڕوو.

بە پێکەنینەوە ووتم:

باشە بۆ ئەوەندە پەلە دەکەیت، تۆ جارێ با شتێك بخۆین، پشوویەك بدەیت ئەوسا قسە دەکەین، چایەك ... میوەیەك .. .

وتی: مامۆستا دوێنێ نیوەڕۆ لە ماڵی پورم باسی گفتوگۆی نێوانمانم بۆ ماڵی پورم کرد، بێگومان کوڕو کچەکانی ئەوان دەزانن کە من ئێستا چیم گوێم نادەنێ، بەلاّم پورم و ئەوان نازانن ؟؟ حەزیان دەکرد لەگەڵمان بەشدار بن.

ووتم: بەلامەوە ئاساییە بەلاّم وام پێ باشە جارێ لەگەڵ جەنابت بەیەکەوە قسە بکەین. دیارە ئەوان وەك جەنابتان نین. واتە بیروباوەڕیان هەر مسوڵمانە، بەلاّم پرسیاریان لەلا گەلاڵە بووە، ئەمە لەلایەك بەلاّم لەلایەکی تر کە مەسەلەی فەرعی زیادیان کرد ئەوسا مەسەلە سەرەکیەکەمان لەبیر دەچێتەوە

بۆیە پێم باشە تا ئەو دەمەی وەڵامی پرسیارەکانی جەنابتان دەدەینەوە هەربەیەکەوە بین ئەوسا لەگەڵ ئەوانیش دادەنیشن وتی:

منیش پێم باشە. دیارە هەرکەسەو خۆی دەزانێت چ پرسیارێك لەلای گەلاڵە بوو..... .

وتم: بابێینە سەر مەسەلەی خۆمان ئەوەندەی لە یادم بێت لات وابوو کە قورئان زادەی پێغەمبەر ـ د.خ ـ خۆیەتی خۆی نووسیویەتی یان بڵێین خۆی وەری گرتووە. لێرەوە دەست پێ بکەین باشە.

وتی: راستە جەنابتان وەڵامی چەند پرسیارێکت دایەوە، دەبێت بڵێم منیش خۆم هیچی وام لەسەر ئەو مەوزوعە لە لا نەماوە، بەڵام ئەمە هەرگیز بەمانای ئەوە نیە کە ئەم دۆسیە داخراوە. یان من قەناعەتی ١٠٠٪ ئەوەم هەبێت کە قورئان ـ وەحی ـ ئاسمانە. بۆیە زۆر خاڵی تر هەن کە دەبێت باس بکرێت، منیش لە لای خۆم قسەم هەیە.

وتم: زۆر باشە، هەر بەوەی هیچ لە لای خۆت گل نادەیتەوەو هەمووی دەخەیتە بەرباس، من زۆرم پێ خۆشە. چونکە کار ئاسانی بۆ من دەکات و منیش قسەی خۆم دەکەم و وەڵامی تەواوت دەدەمەوە ئەوسا تۆ خۆت و بیرکردنەوەو توانای بیرکردنەوەی ئازادت سەربەستن لەوەی کە لێم وەردەگرن یان نا ؟ من ئەوەندەم لەسەرە قسەکانم بێ بەڵگە نەخەمە روو هەرچییەکم بێ بەڵگە هێنانەوە نەخستە روو وەری مەگرە بەڵام کە بەڵگەی روون و بەرجەستەم خستە بەردەست ئەوا ئەرکی سەر شانی تۆ گرانتر دەبێت بەوەی کە چەندە بوێریت و تا چەند راستییەکان وەردەگریت و ئینکاری حەق و راستی نەکەیت .... ؟!

وتم: بفەرموو چ پرسیارێکی ترت لە لایە.

پاڵێکی دا بە کورسیەکەوەو تۆزێك خۆی راست کردەوەو وتی:

من لام وایە کە قورئان سوودی لە کتێبە ئاسمانیەکانی تر بینیوە. واتە قورئان لەبەر کتێبە ئاسمانیەکانی تر نووسراوەتەوە.

ووتم: ئەم بانگەشەیە گەورەو گرانە ئەگەر بەڵگەت نەبێت ئەوا گفتوگۆکەمان لە هێڵی زانست لا دەدات دەبێتە پشتگیری کردنێکی کوێرانەو عەیبدارکردنی یەکتر بەبێ بەڵگە.

وتی: بەڵگەم هەیە.

ووتم: باشە بەلاّم مەرجی بەڵگە ئەوەیە کە راست و دروست بێت بەزۆر مل شکاندنەوەو داتاشینی تیایا نەبێت.

دەستی کرد بە گیرفانیدا دەفتەرێکی بچوکی دەرهێنا، دیار بوو کە پێشتر ئامادەی کردبوو بۆیە وتی:

لە قورئاندا سورەتی ( الأعلى: ١٨ـ ١٩) دەڵێت: { إِنَّ هَـٰذَا لَفِي الصُّحُفِ الْأُولَىٰ (١٨) صُحُفِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ } وە لە سورەتی ( النجم: ٣٦/٣٧) ﴿ أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ بِمَا فِي صُحُفِ مُوسَىٰ (٣٦) وَإِبْرَاهِيمَ الَّذِي وَفَّىٰ ﴾ وە لە (الشعراء: ١٩٦ـ ١٩٧) ﴿ وَإِنَّهُ لَفِي زُبُرِ الْأَوَّلِينَ (١٩٦) أَوَلَمْ يَكُن لَّهُمْ آيَةً أَن يَعْلَمَهُ عُلَمَاءُ بَنِي إِسْرَائِيلَ ﴾ ئەمانە هەموو بەڵگەن.

لە دڵی خۆمدا ئەسەفێکم خوارد زانیم کە ئەو خۆی هەرگیز ناتوانێت ئەم قسانە رێك بخات. ئەم قسانە پێشتر چەندین رۆژهەلاّتناسی وەکو ـ نشدال ـ ماسیە ـ ئەندریە ـ لامنز ....... هتد کردوویانە زانیم ئەم ئایەتانەی کە ئەم بەوپەڕی دڵخۆشیەوە لای خۆی تۆماری کردوون دیارە لەبەر کتێب نووسیویەتیەوە، هەرگیز لە دوورو نزیك بەو مانایەی ئەم نایەت. هەرچەندە

ئێمە پێشتر قسەمان لەسەر ئەوە کردبوو، کە بەڵگە دەبێت روون و ئاشکرا بێت، بە زۆر نەگوشرێن تا واتایەکی دیاری کراویان لێ وەدەر بهێنرێت .

ناشکرێت بڵێیت ئەم ئایەتانە بە بەڵگەی قسەکەت ناخۆن، چونکە وا دەزانێت کە پڕاو پڕ قسەکانی تەواوەو من لە لۆژیکی بێ دەسەڵاتیەوە قسە دەکەم بۆیە پاڵم دا بە کورسیەکەوەو ووتم:

لە راستیدا ئەو قسەیەی کە بەڕێزت کردت و ئەو ئایەتانەی کە بە بەڵگەی قسەکانت هێناتنەوە پێویستی بە شیکردنەوەی باش هەیە، چونکە تۆ لە یەک کاتدا قسە لە سەر ئایین و پەیام و مێژوو و عەقیدە دەکەیت بۆیە هیوادارم نەفەست درێژ بێت بۆ وەڵامەکەی .

وتی: فەرموو ئەی بۆچی هاتووم گەر گوێ نەگرم.

ووتم: ئێمەی مسوڵمان باوەڕمان وایە کە سەرچاوەی هەر سێ ئایینی(ئیسلام، مەسیحیەت، جولەکە) سەرچاوەی سەرەکی و بێگەردیان لە لایەن خوای گەورەوەیە، کە هەموویان بۆ یەکتاپەرستی و یەکخستنی ووشە هاتونەتە خوار، تا مرۆڤەکان پابەندی دڵسۆزی و کاری چاکەو خۆڕازاندنەوە بن بەرەو شتە جوانەکان هەروەك لە ئایەتی -١٣- سورەتی - الشوری - دا هاتووە:﴿شَرَعَ لَكُمْ مِنْ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحاً وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ كَبُرَ عَلَى الْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ اللَّهُ يَجْتَبِي إِلَيْهِ مَنْ يَشَاءُ وَيَهْدِي إِلَيْهِ مَنْ يُنِيبُ﴾کەواتە ئایین لە لای خوای گەورە هەریەك ئایینە کە ئەویش ئامانجی ئەوەیە خوای گەورە بە تەنها پەرستراو بزانرێت و مرۆڤەکانیش بەرەو کەماڵ بچن، پاشان کاك ئازاد:

ئەو دەمەی لە نێوان ئایینەکاندا لێکچوون وهاوشێوە بوون هەبێت دەبێت لە پشت ئەم هاوشێوە بوونەوە شتێك هەبێت، کە بە رای من لە ـ٣ـ خاڵ زیاتر نیە:

١ـ یان ئەوەتا هەموو ئەو ئاینانەی لە یەك دەچن لە یەك سەرچاوە هەڵقولاون.

ئیتر شتێکی سروشتیە کە رەگ و ریشە یەکێك بێت ئەوا لەیەکچون لە لق و قەدەکاندا شتێکی سروشتیە.

٢ـ یان ئەوەتا ئەم ئایینانە یەك لەبەر یەکتریان وەرگرتۆتەوە، ئیتر دەست بە دەست شت لەیەکتر وەرگیرا ئەوسا لەیەکچوون نزیك دەبێتەوە.

٣ـ یان ئەوەتا رێکەوت وابووە.. ؟!

کە بە رای من ئەم رای سێهەمە جێگای قسەلەسەر کردن نیە، چونکە رێکەوت و گۆترە کاری لە دنیای نەخشەو پلانی ووردی خوادا جێگای نابێتەوە.

دەشێت ئێستا قسە لەسەر دوو خاڵەکەی تریان بکەین. با ئەم پرسیارە گرنگە ئاراستەی ئەم قسەیەی جەنابت بکەین بزانین بۆچی لە خاڵی یەکەمدا ـ کە بە روونی ئاماژەکە ئاشکرایە ـ هۆکاری لە یەك چوون دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری یەك سەرچاوەیی، کەچی پشتی تێ دەکرێت بەزۆر رای دووەم دەسەپێنن کە شایەتی و بەڵگە قورئانیەکان جەخت لەسەر خاڵی یەکەم دەکەنەوە ، وە خاڵی دووەم کە وەرگرتنی ئیسلامە لە جولەکە و مەسیحیەت دەرمێنێت و بەهایەکی بۆ ناهێڵێتەوە.

١ـ قورئان زۆر راشکاوانە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە قورئان پەیامی راستەوخۆی خوای گەورەیە بۆ بەندەکان. ئیتر چۆن یەکێك لە خۆیەوە دەیەوێت

بە قورئان پێـچەوانەی ویـست وداواکـاری قورئـان بـسەپێنێت. بەراسـتی ئەمـە تێنەگەیشتن و خۆ بواردنە لە بەردەم دەقە روون و ئاشکراکان.

٢ـ قورئان گوژمەیەك مەعریفەو زانستی گەورەو فەلسەفەی پشت دنیـای دیارو ئامانج لە ژیانی مرۆڤی بە مرۆڤایەتی بەخشیوە. کە تا ئەو کاتە بە هیچ جۆرێك مرۆڤایەتی دەرکی بەو حاڵەتە گەورانە نـەکردبوو، ئـەوە دەقـە لاواز بـێ تێزەکانی پەیمانی کۆن و نوێ لەبەر دەستتان بزانە هیچ شتێکی وایان تیایە کە بەکەڵکی ئەو باسە بێن ....!؟

٣ـ ئـەو رێنموویـە بـەرزو گەورانـەی قورئـان کـەی بـە ئەفـسانەو داسـتانی خەیاڵبازی ناو کتێبی ( پەیمانی کۆن و نوێ) بەراوورد دەکرێت... ؟! چـۆن ئـەم بەرزو بڵندە لەم نەوی و نزمەی وەرگرتووە ..... ؟!

سەیرم کرد. تۆزێك قسەکانی بە دڵ نەبوو... بۆیە ووتم:

دیارە قسەکانت بە دڵ نەبوو.

وتی: لە رووی شیکاریەوە باش بوو بەڵام .....

ووتم: بەڵام بەلاتەوە قورس بوون، چونکە بە داخەوە ئێمە کەمتر لـە دنیـای مامەڵەی زانستی و توێژینەوە مامەڵەمان کردووە، زیاتر خـەریکی پیاهەڵـدان بووین، بۆیە گەر زانستیانە مامەڵە لەگەڵ

بیروباوەڕەکەتدا نەکەیت ئەوا لەبەر یەککەوتنێکی بچوکدا دوچار بە شـۆك دەبێت.

بەڵام تۆ قسەیەکی گەورەت خستۆتە پاڵ قورئان، دەی خۆ ناشـکرێت مـن هەر بە ـ نەخێر ـ وەڵامت بدەمەوە بۆیە پێم باشە نەفەست درێژتر بێت.

زەردەخەنەیەکی گرت و سەری راوەشاند، بەردەوام بووم و ووتم:

ئەو ئایەتە پیرۆزەی ئامـاژەی پێـدا ﴿ إِنَّ هَذَا لَفِي الصُّحُفِ الأُولَى (١٨) صُــحُفِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى ﴾

ئەم ئایەتە ئاماژەیە بەو ئامۆژگاریانەی کە لە پێشتردا ئاماژەی پێکراوە { قَدْ أَفْلَحَ مَنْ تَزَكَّى . وَذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ فَصَلَّى } ئەمـەش خۆی جەخت کردنەوەیەکی تـرە کە ئـەو ـ پێغەمبـەر بوونـەی پێغەمبـەری ئیـسلام ـ د.خ ـ شـتێکی داهێنـراوو داتاشراو نیەو هاوشانی سەرجەم پەیامی پێغەمبەرانی تـرە ﴿ قُلْ مَا كُنْتُ بِدْعاً مِنْ الرُّسُلِ وَمَا أَدْرِي مَا يُفْعَلُ بِي وَلا بِكُمْ إِنْ أَتَّبِعُ إِلاَّ مَا يُوحَى إِلَيَّ وَمَــا أَنَــا إِلاَّ نَــذِيرٌ مُــبِينٌ ﴾( **الأحقاف: ٩**).

ئیتر ئەوەی پێغەمبەری ئیسلام هێناویەتی کە بە پەیامە ئاسمانیـەکانی تـر نامۆ بێت. سروشتی پەیامی خوا لە حەزرەتی ئادەم تا محمد ـ درودی خـوا لـە هەموویان بێت ـ یەك خواست وداواکاری تیایە، لە یەك جیاواز نابن.

هەر بەم جـۆرەش ئایـەتی ﴿ أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ بِمَا فِي صُحُفِ مُوسَى (٣٦) وَإِبْرَاهِيمَ الَّــذِي وَفَّى ﴾ ( **النجم: ٣٦ـ٣٧**).

راناوەکـە ئەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو کەسـانەی کـە بـە گاڵتـە پێکردنـەوە بـۆ بەرەنگاری کردنی پەیامی ئیسلام دەیان گوت: (ئێوە بڕوا مەهێنن گوناهتـان لە ئەستۆی ئێمە بـەڵام قورئـان بەرپەرچـی ئـەم دەسـتەواژە نادروسـتە دەداتـەوە بەوەی هەمـوو کەس لە کردەوەی خۆی بەرپرسـەو﴿ أَلاَّ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْــرَى ﴾ جـا ئەگەر ئەوان ئەم قسەی قورئانیەیان بە گوێدا ناچێت با بگەڕێتەوە سەر پەیامی پێغەمبـەرانی پێش بزانن لە ـ صحف ـ موساو ئیبراهیم ـ چۆن باسـکراوە، بـەم جۆرە واتای ئایەتەکان بە دروستی ئاوان. ئەگەر یەکێکیش بیان شێوێنێت ئـەوا خۆی بەرپرسە.

لە لایەکی تـرەوە باوەڕهێنـانی پیـاوانی تێگەیـشتوو شـارەزا لـە هـەردوو ئاینی مەسیحی و جولەکە بە ئیسلام و شایەتی دانیان بە راسـتیەتی ئیـسلام نابێت هەر ئاوا بەسەرماندا تێپەڕێت.

**النساء: ١٦٢** ﴿ لَكِنْ الرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ مِنْهُمْ وَالْمُؤْمِنُونَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَـا أُنزِلَ مِنْ قَبْلِكَ وَالْمُقِيمِينَ الصَّلاةَ وَالْمُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَالْمُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أُوْلَئِكَ سَنُؤْتِيهِمْ أَجْراً عَظِيماً ﴾

**المائدة : ٨٣** ﴿ وَإِذَا سَمِعُوا مَا أُنزِلَ إِلَى الرَّسُولِ تَرَى أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنْ الـدَّمْعِ مِمَّـا عَرَفُوا مِنْ الْحَقِّ يَقُولُونَ رَبَّنَا آمَنَّا فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ ﴾

**الأحقاف : ١٠** ﴿ قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ كَانَ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ وَكَفَرْتُمْ بِهِ وَشَهِدَ شَـاهِدٌ مِـنْ بَنِـي إِسْرَائِيلَ عَلَى مِثْلِهِ فَآمَنَ وَاسْتَكْبَرْتُمْ إِنَّ اللَّهَ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴾

راناوی ـ علی مثلـه ـ دەگەڕێتەوە بۆ قورئانی پیرۆز، واتە لە ناو زانایـانی ـ بنی ئیسرائیل ـ دا ، کەسانی وا هەن شاهیدی ئەوە دەدەن کـە ڕێنموییایـەکانی قورئان وەکو ئەو ڕێنموییانە وایە کە بۆ حەزرەتی ـ موسی ـ د.خ ـ هاتۆتە خوار، بۆیە دەرەنجامی ئەوەی کە هەق و راستیان لەم پەیامـەدا ببینـی ئـەوا باوەڕیـان پێ هێنا زۆرێکی تر لە زانایانی ئەم دوو ئایینە هەر کە ئیسلامیان پێگەیشت یەکسەر باوەڕیان هێناوەو بە ئاشکرا ئەم شتەیان بۆ خەڵکەکە باس کردوە.

کاك ئازاد ئیتر شایەتی دانی راستی ئا ئەمەیە، کە ئەو زانایانـە گـەورەیی ئیسلامیان بۆ دەرکەوتووەو شایەتیان بۆ داوە، نەك ئەوەی جەنابت ئێـستا دوای ١٤ سەدە دێت و دەڵێت ئیسلام لە دەمی ئەوانەوە وەرگیراوەیـان کـۆپی کـراوی کتێبەکانی ئەوانە کە ئـەوان لـەو سـەردەمەدا هـەرگیز لـەم جـۆرە بانگەشـەیان نەکردوە.

جا ئێستا پێم باشە بۆ ئەوەی قسەکانم زیاتر زانستی بن دوور بن لە دروشم و ناونیشانی گەورە حەزدەکەم بە ووردی چەند بەراووردکاریەکی نێوان قورئان و تەورات باس بکەین ئەوسا خۆت ببە دادوەرو بزانە چۆنە ؟

قسەی قورئان لە تەوراتەوە وەرگیراوە لە هیچ شوێنێکدا جێی دەبێتەوە.

# ﴿قسە کردن لەسەر سیفاتەکانی خوای گەورە﴾

لە ڕاستیدا ئەو سیفاتانەی خوای گەورە کە ئەو کاتە قورئان قسەی لێ کردوون، ئەوا زۆر لە عەقڵی مرۆڤ گەورەتربوون و هەرگیز مرۆڤ بە پێی خۆی پێی نەدەگەیشت، ئەم سیفەتە بەرزانەش تەنهاو تەنها لە قورئاندا باس کراون کە گوفتاری پەروەردگارە.

بۆ نمونە لە سورەتی (الحشر: ٢٢ . ٢٤) ﴿ هُوَ اللَّهُ الَّذِي لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ (٢٢) هُوَ اللَّهُ الَّذِي لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلامُ الْمُؤْمِنُ الْمُهَيْمِنُ الْعَزِيزُ الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ (٢٣) هُوَ اللَّهُ الْخَالِقُ الْبَارِئُ الْمُصَوِّرُ لَهُ الأَسْمَاءُ الْحُسْنَى يُسَبِّحُ لَهُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾

الإخلاص ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ (١) اللَّهُ الصَّمَدُ (٢) لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ (٣) وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُواً أَحَدٌ (٤)﴾

(الرعد:٩) ﴿ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْكَبِيرُ الْمُتَعَالِي ﴾

( الشورى :١١ـ ١٢) ﴿ فَاطِرُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ جَعَلَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجاً وَمِنَ الأَنْعَامِ أَزْوَاجاً يَذْرَؤُكُمْ فِيهِ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ (١١) لَهُ مَقَالِيدُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَنْ يَشَاءُ وَيَقْدِرُ إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾

(البقرة: ٢٥٥ )( آية الكرسي ) ﴿ اللَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلا نَوْمٌ لَهُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ مَنْ ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِنْ عِلْمِهِ إِلاَّ بِمَا شَاءَ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ وَلا يَئُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ﴾.

هەر یەکە لەم سیفەتانە ئەو ڕاستیەمان پێش چاو دەخات کە زاتی پەروەردگار چەندە پیرۆزە پاك و بێگەردو خاوەن فەیزو بەرەکەتە بەسەر دروستکراوەکانیدا ....

ئەگـەر ئێـستا بگەڕێینـەوە بـۆ سـەر ئـەو ـ تـەورات ـ ەی کـە جـەنابت وا ئامـاژەت پێـدا کـە قورئـان لـەوەوە وەرگـیرا بێـت، ئـەوا دەبێـت بـەراووردێکی سیفاتەکانی خوای گەورە بکەین بزانین ئەم تەوراتە چۆن دەڕوانێتـە خـوا ، ئـەو خوایـەی کـە لـە قورئانـدا ئاماژەمـان پێـدا خـاوەنی جـوانترین و بـەرزترین و پیرۆزترین ناوو سیفەتە.

کاک ئازاد جارێکی تر خۆی جولاندو قەڵەمەکەی بەدەستەوە گرت و وتی:

* ئەگەر ئاماژە بە کتێبی پیرۆز دەدەیت، ئەوا ـ اصحاح ـ و ژمارەکەیم پێ بڵێ یا من لای خۆم تۆماری بکەم و دڵنیا ببم.

وتم: زۆر باشە، بەڵام دەقەکان بە زمانی عەرەبین. خۆم بۆت وەردەگێڕم چونکە زۆر لە هەوڵی ئەوەدا بووم ـ نسخەیەك ـ لە کتێبی ـ پەیمانی کۆن ـ م بـە کـوردی دەسـت بکـەوێت بـەڵام دەسـتم نەکـەوت، نـازانم بـۆ... ؟ لـە کاتێکدا پەیمانی نوێ ژمارەیەکی بێ شوماری لێرەو لەوێ لێ چاپ دەکرێ و بلاو دەکرێتەوە .

- کاك ئازاد وتی:

پـەیمانی کـۆن وەرگێڕدراوەتـە سـەر زمـانی کـوردی بـەڵام ژمـارەی ـ نسخەکانی ـ ١٥٠ ـ دانـە زیـاتر نیـەو لـەلای هـەموو کەسـێك نیـە گرفتـی وەرگێڕانی تیایە.

- منیش بە زەردەخەنەیەکەوە ووتم:

لەوانەیە گرفتی وەرگێڕان نەبێت کانیەکە لـە سەرچـاوەوە لێڵـە وەرگێـڕ بڵێت چی ... ؟

بەهەر حالْ با بگەڕێینەوە سەرباسەکەی خۆمان. بە چاوگێڕانێکی خێرا بە کتێبی پیرۆز ـ هەردوو پەیمانی کون و نویْ ـ واتە( تەورات و ئینجیل) تێدەگەین کە چەندە پەڕپوتی و لاوازی و بێدەسەلاتی دەدرێتە پالْ خوا .. !!! هێندە نزم و پەست باس لە خوا کروە کە ناگاتە شان بەشانی دروستکراوەکانی خۆشی، هەرگیز ئەم قسانە شایەنی بەرزی و پیرۆزی خوای گەورە نین.... سەیری چیرۆکی ـ تکوین ـ بکە کە باسی دروست بوونی گەردوون و ژیان و دەکات چەندە شێواوو شکستە: لەم چیرۆکەدا خوای گەورەو بالاْدەست لە کیْ بڕکێی دروستکراوەکانی خۆی دەترسێت، بۆیە لە هەولْی ئەوەدایە فێلْ و پاشقولکاری بکات تا سەرکەوێت .

لە پەیمانی کۆندا ـ تورات ـ کە باس لەوە دەکات کە خوا ئادەم و حەوای لە بەهەشتی ـ عدن ـ دا نیشتەجیْ کرد، رێگای دان لەبەری هەموو درەختەکان بخۆن، تەنها بەری درەختی ـ معرفە ـ ی خێرو شەڕ نەبێت نابێت لێی بخۆن بەمەش فێلْی لیْ کردن کە پێی وتن (لەبەر ئەوەی تۆ ـ قسەکە ئاراستەی ئادەمە ـ ئەو رۆژەی لەبەری ئەم درەختە دەخۆی ئەوا دەمریت) سفر التكوين: اصحاح الثاني: ١٨ .

ئەم درۆیەش بۆیە کرا تا هێندەی خوا شارەزا نەبن و بکەونە مل مللانێی دەسەلاْتی خوا، هەر بۆیەش شەیتان قسەکان بە راست دەزانێت و هەر لە ـ سفر التكوين ـ اصحاح ٣/ ٤ـ٥ـ٦ دا دەلْێت: ( نامرن، بەلاْم خوا دەزانێت ئەو رۆژەی بەری ئەم درەختە دەخۆن چاوتان دەکرێتەوەو وەکو خوا خێرو شەڕ دەناسن)

خراپتر لەم باسە ئەوەیە گوایە کاتێك کە بەری درەختەکەیان خوارد بۆیان دەرکەوت قسەکەی خوا درۆ بوو ئەوەی شەیتان راست دەرچوو ـ پەنا بەخوا ـ بەوەی چاویان کرایەوە خۆیان بە روتی بینی ئیتر لە گەلای هەنجیر خۆیان داپۆشی، لەوەش خراپتر لەم باسەدا ئەوەیە لە کاتی ئەم رووداوەدا خوا بە پێ لە بەهەشتدا هاتووچۆی دەکرد..!!! گوێی لەم دەنگە دەنگە بوو !!! وتی ئەوەتا مرۆڤ وەك ئێمەی لێ هاتووە، ئێستا لەوانەیە دەست بۆ درەختی ژیان بەرێت ئیتر بۆ هەتا هەتایە بە نەمری بمێنێتەوە لەبەر ئەوەی لە بەهەشت دەری کردن پاسەوانی بۆ دانا تا نزیکی نەکەونەوە.

ئەمە خوای ـ تەوراتە ـ کە چۆن لە دروستکراوەکانی خۆی دەترسێت و چۆن خەریکی فرت و فێڵ کردنە لێیان، خوایەکی بێ ئاگا، نەزان !!! درۆیەك دەکات کە شەیتان بە درۆی دەخاتەوە.

بەڵام گەر لە روانگەی قورئانەوە بۆ ئەم دۆزە بروانیت ئەوا مەسەلەکە بەو جۆرە نیە کە ـ تورات ـ ی دەستکاری کراو لێ ی دەدوێت.

قورئان وا باس دەکات کە نەخواردنی بەری ئەو درەخت بۆ ئەوەیە تا مرۆڤ دوچار بە نارەحەتی و تەنگژەیی نەیەت ئەگەر بیخۆن ئەوا نارەحەتی چاوەروانیان دەکات. ئەم قەدەغەکردنەش لە قورئاندا مەسەلەیەکی رێنومایی کردنەو لەبەرژەوەندی خۆیانە ﴿فلا یخرجنکما من الجنة فتشقی﴾ (طه: ١١٧).

واتە دوای ئەو خۆشی و راحەتیەی کە تیایا دەژین بە خواردنی بەری ئەو درەختە دوچار بە نارەحەتی دەبن.

هەروەها قورئان ئاماژە بەوە دەدات کە شەیتان فێڵی لێ کردن و درۆی لەگەڵ کردن ﴿وَقَالَ مَا نَهَاكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ إِلاَّ أَنْ تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ الْخَالِدِينَ (٢٠) وَقَاسَمَهُمَا إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ النَّاصِحِينَ (٢١) فَدَلاَّهُمَا بِغُرُورٍ فَلَمَّا ذَاقَا الشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِنْ وَرَقِ الْجَنَّةِ وَنَادَاهُمَا رَبُّهُمَا أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَنْ تِلْكُمَا الشَّجَرَةِ وَأَقُلْ لَكُمَا إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُبِينٌ﴾(الأعراف/ ٢٠-٢٢). کەواتە ئەوەی کە درۆی کردو کەوتە فریو دان شەیتان بوو، بە پێچەوانەی بۆچونەکەی تەوراتەوە.

لە لایەکی تر قورئان زۆر جەخت لە میهرو بەزەیی پەروەردگار دەکاتەوە بۆ بەندەکانی، ئەم بەزەیی و میهرەی تەنانەت کەسانی یاخی و سەرکێش و لە رێگا دەرچوانیش دەگرێتەوە کە داوایان لێ دەکات وا نەزانن سۆزو بەزەیی خوا نایان گرێتەوە ﴿ قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لا تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعاً إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾(الزمر/ ٥٣) هەر بۆیە خوای گەورە تەوبەی لە ئادەم قەبوڵ کرد سەرەڕای ئەو لە بیرکردنەی پەیمانی نەخواردنی بەری درەختەکەو زوڵم کردن لە نەفسی خۆی. ﴿ ثُمَّ اجْتَبَاهُ رَبُّهُ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَى ﴾(طه/ ١٢٢).

هەروەك پەیمانی ئەوەشی پێدا کە سۆزو بەزەیی خوا لە دوای خۆشی بەسەر نەوەکانیشیدا ببەخشێت ﴿ ..... فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ مِنِّي هُدًى فَمَنْ تَبِعَ هُدَايَ فَلا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾( البقرة/ ٣٨).

ئەمەش ئەوەمان پێ دەڵێت کە سۆزو بەرەکەتی خوایی بەردەوام بەسەر دانیشتوانی سەرزەویدا پەخش و بڵاوە بە پێچەوانەی تەوراتەوە کە لای وایە خوا ـ کە غەزەبی لە ئادەم گرتووە ـ ئەوا سەر زەوی بە خۆی و خێزان و وەچەکانیەوە وەبەر لەعنەت کەوتوون ( زەوی بەهۆی تۆوە بە لەعنەت کراوە) تکوین: اصحاح ٣/ ١٧.

بەڵێ خوا لە قورئاندا لێبووردەو بەسۆزو میهرەبانە لەگەڵ بەندەکانیدا کەچی لە تەوراتدا بوغزاوی و ڕق ئەستوورە. ئیتر چۆن دەکرێت بڵێیت تەورات ئەسڵەو قورئان لەوێوە وەرگیراوە..؟!!

سەیرم کرد وورد گوێی گرتووە، بۆیە ئەم گوێ گرتنەی بووە هاندەری ئەوە کە نموونەی زیاتر باس بکەم و زیاتر قوڵ ببینەوە. دووبارە ووتم:

تێڕوانینی هەریەکە لە تەورات و قورئان بۆ پێغەمبەرانی پێشین زۆر لە یەك جیایە کە ناکرێت هەرگیز قسەی دووەم کۆپی کراوی قسەی یەکەم بێت. چونکە لە قورئانی پیرۆزدا لە هەر کوێیەك باسی پێغەمبەرانی پێشین کرابێت (د.خ) ئەوا بە ئەو پەڕی ڕێزو حورمەت و نرخاندنی هەوڵ و کۆششیان دەور دراون. وە قورئان هەر هەموویان لە خراپەو تاوان بە دوور دەگرێت. نموونەش تەنها لە سورەتی الصافات:(٧٥ـ ٨١)دا ﴿ وَلَقَدْ نَادَانَا نُوحٌ فَلَنِعْمَ الْمُجِيبُونَ (٧٥) وَنَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ مِنْ الْكَرْبِ الْعَظِيمِ (٧٦) وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُ هُمْ الْبَاقِينَ (٧٧) وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الآخِرِينَ (٧٨) سَلامٌ عَلَى نُوحٍ فِي الْعَالَمِينَ (٧٩) إِنَّا كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ (٨٠) إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ ﴾.

وە(٨٣. ١١٣) ﴿وَإِنَّ مِنْ شِيعَتِهِ لإِبْرَاهِيمَ (٨٣) إِذْ جَاءَ رَبَّهُ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ (٨٤) إِذْ قَالَ لأَبِيهِ وَقَوْمِهِ مَاذَا تَعْبُدُونَ (٨٥) أَئِفْكاً آلِهَةً دُونَ اللَّهِ تُرِيدُونَ (٨٦) فَمَا ظَنُّكُمْ بِرَبِّ الْعَالَمِينَ (٨٧) فَنَظَرَ نَظْرَةً فِي النُّجُومِ (٨٨) فَقَالَ إِنِّي سَقِيمٌ (٨٩) فَتَوَلَّوْا عَنْهُ مُدْبِرِينَ (٩٠) فَرَاغَ إِلَى آلِهَتِهِمْ فَقَالَ أَلا تَأْكُلُونَ (٩١) مَا لَكُمْ لا تَنطِقُونَ (٩٢) فَرَاغَ عَلَيْهِمْ ضَرْباً بِالْيَمِينِ (٩٣) فَأَقْبَلُوا إِلَيْهِ يَزِفُّونَ (٩٤) قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ (٩٥) وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ (٩٦) قَالُوا ابْنُوا لَهُ بُنْيَاناً فَأَلْقُوهُ فِي الْجَحِيمِ (٩٧) فَأَرَادُوا بِهِ كَيْداً فَجَعَلْنَاهُمْ الأَسْفَلِينَ (٩٨) وَقَالَ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَى رَبِّي سَيَهْدِينِ (٩٩) رَبِّ هَبْ لِي مِنْ الصَّالِحِينَ (١٠٠) فَبَشَّرْنَاهُ بِغُلامٍ حَلِيمٍ (١٠١) فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ السَّعْيَ قَالَ يَا بُنَيَّ إِنِّي أَرَى فِي الْمَنَامِ أَنِّي أَذْبَحُكَ فَانظُرْ مَاذَا تَرَى قَالَ يَا أَبَتِ افْعَلْ مَا تُؤْمَرُ سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ مِنْ الصَّابِرِينَ (١٠٢) فَلَمَّا أَسْلَمَا وَتَلَّهُ لِلْجَبِينِ (١٠٣) وَنَادَيْنَاهُ أَنْ يَا

إِبْرَاهِيمُ (١٠٤) قَدْ صَدَّقْتَ الرُّؤْيَا إِنَّا كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ (١٠٥) إِنَّ هَذَا لَهُوَ الْبَلَاءُ الْمُبِينُ (١٠٦) وَفَدَيْنَاهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ (١٠٧) وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الآخِرِينَ (١٠٨) سَلامٌ عَلَى إِبْرَاهِيمَ (١٠٩) كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ (١١٠) إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ (١١١) وَبَشَّرْنَاهُ بِإِسْحَقَ نَبِيّاً مِنْ الصَّالِحِينَ (١١٢) وَبَارَكْنَا عَلَيْهِ وَعَلَى إِسْحَقَ وَمِنْ ذُرِّيَّتِهِمَا مُحْسِنٌ وَظَالِمٌ لِنَفْسِهِ مُبِينٌ﴾.

**پاشان**(١١٤ـ ١٢٢)﴿ وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَى مُوسَى وَهَارُونَ (١١٤) وَنَجَّيْنَاهُمَا وَقَوْمَهُمَا مِنْ الْكَرْبِ الْعَظِيمِ (١١٥) وَنَصَرْنَاهُمْ فَكَانُوا هُمْ الْغَالِبِينَ (١١٦) وَآتَيْنَاهُمَا الْكِتَابَ الْمُسْتَبِينَ (١١٧) وَهَدَيْنَاهُمَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ (١١٨) وَتَرَكْنَا عَلَيْهِمَا فِي الآخِرِينَ (١١٩) سَلامٌ عَلَى مُوسَى وَهَارُونَ (١٢٠) إِنَّا كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ (١٢١) إِنَّهُمَا مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ ﴾.

(١٢٣ـ ١٣٢)﴿ وَإِنَّ إِلْيَاسَ لَمِنْ الْمُرْسَلِينَ (١٢٣) إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ أَلا تَتَّقُونَ (١٢٤) أَتَدْعُونَ بَعْلاً وَتَذَرُونَ أَحْسَنَ الْخَالِقِينَ (١٢٥) اللَّهَ رَبَّكُمْ وَرَبَّ آبَائِكُمْ الأَوَّلِينَ (١٢٦) فَكَذَّبُوهُ فَإِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ (١٢٧) إِلاَّ عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ (١٢٨) وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الآخِرِينَ (١٢٩) سَلامٌ عَلَى إِلْ يَاسِينَ (١٣٠) إِنَّا كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ (١٣١) إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ ﴾

**ئیتر بەم شێوەیە لە هەر کوێیەکدا ناوی پێغەمبەرێك (د.خ) هاتبێت ئەوا چەپکەیەك رێزو حورمەت هاوپێچیانە.**

**بەلاّم تەورات وانیە، چیرۆکێك لە هەر کام لە چیرۆکەکان دەگریت خەروارێك قسەی خراپ و ناجۆر دەداتە پاڵ پێغەمبەرێکی خوا. بگرە جاری وا هەیە هێندە بێرێزی دەردەبڕن کە شایەنی نەك ئەوان بگرە هیچ باوەڕدارێك نیە.**

**ئەوە ـ نوح ـ گەورەی پێغەمبەران ـ تەورات ـ دەڵێت کەسێکی سەرخۆش و مەست و بەد رەفتارە !!! تا نەڵێیت ئەم قسانە لە گیرفانی خۆت دەردەهێنیت، هەر چەند دەشزانم بە سەریا تێپەڕیوبت بەلاّم ئاوڕت لێ نەداوەتەوە، بۆ ئەم قسەیە سەیری ( سفر التكوين: اصحاح:٩/٢١ـ ٢٧ ) بکە بزانە چی دەڵێت ؟**

**ناڵێت کە ـ نوح ـ لە کەشتیەکە دابەزی خێرا مێوێکی ناشت، شەرابی لێ دروست کرد، مەست و سەرخۆش بوو، تا ئەوە بوو خۆی رووت کردەوە و**

-حام- ی کوڕی بە ڕوتی باوکی بینی. گەڕایەوە هەواڵی بە براکانی دا، ئیتر نوحی باوکی لە پاداشتی ئەم کردەوەیەیدا خۆی و وەچەکانی بەلەعنەت کرد و دوعای خراپەی لێ کردن.

بۆیە وەچەکانی ـ حام ـ بوونە بەندەو کۆیلەی باقی براکانی تری کە سام و یافث بوون، ئەم بەلەعنەت کردنە هەتا هەتایە.ئەمەیە تێڕوانینی تەورات، بۆ پێغەمبەرێکی ماندوونەناس و لە خۆبوردو کە سەدەها ساڵ شەوی دەخستە سەر ڕۆژو ڕۆژی دەخستە سەر شەو لە پێناو باوەڕهێنان و ڕزگاربوونی گەلەکەی لە خراپەو لە تاوان.

قەڵەمەکەی دەرهێناو خستیە سەر مێزەکەو وتی:

مامۆستا تۆ شتەکەت ئاڵۆز کرد، من پێت دەڵێم هەر ئاوا سەیرێکی قورئان و پەیمانی کۆن بکە بزانە هەست ناکەیت قورئان ئەم باس و خواسانەی سەراپا لە پەیمانی کۆنەوە وەرگرتووە و جارێکی تر دایڕشتۆتەوە بگرە دەستکاریشی کردووە.

وتم:

وا دیارە جەنابتان لەو ڕوونکردنەوەیەی پێشوو باش تێنەگەیشتوون یان من باش ڕوونم نەکردۆتەوە،

کە بە هۆی ئەوەی ئەم دوو ئایینە سەرچاوەی سەرەکیان ( بێگومان پێش دەستکاریکردنی ـ پەیمانی

کۆن) لە ئاسمانەوەیە ئەوا بە لاتەوە جێگای گومان پێ بردن نەبێت کە لە گرتە ـ لقطة ـ ی چەند دیمەنێکدا یەك تێڕوانینیان هەبێت هەروەك ئەمە هەرگیز بەو مانایە نایەت، کە بەڕێزت ئاماژەت پێدا. من وام زانی تەنها بەو

شیکردنەوەیە بەڕێزت لە خاڵی مەبەست تێگەیشتویت. کەواتە ئێستا دەبێت زیاتر ئەم باسەت لەگەڵدا وردبکەمەوە تا باشتر تێبگەیت.

با ئێستا بزانین ـ لێ وەرگرتن ـ کە جەنابت قەناعەت پێیەتی چۆنەو چۆن چۆنی دەبێت. ئەوسا بەم پێوانەیە دەرەنجامەکان سەنگ و کێش بکە.

لێ وەرگرتن کردەیەکی فیکریە و لەسەر ٣ پایە بەندە:

**یەکەم/** شتی لێ وەرگیراو: واتە سەرچاوەی لێوەرگرتنەکە.

**دووەم/** کەسی بکەر: ئەو کەسەی بەم کارە هەڵدەستێت.

**سێیەم/** ئەو ماددەیەی کە وەرگیراوە.

ئێستا دەبێت بڵێین کە هەموو ماددەیەك کە وەردەگیرێت ئەوا کەسی ـ بکەر ـ لە دوو ڕێگاوە دەتوانێت وەری بگرێت.

أـ ئەوەیە کە کەسی بکەر ئەو ماناو مەبەستەی کە دەیەوێت هەمووی یان بەشێکی بەهەمان وشەو یان بەهەمان مانا وەربگرێن.

ب ـ یان ئەوەتا تەنها هەموو واتاکەی وەربگیرێت، یان بەشێك لە واتاکەی، ئیتر هەر لە لای خۆی و بە دارشتنەوەی خۆی گوزارشت لە بابەتە وەرگیراوەکە دەکات.

ئەو کەسەی بەم کارەش هەڵدەستێت ئەوا کۆت و بەندی سەرچاوەی لێ وەرگرتنەکە دەبێت، ناتوانێت لە بازنەی ئەو دووربکەوێتەوە.

چونکە هیچ ڕێگایەك نیە بۆ ناسینی ماددە وەرگیراوەکە بە پشت بەستن نەبێت بە سەرچاوەی ماددە لێوەرگیراوەکە. چونکە ماددەی لێ وەرگیراو ئەسڵەو ماددەی وەرگیراو بەشێکە یان بڵێین لقێکە، کەواتە ئەو کەسەی کە بەکاری وەرگرتن هەڵدەستێت لە دوڕیانێکدایە کە ڕێگای سێهەمی نیە .

**ڕێگای یەکەم**/ ئەوەیە کە هەموو فیکرەکە بە هەمان وشەو بەهەمان مانا بە تەنها وەرگیرێت.

**ڕێگای دووەم**/ ئەوەیە بەشێك لە فیکرەکە بە هەمان وشەو بە هەمان مانا یان تەنها بە هەمان مانا وەربگرێت.

ناکرێت کەسی وەرگر خۆی زیادەیەك بخاتە سەر کە لە سەرچاوەکەدا بوونی نەبێت. لەبەر ئەوەی ئێمە پێشتر وتمان: کە کەسی وەرگر هیچ سەرچاوەیەکی تری نیە بۆ زانین جگە لەو سەرچاوەیە نەبێت.

ئیتر چۆن دەتوانت شتێکی زیادە بخاتە سەر کە ئەو خۆی هیچ پەیوەندیەکی بە سەرچاوەکەوە نیە، جگە لەو سەرچاوەیەی کە لەبەر دەستیایەتی.

ئەگەر وەرگرتن بەم جۆرە بێت ئەوا بانگەشەی ئەوانە ڕاست دەردەچێت کە دەڵێن فلانە کەس فلانە شتی لە منەوە وەرگرتووە.

بەلام کاك ئازاد دەڵێم: ئەگەر لە نێوان دوو نوسیندا لە یەکچون هەبوو یەکێکیان لە پێشتر نوسرا بوو ئەویتریان دواتر نوسرابوو وە ئەوەی دواتر نووسرا بوو جیاوازی هەبوو لەوەی لە پێش خۆی وەك ئەوەی:

١ـ فیکرەی دووەم ساناترو تۆکمە تر بێت، ئەوەی لە لای ئەم بێت ئەوەی پێشوو باسی نەکردبێت.

٢ـ یان ئەوەتا دوهەمیان هەڵەکانی یەکەمی ڕاست کردبێتەوە، یان ئەوەتا پانۆڕامای ڕووداوەکانی جیاواز لەوەی یەکەم بخاتە ڕوو.

لەم حاڵەتەدا ئەوا کەسی یەکەم ناتوانیت بڵێت کەسی دووەم لە منیەوە وەرگرتووە.

رەت دانەوەی ئەم تۆمەتە لە لایەن کەسی تۆمەت بۆ هەڵبەستراوە شتێکی قەبوڵ و گونجاوە. چونکە گومانی هەڵسانی کەسی بکەر تەنها لە چوارچێوەی - ئەگەری - تەنها وەرگرتن لەسەرچاوەی لێوەرگرتنەکە نیە بەڵکو کەسی دووەم زیادی کردووە وە پێچەوانەی ئەوە وە شتی تری باس کردووە واتە بەسەر کەسی یەکەمدا تێپەڕبووە تا ئەوەی خۆی گەیاندۆتە سەر ئەو سەرچاوەیەی کە سەرچاوەکەی یەکەمی لێ وەرگیراوە، ئەمیش وەکو کەسی یەکەم هەستاوە بە لێ وەرگرتن کەواتە ئەوی دووەم - وەرگر - نیەو کۆپی نەکردۆتەوە.

بەڵکو دامەزرێنەری راستیەو لە سەرچاوە سەرەکیەوە وەریگرتۆتەوەو نەبۆتە وەرگر لە لایەنی دووەم.

ئێستا با ئەو تۆمەتەی جەنابتان بەم بنەما زانستیانە سەنگ و کێش بکەین بزانین تا چەندە تۆمەتەکەی جەنابتان راست دەدەچێت.

ئایا گوایە کاتێك کە قورئان هەستاوە بە وەرگرتن لە تەوراتەوە وەك خۆتان بانگەشە دەکەن، ئەمیش ملکەچی ئەو بنەمایانە بووە کە بریتین لە وەرگرتنی هەموو فیکرەکان وە گرتنی بەشێکی ئیتر بەم جۆرە قورئان لە بازنەی تەوراتدا دەخولێتەوە، ئەودەم ئەو بانگەشەیەتان راست دەردەچێت کە دەڵێت زۆربەی قورئان لە تەوراتەوە وەرگیراوە؟

یان ئەوەتا قورئان لەم سنوورەدا نەوەستاوە کە تەورات باسی لێ کردووە بەڵکو:

١ـ رووداوەکانی بە شێوەیەکی جیاواز لەوەی کە تەورات باسی لێ دەکات خستۆتە روو.

٢ـ لەو باسانەی کە لەگەڵ تەورات هاوبەشن قورئان شتێکی نوێی زیادەی خستۆتە سەر.

٣ـ چەندین هەڵەی مەترسیدار ی راست کردۆتەوە، کە زۆرشوێنی جیاوازدا تەورات لێ ی داوە.

٤ـ بە تەنها باسی لەهەندێ شتی تر کردووە کە لە هیچ سەرچاوەیەکی تردا باسی نەکراوە.

٥ـ لە حاڵەتی را جیاوازی لەگەڵ تەورات لەسەر رووداوێك لە رووداوەکان ئەوا راستی ئەوەیە کە قورئان باسی لێ کردووە، ناڕاستیش لە لای تەوراتە ئەمەش بە شایەتی عەقڵ و زانستە.

جا کاك ئازاد: ئەگەر زانستیانە بدوێین دەبێت بڵێین ئەگەر جەنابتان لەسەر ئەگەری یەکەمن، ئەوا قورئان لە تەوراتەوە وەرگیراوە، بەڵام خۆ ئەگەر واقع ئەگەری دووەم بێت کەوایە ئەوا بانگەشەی وەرگرتنی قورئان لە تەوراتەوە وەرگیرابێت تێکدەشکێت و چی دی ئەو قسەیە مانای نامێنێت ئیتر لێرەوە قورئان خۆی دەبێتە خاوەن دەسەڵاتی خۆی لە خستنەرووی راستیەکان لاشم وانیە کە جەنابت هێندە دەمارگیر بیت وەیان راستی نەویست بیت کە پشت لەم راستیانە بکەیت بەڵام هەر پێم باشە دوبارە بەم رۆحەوە گەشتێکی تری بەراوردکاری نێوان قورئان و تەورات بکەین ئەو دەم نمونەکان خۆیان بۆمان دەدوێن شایەتی دەدەن کە کێ راست دەکات.

زەنگی مۆبایلەکەی لیبیدا. هەستی بە جۆرێك لە نارەحەتی کرد. لای وابوو کە کوژاندویەتیەوە بۆیە وتی: بە یارمەتیت دەتوانم قسە بکەم.

وتم: بە ئارەزووی خۆت ماڵی خۆتە.

ئیتر ژورەکەم بە جێ هێشت تا بە ئارەزووی خۆی قسەبکات، پاش کەمێك کە گەڕامەوە لای و پیاڵەچام برد سەیرم کرد دانیشتووە. یەکسەر وتی:

ببورە ماڵی مامم بون. حەزیان دەکرد ئێستا بڕۆم بۆ ماڵیان وەك وتم دەعوەتی ئەوانم بەڵام حەز دەکەم جارێ ئەگەر پێت باش بێت هێندێکی تر بدوێین، چونکە کاتی ئەوێم زۆرە، بەڵام وا نەزانی کە بێدەنگم، پارویەکی چەورم هەروا ئاسان قوت ناچم( بە پێکەنینەوە)

وتم: کاکە ئازاد بۆ من باسی چی بۆ بەڕێزت دەکەم، من بانگەشەی هیچ جۆرە ئایدییاو بەرنامەیەکم نەکردووە، ئەوەی من لەگەڵ بەڕێزت باسمان کردووە تەنها ڕاست کردنەوەی ئەو چەمکە هەڵانەن کە لە لایەن هەندێ کەس و لایەنەوە بۆ مەبەستی دیاری کراو دەستاو دەستیان پێ دەکرێت، خۆ تەنها بە قسەی ـ پەیمانی نوێ ـش بکەیت ئەوا دەبێ بزانی کە (ڕاستی ڕزگارتان دەکات) .

وە ئەم کارەی بەڕێزت کە بە دوای ڕاستیدا گەڕانە ئازادی زیاتر بە کەسایەتیت دەبەخشێت چونکە تۆ چەند ڕستەو دەستەواژەیەکی چەند کەسێکی نەیارو ناحەز بە ئیسلام وەك بیردۆزەکانی ئەنیشتاینت وەرگرتووە ئەمەش هەرگیز وانیە، تۆ ئێستا بەدوای وەڵامدا دەگەڕێیت ئەم گەڕانەت گەڕانەوەیە بۆ سەربەستی و ئازادی تاکەکەسی خۆت و خۆ نەبەستنەوەیە بە قسەی خەڵکانی تر.

ئەم باسە شتێکی بچوك نیە، کە تیایا قسەی هەرکەسێك وەربگیرێت کە نابەرپرسانە ئەسکوێی خۆی لەم دیزەیەدا بگێرێت، بەڵکو مەسەلەکە پەیوەستە بە گەڕان بەدوای بیروباوەڕێکی راست و دروست و سەرفرازی هەردوو دنیا.

ئێستا حەز دەکەم لە دنیای تیۆری دەرچین بە بەڵگەوە نمونەی جۆراوجۆر باس بکەم بۆ بەڕێزتان تا لاتان روون بێت کە قورئانی پیرۆز هیچی لە تەوراتەوە وەرنەگرتووە .

ئەویش بەوە دەبێت کە من ئێستا ـ تەورات ـ ەکەی ناو کتێبخانەکەم بخەمە بەردەستی جەنابت و لای خۆشم قورئانەکە سەیر بکەم ئەوسا بەبەراووردکاری چەند نمونەیەك زیاتر لە لات روون دەبێتەوە.

هەستام و لە کتێبخانەکەدا ـ کتێبی پیرۆز ـ م هێناو خستمە بەردەستی، وتم: سەیری ـ (سفر تکوین: إصحاح ١٩ـ فقرە: ٨ بۆ ٢٠) بخوێنەرەوە، کە وەك پێشتر وتم بە ـ عەرەبی ـ یە تا ئێستا کوردیەکەی لەبەردەستنا نیە، دەستی کرد بە خوێندنەوە منیش ئاوا کردمەوە بە کوردی{لە دوای ئەمەوە خانمی گەورەکەی ( مەبەست زولێخای عەزیزی میسرە) سەیری یوسفی کردو پێی ووت: لەگەڵم رابکشێ(٨) بەلاَم ئەو(یوسف) بەرپەرچی دایەوەو بە خانمی گەورەی وت: ئەو ـ واتە عەزیزی میسرـ گەورەیەم ئاگای لەم کارە نیەو ئەو ماڵی خۆی خستۆتە ئەستۆی من (٩) لەم ماڵەدا لە من گەورەتری تیایا نیە، وە جگە لە تۆ کە خێزانی ئەویت هەموو شتێکی خستۆتە بەردەستم، ئیتر من چۆن ئەو خراپە گەورەیە بکەم و تاوانباری لای خوا بم (١٠) رۆژی دواتر هەر قسەی لەگەڵ کرد، ئەویش وەلاَمی ئەوەی نەدایەوە کە لەگەڵیا بخەوێت و لەگەڵیا بێت (١١) ئیتر لە چەند رۆژێکی دواییدا چووە ژوورەوە بۆ ئەنجامدانی

کارەکانی خۆی، کەس لەماڵەوە نەبوو (١٢) ئیتر ئەو جلەکانی گرت و ووتی: لەگەڵم رابکشێ، ئەویش جلەکانی لای ئەو بەجێ هێشت و رایکردە دەرەو(١٤) هاواری کردە کەسانی ناو ماڵەکەی و ووتی: سەیر بکەن چۆن ئەم پیاوە عیبرانیەی بۆ هێناوین تا یاریمان پێ بکات، هات لەگەڵم رابکشێت بەلاّم من بەدەنگی بەرز هاوارم کرد(١٥) کاتێك بیستی من هاوار دەکەم و دەنگم بەرز کردەوە جلەکانی لە تەنیشتمەوە جێ هێشت و رایکردە دەرەوە (١٦) جلەکانی لای خۆیەوە دانا تا گەورەکەی هاتەوە بۆ ماڵ (١٧) ئیتر لەم جۆرە قسەی لەگەڵ کرد، وتی بەندە عیبرانیەکەی کە هێنات لەگەڵمان بێت (١٨) کە دەنگم بەرز کردەوەو هاوارم کرد جلەکانی لە تەنیشتمەوە جێ هێشت و رایکردە دەرەوە (١٩) کاتێك کە گەورەکەی قسەی خێزانەکەی بیست لە بارەی هەواڵەکەوە وتی: بەندەکەت ئاوای لێ کردم زۆر تووڕە بوو.

ئیتر گەورەکەی یوسفی گرت و خستیە بەندیخانەوە، ئەو شوێنەی بەندیەکانی پادشای تیایا کۆت و بەند کرابوون.

جا با ئێستا منیش لای خۆمەوە قورئانەکەت بۆ بخوێنمەوە دوایی دەکەوینە بەراووردکاری نێوانیان، (سورە یوسف ئایەتی ٢٣ تا ٣٥) ﴿ وَرَاوَدَتْهُ الَّتِي هُوَ فِي بَيْتِهَا عَن نَّفْسِهِ وَغَلَّقَتِ الأَبْوَابَ وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَ قَالَ مَعَاذَ اللّهِ إِنَّهُ رَبِّي أَحْسَنَ مَثْوَايَ إِنَّهُ لاَ يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ{٢٣} وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِ وَهَمَّ بِهَا لَوْلا أَن رَّأَى بُرْهَانَ رَبِّهِ كَذَلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوءَ وَالْفَحْشَاء إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ{٢٤} وَاسُتَبَقَا الْبَابَ وَقَدَّتْ قَمِيصَهُ مِن دُبُرٍ وَأَلْفَيَا سَيِّدَهَا لَدَى الْبَابِ قَالَتْ مَا جَزَاء مَنْ أَرَادَ بِأَهْلِكَ سُوَءاً إِلاَّ أَن يُسْجَنَ أَوْ عَذَابٌ أَلِيمٌ{٢٥} قَالَ هِيَ رَاوَدَتْنِي عَن نَّفْسِي وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنْ أَهْلِهَا إِن كَانَ قَمِيصُهُ

قُدَّ مِن قُبُلٍ فَصَدَقَتْ وَهُوَ مِنَ الكَاذِبِينَ{٢٦} وَإِنْ كَانَ قَمِيصُهُ قُدَّ مِن دُبُرٍ فَكَذَبَتْ وَهُوَ مِن الصَّادِقِينَ{٢٧} فَلَمَّا رَأَى قَمِيصَهُ قُدَّ مِن دُبُرٍ قَالَ إِنَّهُ مِن كَيْدِكُنَّ إِنَّ كَيْدَكُنَّ عَظِيمٌ{٢٨} يُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هَذَا وَاسْتَغْفِرِي لِذَنبِكِ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ الْخَاطِئِينَ{٢٩} وَقَالَ نِسْوَةٌ فِي الْمَدِينَةِ امْرَأَةُ الْعَزِيزِ تُرَاوِدُ فَتَاهَا عَن نَّفْسِهِ قَدْ شَغَفَهَا حُبّاً إِنَّا لَنَرَاهَا فِي ضَلاَلٍ مُّبِينٍ{٣٠} فَلَمَّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ وَأَعْتَدَتْ لَهُنَّ مُتَّكَأً وَآتَتْ كُلَّ وَاحِدَةٍ مِّنْهُنَّ سِكِّيناً وَقَالَتِ اخْرُجْ عَلَيْهِنَّ فَلَمَّا رَأَيْنَهُ أَكْبَرْنَهُ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ وَقُلْنَ حَاشَ لِلّهِ مَا هَذَا بَشَراً إِنْ هَذَا إِلاَّ مَلَكٌ كَرِيمٌ{٣١} قَالَتْ فَذَلِكُنَّ الَّذِي لُمْتُنَّنِي فِيهِ وَلَقَدْ رَاوَدتُّهُ عَن نَّفْسِهِ فَاسَتَعْصَمَ وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَا آمُرُهُ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُوناً مِّنَ الصَّاغِرِينَ{٣٢} قَالَ رَبِّ السِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِي إِلَيْهِ وَإِلاَّ تَصْرِفْ عَنِّي كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُن مِّنَ الْجَاهِلِينَ{٣٣} فَاسْتَجَابَ لَهُ رَبُّهُ فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ{٣٤} ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّن بَعْدِ مَا رَأَوُاْ الآيَاتِ لَيَسْجُنُنَّهُ حَتَّى حِينٍ{٣٥}﴾

کاک ئازاد ئێستا هەردوولامان لە سەرچاوەی سەرەکیەوە باسەکەمان خوێندەوە حەزم دەکرد بوار هەبوایە چەند جارێك بە هێواشتر هەردوو دەقەکانت بخوێندایەتەوەو خۆت ماندوو بکردایە بەوەی کە بزانیت جیاوازی نێوان ئەم دوو دەقە لە چیدایە ئێستا با بێین هەر بەم خێراییە ئاماژە بە جیاوازییەکان بدەین.

| قورئان | تەورات |
|---|---|
| ١- دەوردانەکەو هەوڵی دەست تێکەڵ کردن یەکجار بووە کە کۆتا جار بووە تیایا ـ زلێخا ـ سوور بووە لەسەر ئەنجامدانی. | ١ـ دەوردان و هەوڵی لەداونان چەند جار بووە؟ |
| ٢- باس لە دەرگا داخستن دەکات، وە یوسف هەوڵی ڕاکردن و خۆ ڕزگارکردن دەدات، جلەکانی لە دواوە ڕادەکێشێت و دەیدڕێنێت، کە گەیشە بەر دەرگا هاوسەری زولێخای بینی، ئیتر خێرا زولێخا کەوتە شکات کردن. | ٢- باس لە دەرگا داخستن ناکات، وە دەڵێت: یوسف جلەکانی لە لای زلێخا بە جێ هێشت و ڕایکرد، ئەویش وەستاو چاوەڕێی هاتنەوەی مێردەکەی کردو چیرۆکەکەی بۆ گێڕایەوە، دوای ئەوەی کە ئەوانەی لە ماڵدا بوون ئاگادار بوون لە بەسەرهاتەکە. |
| ٣- لە کاتی هاتنەوەی هاوسەرەکەیدا یوسف ئامادەبوو، بەرگری لە خۆی کرد، دوای ئەوەی هاوسەرەکەی بوختانی بۆ کردو وتی: ئەو بەدوام کەوتووە. | ٣- کە هاوسەرەکەی گەڕایەوە یوسف لەوێ نەبوو، وە یوسف لەلای هاوسەرەکەی هیچ بەرگریەکی لە خۆی نەکرد. |
| ٤- بە وردی باسی لە شایەتیدانی شایەتەکە دەکات، هەروەك باس لەوە دەکات کە هاوسەری زولێخاش قەناعەتی بە شایەتی دانەکە هەبووەو | ٤- باس لە شایەتی دان ناکات، دەڵێت: هاوسەری زولێخا بە بیستنی قسەکان لە یوسف توورە بوو. |

| | |
|---|---|
| | سەرکۆنەی زولێخای کردووە، یادی خستەوە کە تاوانی کردووە، وە بێ تاوانی و داوێن پاکی یوسف دەخاتە روو. |
| ٥- یەکسەر هاوسەری زولێخا بڕیاری دا کە یوسف بخرێتە بەندیخانەوە. | ٥- بڕیاری خستنە زیندان پاش ماوەیەك لە پەیوەندی وراگۆڕینەوەی هاوسەری زولێخاو دەست و پێوەندەکانی هات. |
| ٦- باس لەو ئافرەتانە ناکات کە لۆمەی ـ زولێخا ـ یان دەکرد لەسەر ئەم باسە. | ٦- بە وردی باسی ئەو ئافرەتانە دەکات کە سەرکۆنەی زولێخایان کردووە، هەروەك باسی لە هەڵوێستی زولێخاش دەکات سەبارەت بە ئەوان و چۆنیەتی دەعوەت کردنیان تا عوزر خوایی خۆیانی بەسەردا بسەپێنێت. |

کاك ئازاد، ئەمە کە ئێستا لەبەردەستی هەردوکماندایە بەو سەرپێیە ٦ خاڵی جیاوازو جەوهەریمان لێ دەرهێنا کە ئەگەر باش ورد بینەوە دەبینین هەردوکیان تەنها لەسەر ـ رووداوەکە ـ یەکدەنگن و بەس، ئیتر لەوانی ترو وەسف کردن ودیمەنەکانیان زۆر جیاوازن.

**قورئانی پیرۆز دوو شتی زۆر جوانی کردووە:**

**یەکەم**/ هەندێك شتی تازەی باس کردووە کە تەورات لێی بێ ئاگایە، نمونە:

١ـ قسەو باسی ئافرەتەکان و هەڵوێستیان لەو بارەیەوە.

٢ـ شایەتی دانی شایەتەکە کە لە خزمەکانی زولێخایە.

**دووەم**/ ڕاستکردنەوەی هەندێك هەڵە کە تەورات تێی کەوتووە ، نمونە:

١ـ یوسف جلەکانی لەلای زولێخا بەجێ نەهێشت بەڵکو لەبەریا بوو بەڵام ئەو لە دواوە دڕاندی.

٢ـ ئامادە نەبوونی یوسف لە کاتی هاتنەوەی هاوسەری زولێخاو نەبوونی قسەو باسی بەرگری کردنی یوسف لە خۆی.

بە پێویستم زانی پشوویەك بدەم و بزانم چی دەڵێت، دیار بوو ئەویش چاوەڕوان بوو بۆیە هەرکە وتم فەرموو بەڕێزت لەم بارەیەوە چی دەڵێیت، وتی:

* باشە بۆ دەبێت هەر هەڵەکردن لە ـ تەورات ـ ەوە بێت و ڕاستیەکەشی هەر لە قورئانەوە بێت ...!؟ ئایا هەموو ئەمە خۆی لە خۆیدا ـ تحیز ـ نیە لە تۆوە بۆ قورئان، چونکە قورئان کتێبی مسوڵمانەو تۆش خۆت بە مسوڵمان دەزانی.

وتم: من کە پاڵ بە قورئانەوە دەدەم لەبەر ئەوە نیە کە قورئانە بەڵکو دوو پاڵنەری سەرەکی هەن کە پاڵم پێوە دەنێت کە نەك هەر من بگرە پاڵ بە هەموو هەق دۆست و هەق ویستێکدا دەنێت کە پاڵ بە قورئانەوە بدەن.

**یەكەم/** هەرگیز لە قورئاندا شتێك باس نەكراوە كە پێچەوانەی هەق و راستی بێت ئەو توێژینەوە جۆراوجۆرانەی بە درێژایی سەدەكانی ئێستاو رابردوو كە بەسەر چەمكە قورئانیەكاندا كراون شایەتی ئەم راستیەن .

ئەمەش هەر خۆی بە تەنها دەبێتە هۆی ئەوەی زۆر بە توندی پشتگیری لە قورئان بكەم چونكە قورئان هەق و راستیە.

**دووەم/** هەر لەم رووداوەدا لە دەرەنجامی بەراووردكاریدا بۆت دەردەكەوێت، كە هەریەكە لە تەورات و قورئانی پیرۆز یەكدەنگن لەسەر داوێن پاكی و خۆدوور گرتنی یوسف لە گوناح. بەلاّم دوای ئەوە جیاوازن:

تەورات دەڵێ یوسف جلەكانی لە لای زولێخا بەجێ هێشت و رایكرد. بەلاّم لە قورئاندا نە جلەكانی داكەندووەو نە رایكردووە بەڵكو دەڵێت ئافرەتەكە لە دواوە جلەكانی راكێشاوەو دراندویەتی. ئەم رانەوەستاوە ئیتر جلەكانی جێ دڕاویەكی بەرچاوی تیایا دیاربووە.

باشە كاك ئازاد هەرخۆت ـ دادوەرـ بە بزانە كام لەم دوو گێڕانەوانە شایەنی كەسایەتی پاك دامێنی ـ یوسف ـ ن سەلامی خوای لێ بێت ؟ ئەوەی جلەكانی لەسەر جێگاكە بە جێ هێشت ؟ یان ئەوەی جلەكانی دانەنابێت و ئافرەتەكە لە دواوە جلەكانی بەری دادڕێت ؟

كاك ئازاد وەلاّمی نەدایەوە ، وتی تۆ خۆت بڵێ:

وتم: دەزانم تۆش هەمان قەناعەتی منت هەیە بەلاّم بوێر نیت دان بە جەرگی خۆتدا بنێیت وبڵێی ئەوەی قورئان باسی دەكات شایستەیە بە كەسایەتی كەسێكی وەك یوسفی داوێن پاك، دیارە هێشتا ماومانە یەك بە یەك ئەو بتانە بشكێنین كە لە ناخماندا قەناعەت و وەهمی درۆینە تەنیویەتی.

رانیم خەریکە لە باسەکە دەردەچم بۆیە دوبارە بێدەنگیەکەی ئەو بووە هاندەری ئەوەی کە درێژە بە قسەکانم بدەم و بگەڕێمەوە سەر باسەکەی خۆم و وتم:

ئەگەر بە قسەی گێڕانەوەی ـ تەورات ـ یش بێت ئەوا یوسف کەسێکی داوێن پاك نەبووە !!! ئەو ئافرەتەش کە زولێخایە قسەکەی راستە، چونکە یوسف چۆن هەروا لە خۆرایی و بیٚ مەبەست جلەکانی بەری خۆی دادەنێت، ئەگەر لەم کارەدا نیەتی پەنهانی ئەوە نەبێت کە یوسف خوازیار بووەو زولێخا بەرگریکار خۆ ناشکرێت بلێی ئافرەتەکە جلەکانی بەری ئەوی داکەندوو، چونکە خۆت دەزانی ـ یوسف ـ پیاوەو ئەو ئافرەت ئیتر چۆن ئاوا ئاسان پیاو لە جلەکانی دادەمالێت.

پاشان کە ئەگەر ئەو بەرگری لە خۆی کردبایە دەبوایە جلەکانی لای خۆی گل بدایەتەوە، ئەمەش وەك بەڵگەیەکی ماددی بۆ ناسینەوەی تاوان بار.

باشە ـ یوسف ـ بە رووتی چووە دەرەوەو جلەکانی هەروا بەجیٚ هێشت ...؟؟

بە کورتی ئەم گێڕانەوەیەی تەورات ئاماژەی ئاراستەکردنی تاوانباریە بە یوسف کە هەرگیزاو هەرگیز ئەمە لەو پێغەمبەرە ناوەشێتەوە. بەڵاٚم گێڕانەوەکەی قورئان ئاڕاستەکردنی پەنجەی تاوانە بۆ زولێخاو خستنە ڕووی پاکداوێنی یوسفە (سەلامی خوای لیٚ بێت) .

ئافرەتێکی ئاوا بانگی کردە سەر جێی خۆی بەڵاٚم ئەم لە دەستی رایکرد. وە لە دواوە کراسەکەی گرت و رایکێشاو لەبەریدا دڕا. ئەمەش لە دەرەنجامی دوو هێزی پێچەوانە یەکیان راکردن و خۆ رزگارکردن ئەویتریان گرتن و راکێشانی کراسەکە لە دواوە دوچاری دڕان هات.

ئەمەش تەواو هاوتای شانی یوسفی پاکداوێنە کە هەردوو سەرچاوەکە ئاماژەی پێ دەدەن، بۆیە دەڵێن قورئان ئەم هەڵە گەورەیەی کە تەورات تێی کەوتووە راست دەکاتەوە.

دەزانم هەر بێدەنگی... بەڵام ئێستاش هەر لات وایە قورئان لە تەوراتەوە وەرگیرا بێت ..؟!

ئایا بنەماکانی لێ وەرگرتن کە پێشتر ئاماژەمان پێدا بەسەر قورئاندا جێ بە جێ دەبن ؟ یان ئەوەتا قورئانی پیرۆز خۆی سەربەخۆیەو خاوەن توانا و دەستەڵاتی خۆیەتی لەوەی کە دەیلێت و بڕیاری لەسەر دەدات ... ؟

وەرگر یان هەموو یان بەشێك لە هەموو وەردەگرێت، بەڵام دەبینین کە قورئان ئەم بنەمایانە تێ دەپەڕێنێت و تازە باس دەخاتە ناوەوە کە پێشتر ئاماژەی پێ نەدراوە، هەروەك هەڵەکانی پێش خۆشی راست دەکاتەوە.

دیارە وەك بێ ئومێدبون دەرەنجامی قسەکانی خۆی ویستی دوا رستەی خۆی فڕێ بدات و وتی:

لام وایە جیاوازیان تەنها لە داڕشتنەوەو ستایلی باسەکەدایە ... !!

وتم:

نازانم مەبەستت کامە داڕشتنە من هەرچیم وت قسەم لە جەوهەرو کرۆکی مەسەلەکە کردو خۆم لە داڕشتنەوە بوارد، دەبوایە بزانی جیاوازی قورئان و تەورات لەم باسەدا جیاوازیە کە لە ئەسڵ و لقەکاندایە، هەروەك جیاوازیە لە تێڕوانین بۆ پاکداوێنی و هەڵبژاردنی دەستەواژەی شیاو شایستەو پڕمانا. ئەوەی کە تەورات دەیگێڕێتەوە هەرگیزاو هەرگیز بە کەڵکی ئەوە نایەت ببێتە

بنەمای ئەوەی کە قورئانی پیرۆز لێی دواوە. ئەساس بناغەی ئەسڵی قورئان ـ وحی ـ یە ئەمە سەرچاوەی رۆشنی قورئانە، هەر لەبەردراوشانەوەی ئەمەشە.

کە ئەوانەی دەیانەوێت بە بێژنگ بەری بگرن رەنجی پێوەریان پێ دەبڕێت و بەس.

هەرچۆنێك بەراووردکاری بکەیت لە نێوان قورئان و کتێبەکانی تر ئەوا ئەوەت بۆ روون ئەبێتەوە کە قورئان لە کتێبەکانی تر وەرنەگیراوە، ئەم نمونەیەی کە باسمان کردو لە چەندین نمونەی بەراووردکاری تردا تێ دەگەین کە قورئان سەرەڕای ئەوەی کە شتی تازەتری هێناوە ئەوا هەستاوە بە راستکردنەوەی هەڵەکانی کتێبەکانی پێشوتری وەکو تەورات و ئینجیل. ئەمەش لای راستی ئەو ئایەتە دەردەکەوێت کە دەفەرموێت { مُصَدِّقاً لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ .... } هەموو ئەو شتانەی دەستکاری نەکراون قورئان پشت راستی کردۆتەوە، ئەوانەش کە دەستی تێکدان و شێواندنی پێ گەیشتووە ئەوا راست کراوەتەوە .

بێدەنگی یەکی کەم خایەن کەوتە نێوانمان لام دابو کە ئەم نمونویە خۆی لە خۆیدا بەس بو بۆیە حەزم کرد ئەویش رای خۆی دەرببڕێت بێدەنگیەکەی شکاندو وتی:

دەشبێت بڵێم بە هۆی ئەوەی مەسیحیەکان دڵنەرم تر بوون و زیاتر کراوەبون لە جولەکەکان لە سەردەمی ـ محمد ـ دا ئەوا توانیبێتی زیاتر سوود لە ئینجیل وەربگرێت، بۆیە هەندێك باسی تر هەن کە لە قورئانەکەتان دایە خۆی ئاماژەیە کە لە ئینجیلەوە وەرگیراوە. بۆ نمونە باسی ـ مریەمی عەزراو زەکەریا ـ هەمان شتە کە قورئان دوبارەی کردۆتەوە بە کەمێك دەستکاریەوە ..!!

وتم: کاك ئازاد لەم جۆرە باسانەدا دەشێت، پێ دەچێت، دەگونجێت، لەوانەیە ...... هتد ، وەك پێشتر ئاماژەم پێ دایت قسەیەکی زانستی نین. قسەی بێ بەڵگەو بناغە لەدەست هەموو کەسێکی ئاساییش دێت چ جای قەڵەم بەدەستێکی دڵ پڕ لە قین بۆیە تکایە روتنر بدوێ، قسەکانت بەڵگەدار بکە .

دیار بوو ئەویش ئەم هەڵوێستەی پێ ناخۆش بوو بۆیە وتی: من لە خۆمەوە ناڵێم تۆ قورئانەکەی بەردەستت بکەرەوەو منیش ئاوا پەیمانی نوێ لە کتێبی پیرۆزدا دەکەمەوە بزانە هەر هەمان قسە نیە کە دوبارە بۆتەوە .

خێرا (ئینجیلی پیرۆز) چاپی یەکەمی ساڵی ١٩٩٩ز ـ کۆلاردۆ ـ بە زاراوەی سۆرانیم خستە بەردەست تۆزێك پەڕکانی هەڵدایەوەو وتی: ئێستا من لە ئینجیلی لۆقا(اصحاحی یەکەم)وە بۆت دەخوێنم تۆش لای خۆت لە قورئانەکەتاندا بۆی بڕوانەو بزانە قسەکەم وایە..!!

وتم: تۆ خۆت بگەڕێ من خۆم سورەتی (آل عمران و مریم)م لەبەرە کە لە هەردووکیاندا ئەم باسە کراوە.

وتی: ئەوەتا دۆزیمەوە لە لاپەڕە ١٢٣ دایە کە دەڵێت: { لە سەردەمی هیرۆدۆسی پاشای ناوچەی یەهودسا کاهینێك هەبوو سەرشۆڕیم لەناو خەڵکی لەسەر لاببەرێ}

تەواو گوێم لێ گرت تا لێ بۆوە، وتم: تەواو؟

وتی: بەڵێ. ئەوەی مەبەستم بوو خوێندمەوە ئێستا تۆش قورئانەکە بخوێنەرەوە بزانە هەر هەمان شت

نیە کە دوبارە بۆتەوە ؟ !

منیش لە سورەتی (آل عمران)ەوە دەستم کرد بە خوێندنەوە ﴿هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنْكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاء{٣٨} فَنَادَتْهُ الْمَلآئِكَةُ وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي فِي الْمِحْرَابِ أَنَّ اللّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَـى مُصَدِّقاً بِكَلِمَةٍ مِّنَ اللّهِ وَسَيِّداً وَحَصُوراً وَنَبِيّاً مِّنَ الصَّالِحِينَ{٣٩} قَالَ رَبِّ أَنَّىَ يَكُونُ لِي غُلاَمٌ وَقَدْ بَلَغَنِيَ الْكِبَرُ وَامْرَأَتِي عَاقِرٌ قَالَ كَذَلِكَ اللّهُ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ{٤٠} قَالَ رَبِّ اجْعَل لِّيَ آيَةً قَالَ آيَتُكَ أَلاَّ تُكَلِّمَ النَّاسَ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ إِلاَّ رَمْزاً وَاذْكُر رَّبَّكَ كَثِيراً وَسَبِّحْ بِالْعَشِيِّ وَالإِبْكَارِ{٤١}﴾

پاشان لە سورەتی ( مریم) یشدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ذِكْرُ رَحْمَةِ رَبِّكَ عَبْدَهُ زَكَرِيَّا{٢} إِذْ نَادَى رَبَّهُ نِدَاء خَفِيّاً{٣} قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ الْعَظْمُ مِنِّي وَاشْتَعَلَ الرَّأْسُ شَيْباً وَلَمْ أَكُن بِدُعَائِكَ رَبِّ شَقِيّاً{٤} وَإِنِّي خِفْتُ الْمَوَالِيَ مِن وَرَائِي وَكَانَتِ امْرَأَتِي عَاقِراً فَهَبْ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيّاً{٥} يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنْ آلِ يَعْقُوبَ وَاجْعَلْهُ رَبِّ رَضِيّاً{٦} يَا زَكَرِيَّا إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَامٍ اسْمُهُ يَحْيَى لَمْ نَجْعَل لَّهُ مِن قَبْلُ سَمِيّاً{٧} قَالَ رَبِّ أَنَّى يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَكَانَتِ امْرَأَتِي عَاقِراً وَقَدْ بَلَغْتُ مِنَ الْكِبَرِ عِتِيّاً{٨} قَالَ كَذَلِكَ قَالَ رَبُّكَ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِن قَبْلُ وَلَمْ تَكُ شَيْئاً{٩} قَالَ رَبِّ اجْعَل لِّي آيَةً قَالَ آيَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ النَّاسَ ثَلَاثَ لَيَالٍ سَوِيّاً{١٠} فَخَرَجَ عَلَى قَوْمِهِ مِنَ الْمِحْرَابِ فَأَوْحَى إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُوا بُكْرَةً وَعَشِيّاً{١١} يَا يَحْيَى خُذِ الْكِتَابَ بِقُوَّةٍ وَآتَيْنَاهُ الْحُكْمَ صَبِيّاً{١٢} وَحَنَاناً مِّن لَّدُنَّا وَزَكَاةً وَكَانَ تَقِيّاً{١٣} وَبَرّاً بِوَالِدَيْهِ وَلَمْ يَكُن جَبَّاراً عَصِيّاً{١٤} وَسَلَامٌ عَلَيْهِ يَوْمَ وُلِدَ وَيَوْمَ يَمُوتُ وَيَوْمَ يُبْعَثُ حَيّاً{١٥}﴾

وتم: تۆ هیچت هەیە لەبارەی ئەمەوە ؟

وتی: نەخێر، من پێشتر پێم وتی کە هەردوکیان یەک بابەتن، بەلاّم بە کەمێك دەستکاریەوە ..!

وتم: وەرە ئێستا با بە ووردی بۆت باس بکەم کە چەندە جیاوازی لە نێوان هەردوکیاندا هەیە.

جارێ با باسی سورەتی (آل عمران) بکەین:

١ـ لە قورئانداو لە سورەتی (آل عمران)دا پێش باسی مژدەدانەکە بە (آل عمران) ئەوا باس لەو ئافرەتە خواپەرستە دەکات کە نەزری کردبوو کە کۆرپەی هەناوی کە دوگیان ببەخشێتە پەرستگا بە مەبەستی خزمەت و خواپەرستی کە ئەمە لەوەی کە جەنابت خوێندتەوە هەر باسیشی نەهاتووە.

٢ـ سەبارت بەهەواڵی ئەوەی کە ئەو ئافرەتەی(آل عمران) کچی بوو- مریم ـ بەلاّم ئەو خوازیاری ئەوە بوو کە کورِ بێت. لەم ئینجیلەی بەردەستدا باسی نیە.

٣ـ لە ئەستۆ گرتنی ـ کفالە ـ مەریەم لە لایەن زەکەریاوە بوونی رزقی جۆراوجۆر لەلای مەریەم بە بێ زانینی سەرچاوەکەی . دیسان هەر باسی نەکراوە.

٤ـ لە قورئاندا چیرۆکی دۆعا کردنی منالً بوون لەلای زەکەریاو چیرۆکی لەدایك بوونی منالّی ئافرەتەکەی ـ آل عمران ـ بەیەکەوە بەستراونەتەوە.

٥ـ ئەو ریزبەندەیەی کە زەکەریا دەیکات بۆ وەرگرتنی بەخشش و دیاری خوایی. کە پشتاوپشت لە نەوەکانی یەعقوبدا بێت. لە ئینجیلدا باس نەکراوە.

٧ـ هۆکاری ئەوەی کە پالّی بەزەکەریاوە ناوە تا دۆعاکەی بکات ترسان بووە لە ـ الموالي ـ لە دوای خۆیەوە. کە دوبارە ئینجیل هیچ لەم باسەی نەکردووە.

٨ـ ئاماژە دانی زەکەریا کە قەوموکەی بەیانیان و ئێواران تسبیحات بکەن لە ئینجیلدا باسی نیە.

٩ـ پیاهەڵدان و مەدحکردنی منداڵە لە دایك بووە کە ـ یحیی ـ لەگەڵ دایك و باوکی زۆر باش دەبێت. سەلامی خوای لێبێت ئەو ڕۆژەی لە دایك بووە و ئەو ڕۆژەی وەفاتی کردووەو ئەو ڕۆژەی زیندوو دەبێتەوە . . . .. کە ئەمە لە قورئاندا باسکراوە ، بەلاّم لە ئینجیلدا باسنەکراوە .

جا کاك ئازاد .

ئەمانە هەموو تازەن کە قورئان بەس خۆی بەتایبەت لێیان دواوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە قورئان بەتەواوی چیرۆکەکەی وێنە گرتووە دیمەن دیمەن لێیان دواوە.

تائێستا ئێمە قسەمان لەسەر ئەوشتە تازانە کرد کە قورئان لێیان دواوەو ئینجیل باسی نەکردون . وەرە دوبارە بەیەکەوە با سەیری ئەو هەلاّنە بکەین کە قورئان بۆ ئینجیلی ڕاستکردۆتەوە.

١- دەقە ئینجیلەکەی کە تۆ خوێنتەوە ئاماژە بەوە دەدات کە بێدەنگ بونەکەی ـ زەکەریا ـ سزادانی فریشتەکان بووە بۆی، قورئان ئەم هەڵەیە ڕاست دەکاتەوە کە بێدەنگ بونەکەی

ـ زەکەریاـ سزادانی فریشتەکان نەبووە بەڵکو نیشانەی قبوڵ بوونی دوعاکەی زەکەریا خۆی بووە کەداوای کردوە خوای گەورە نیشانەیەکی نیشان بدات کەوا دوعاکەی لێ قبوڵ کردووە.

﴿قَالَ رَبِّ اجْعَل لِّي آيَةً قَالَ آيَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ النَّاسَ ثَلَاثَ لَيَالٍ سَوِيًّا﴾ — بێدەنگبوون-ەکەی ڕێزلێنانی خوا بووە لە زەکەریا ، نەك ئەوەی سزای فریشتەکان بوبێت، باشە دەبێت زەکەریا چی کردبێت تائاوا فریشتەکان سزای بدەن؟! تۆ بڵێی

داننانی بەوەدا کەئەو پیربووەو هاوسەرەکەشی نەزۆکە گوناهە بێت ؟ ئـەم قـسەو باسە بەسەر ـ ئیبراهیم ـ علیه السلام ـ یشداهاتووە، ئەو دەمەی مژدەی

ـ ئیسحاق ـ ی کوڕی پێدەدرێت، هەروەك ـ سارە ـ خاتونی هاوسەریشی کـە هەمان مژدەی بیست

هەمـان قسەی کـرد ، کەچـی خـوای گـەورە هـیچ کـام لـەو دوانـەی لەسـەر قسەکانیان سزا نەدا.

هەروەك ـ مریم ـ یش کاتێك مژدەی دووگیان بوونی پێدرا ئەویش هەروای ووت، کەچی خوای گەورە سزای نەدا .

باشە کاك ئازاد تۆ پێم بڵێ حیکمەت لەمەدا چیە ئەو دەسـتەواژەیەی کـە ئیبراهیم و سارەو مەریەم بەکاری دەهێنن خوا هیچ سزایەکیان نادات، کەچـی ئەم سزایە تەنهاو تەنها بەسەر زەکەریادا دەسەپێت.

بڵێی مەسەلەکە چی بێت؟ گەورەترین بەڵگەی ئەوەی کەئەم قسەیە بـوونی نەبێت ئەوەیە کە لە قورئاندا ئاماژەی پێنەدراوە، ئیتر تـۆ خـۆت ئازادیـت پـێم دەڵێیت تۆ دەمارگیریت تیایە بۆ قورئان یان نا، ئەو بێـدەنگ بونـەی زەکـەریا تەنها توانای قسەکردنی نەبوو لەگەڵ خەڵکی ئەگینا بۆ

ـ تەسبیحات ـ کردنی بەردەوام بوو.

٢- دەقە ئینجیلەکەی بەردەستت، ماوەی بێدەنگ بونی زەکەریا لە چـونە دەرەوەی لەهەیکەلەکە تا ڕۆژی لەدایك بونی ـ یحیی ـ دیـاری دەکـات. ئەمـەش هەڵەیەکە قورئان ئـاوا ڕاسـتیکردۆتەوە کـە ـ بێـدەنگ بونەکـە ـ ٣ شـەو و ڕۆژ بووە لەدوای چونە دەری لە میحراب.

٣- دەقە ئینجیلەکەی کە خوێنتەوە مژدە پێدانەکە دەخاتە سەرزاری یەك فریشتە بەلاّم قورئان لەهەردوو دەقەکەدا مژدە دەخاتە سەرزاری کۆمەڵێك لە فریشتەکان.

٤- هەروەك ئینجیل ناونانی ئەم منداڵە - یحی - کەپێی دەڵێن - یوحننا - لەلایەن زەکەریاوە بووەو فریشتەکانیش پێشبینی ئەوەیان کردووە، ئەمەش هەڵەیەکی ترە کە قورئان ڕاستی کردۆتەوە کەناونانی ئەم منداڵە لەلایەن خوداوە بووە. ﴿يَا زَكَرِيَّا إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَامٍ اسْمُهُ يَحْيَى لَمْ نَجْعَل لَّهُ مِن قَبْلُ سَمِيّاً﴾

٥- دەقە ئینجیلەکە ئاماژە بەوە دەدەن کە فریشتەکان چون بۆلای زەکەریا ئەو ترساو توشی پەشۆکان هات، قورئان ئاماژە بەمە نادات دیارە کە شتی وا ڕووی نەداوە .

کاك ئازاد ویستی ناوبڕێك بخاتە قسەکانم بۆیە وتی:

لەوانەیە قورئان بایەخ بەم جۆرە مەسەلە دەرونیانە نەدات.

وتم: وانیە ئەوەتا لە چەندین شوێندا نەك باس لە ترس و پەشۆکان دەکات بگرە دڵە ڕاوکێ و دودڵی

و ترسێکی کەمیش کە دوچاری لایەنی دەرونی کەسایەتیەك لە پێغەمبەران هاتبێت بالەوەی زەکەریاش کەمتر بێت. کە من پێم وایە هەر نەبوو، ئەوا هەر تۆماری کردووە ئەمەش چەند نموونەیەکە کەئەوە دەسەلمێنن کە قورئان ئەو حاڵەتانە گەر بوونی هەبوبێت ئەوا پشتگوێی نەخستووەو باسی کردووە:

سورەتی (طه) ئایەتی ٦٧﴿فَأَوْجَسَ فِي نَفْسِهِ خِيفَةً مُّوسَى﴾یان لەباسی یەکەمین دیمەن کە تیایا دارەکەی دەستی دەبێتە مار﴿وَأَلْقِ عَصَاكَ فَلَمَّا رَآهَا تَهْتَزُّ

كَأَنَّهَا جَانٌّ وَلَّى مُدْبِراً وَلَمْ يُعَقِّبْ يَا مُوسَى لَا تَخَفْ إِنِّي لَا يَخَافُ لَدَيَّ الْمُرْسَلُونَ﴾ هەروەك لە مەسەلەی هاتنی میوانەكان ـ فریشتەكان ـ بۆلای حەزرەتی ئیبراهیم مژدە پێدانی لەلایەن ئەوانەوە دەفەرموێت {إِذْ دَخَلُواْ عَلَيْهِ فَقَالُواْ سَلاماً قَالَ إِنَّا مِنكُمْ وَجِلُونَ}الحجر:٥٢. هەروەك مریەمی پاكداوێنیش كاتێك فریشتەكان دێن بۆلای دەفەرموێت

{قَالَتْ إِنِّي أَعُوذُ بِالرَّحْمَن مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيّاً }مريم:١٨.

دیارە ئەم هەموو دیمەنە وردو بچووكانە قورئان وێنەی گرتوون ، نەبونیان لە چیرۆكی زەكەریادا واتای ڕونەدانیەتی . ئەمەش خۆی لە خۆیدا ڕاستكردنەوەی بۆچونی ئەوانە .

ئەمە تەنها ٥ خاڵ بوو كە بۆ جەنابتم باسكرد كە تیایا قورئانی پیرۆز هەڵەكانی ئینجیلی تیایا ڕاستكردۆتەوە. بۆیە دەتوانم بڵێم قورئان بەم كاری ڕاستكردنەوەیەی دەقی ئینجیلە، دوو كاری زۆر باشی ئەنجام داوە:

**یەكەم**/ گرتنی وێنەی ڕوداوەكە بەبێ كەم وكوڕی و دەستكاریكردن.

**دووەم** / ڕاستكردنەوەی ئەو هەڵانەی كە لە ئینجیلدا هەن.

پاشان ئەو قسە بێ بناغەیە منیش دەمێكە بیستوومە كە گوایە ( قورئان هەموو چیرۆكەكانی لە كتێبی پیرۆزەوە وەرگرتووە). كە ئێمە گەر هەر ئەم بەسەرهاتەی حەزرەتی زەكەریا بخەینە بەرچاو. ئەوا دەبێت بڵێین كە كتێبێك كە ئەم بەسەرهاتەی تیایا تۆمار كراوە قورئانی پیرۆزو ئینجیلە.

نزیكی زەمەنی ئینجیل لە ڕووداوەكەوە چونكە ـ یحیی ـ هەر لەسەردەمی ـ عیسی ـ دا ژیاوە. دووری زەمەنی قورئان لە ڕووداوەكە نزیكەی ٧٠٠

سالێکە ئەوەمان لێ دەخوازێت کە ئەگەر ـ جدلاً ـ بلێین قورئان ڕووداوەکەی لە ئینجیلەوە وەرگرتووە. ئەوا دەبێت وەرگرتن لە دوو شێوەدا دەبێت:

**یەکەم** / قورئان بەشێکی بەسەرهاتەکە لە ئینجیلەوە وەرگرتبێت و چیرۆکەکەی بە نیوەناچڵی لە ئینجیلدا بەجێ هێشتبێت.

**دووەم** / چیرۆکەکە چۆن لە ئینجیل ـ داهاتووە ـ قورئان. بەبێ زیادو کەم وەری گرتبێت، بەڵام بە شێوازی خۆی دایبڕێژێتەوە . وەبەدانانی ـ گریمانە ـ ئەوەکە جگە لەم سەرچاوەیە قورئان هیچ سەرچاوەیەکی تری نییە، وە قورئان ناشتوانێت شتێك لە سەرچاوە سەرەکیەکەدا نەبێت ئەم خۆی بیخاتە سەر، دەبێت قورئان چی بکات.

ئایا بەشێك لە ڕووداوەکەی لە ـ ئینجیل ـ ەوە وەرگرێت، یان هەموو ڕووداوەکەی بەتەواوی گواستەوە. بەشوێن ـ ئینجبل ـ دا ڕۆیشتووە چۆن باسی کردووە ئەمیش هەروا....؟

جا با ئێستا وەلأم بدەینەوە:

ئەگەر قورئان ئەمەی بکردایە قورئان بەشێکی بەسەرهاتەکەی بگواستایەتەوە. بەڵام بە جۆرێکی تر دایبڕشتایەتەوەو دەستکاری ناوەڕۆکی نەکردایە. ئەوا بانگەشەی ئەوەی کە قورئان ئەم بەسەرهاتەی لە ئینجیلەوە وەرگرتووە. بەڵگەی بەرچاوی لە قورئاندا دەبوو خەڵکیش بێ وەستان پشتگیریان لەم قسەیە مەکەن.

بەڵام ئەوەی کە ئێمە دەیبینین ئەوەیە کە قورئان هیچ کام لەمانەی نەکردووە، نەبەشێك لە ڕووداوەکەی وەرگرتووەو نە ڕووداوەکەی بە کاملی گواستۆتەوە. بەڵام قورئان دیمەنەکەی بەبێ دەستکاری کردن وێنەگرتووە.

وەبەشێوەیەکی پاك و پوخت خستۆتە روو، نەك هەر ئەمە بگرە زۆر دیمەنی تر کە ئینجیل لە بارەیەوە نەدواوە. ئەم وێنەی گرتووە، لە لایەکی ترەوە چەندین هەڵەی تر کە دەرئەنجامی دەستکاری کردن و ساختەکاری ئینجیل دوچاری بۆتەوە راستکردۆتەوە، جا ئیتر ساختەکردنەکە بەخستنە سەر بێت یان بە لابردن. ئەم کارەش مەحاڵە بە کەسێکی ـ وەرگر ـ ئەنجام بدرێت کە خەریکی گواستنەوە بێت لە ئینجیل ئەگەر لە لایەکی ترەوە ئەمیش لە هەمان سەرچاوەی کە ئینجیل لێی وەرگرتووە ئەمیش وەری نەگرتبێت.

ئەم کارە بەجۆرێك دەکرێت کەئەمیش خۆی خاوەنی سەرچاوەی سەربەخۆی خۆی بێت، توانـاو دەسەلاتی، هەموو بەربەستەکان بشکێنێت، وە دیمەنی رووداوەکە لە شانۆی رووداوەکەوە بگوێزرێتەوە، بەبێ گەڕانەوە بۆ ئەم و ئەو .... ئەمەش کاکە ئازاد تەنها قورئانە ... قورئان .

دەنگی ـ ألله أکبر ـ ألله أکبر ـ ی مزگەوتەکەی تەنیشتمان، بەئاگای هێناینەوە کەکات درەنگە، بۆیە کاك ئازاد خێرا هەستایەوە سەرپێ و وتی : بەڕاستی چاك دواکەوتم گیانم بەوە بوو مۆبایلەکەم کوژاندبۆوە ئەگینا لەوانە نەبوو ئاوا بکەوینە قسەو باسی خۆمان .

مۆبایلەکەی داگیرساندو وتی: با ماڵی مامم ئاگادار بکەم کە ئێستا دەگەمە لایەن، ئیتر داوای ماڵئاوایی کرد، بەلاّم بەو مەرجەی بەم زووانە یەکتر ببینینەوە . منیش پەیمانم پێدا لەنزیکترین بواردا پەیوەندی پێوە بکەم .

لەگەڵیدا چومە دەر بەلاّم نەیهێشت لەدەرگای حەوشە زیاتر لەگەڵیدا بچمە دەر، دوبارە ماڵئاوایمان لە یەکترکرد .

٣ ڕۆژ دوای ئەم دابڕانە کاك ئازاد تەلەفونی کردو وتی:

مامۆستا حەزدەکەم یەکتر ببینین، ئەگەر بوارت هەیە پێم خۆشە لە ماڵی خۆمان بێت، چونکە وابزانم ئەم جارە زیاتر دەچینە ناو باسەکەوە، پێویستمان بە کات و شوێنی گونجاوترە تا ئەوەندەی بتوانیت پێکەوە بەرخورد بکەین.

وتم: زۆرباشە، منیش پێم خۆشە، بەڵام لەماڵی خۆمان باشتر نیە.

وتی: حەزدەکەم ئەم جارە تۆ میوان بیت، ماڵی ئێمەش ئارامە، تەنها باوکم و دایکم لە ماڵن لە قاتی سەرەوە ژوورێکی گەورەی خۆم هەیە، کەیادگاری خۆمە، دەستکاری نەکراوە حەزدەکەم لەوێ سبەینێ نیوەڕۆ بەیەکەوە دەست بکەین بەقسەو باس، پێت چۆنە ..؟

وتم: باسەیری ڕۆژمێرەکە بکەم (. کەسەیرم کرد، دەمتوانی لەدوای نیوەڕۆوە تا بانگی ئێوارە کاتم هەبوو) وتم: هەرچەندە تا نیوەڕۆ لەسەر کارم و ماندووم، بەڵام . إن شاءالله . دەتوانم ئامادەبم بەڵام پێویستە ئەو خاڵەی لەسەری دەدوێن تەوەرەکە دیاری کراو بێت، تا سوودی زیاتر لە کاتەکە وەرگرین، قسەی لاوەکی بەم لاولادا نەمانبات، خۆ ئەگەر دیاریت کردبێت و نوسیبێتت ئەوا باشترە .

وتی: بەدڵنیاییەوە، ئامادەم کردووە، تەوەرەکەش بەلای منەوە ئەوەیە، جەنابت قسەی خۆتت کرد، لەسەر سەرچاوەی قورئان کە ئایا لە تەورات و ئینجیلەوە وەرگیراوە یان نا، من رای خۆم سەبارەت بە قسەکانت ناخەمە ڕوو ئاخۆ تا چەند بڕوام بە قسەکانت هەیە یان نا، بە ڵکو تەوەرەی سەرەکی لەلای من ئەمەیە کە ئەم جارە قسەی لەسەر بکەین .

کەلاّم وایە قسە و باسی ئەم تەوەرەیە، چارەنوسی قسەکانی پێشوو دیاری دەکات، بۆیە لام وایە ئەم دانیشتنە ( بە پێکەنینەوە ) چارەنوس سازە .

منیش بە پێکەنینەوە وتم : دەی بابزانین ئەم تەوەرەیە چییە کەوا هێندە لەلات چارەنوس سازە، چونکە لەلای توێژەرەودو کەسی پسپۆڕیش وایە، کە تۆ سەلماندت سەرچاوەی ئەم پەیامە لە خواوەیەو جێ دەستی مرۆڤی تیانییە . ئەوا کار بەئەنجام گەیشتووە، ئەوەی کەددەمێنێتەوە دەگەڕێتەوە بۆ تێگەیشتنی مرۆڤەکان، کەدیارە ئاستی تێگەیشتن و چۆنیەتی خوێندنەوەی دەق و شارەزابوون لەکات و شوێنی دەق وزانینی باری کۆمەلاّیەتی وئابوری وسیاسی و دەرونی و .... هتد .

کات و شوێنی دەسپێکی هاتنە خوارەوەی دەق، هۆکارێکی زۆر باشە بۆ تێگەیشتن، ئەگەر جەنابت ئەو ئامادە باشیەتان هەیە، زۆر باشە .

وتی: مامۆستا تۆ دەتەوێت ئاوا بە تەلەفۆن بکەوینە ناو باس و خواسەوە، بەلاّم من ئەوەندەت پێ دەلێم کە لەسەربونی ـ تناقضات ـ لە قورئاندا قسە دەکەین، کە لەلای من ئەمە خۆی ئاماژەیەکی بەهێزە بەدەستمەوە کە قەناعەتی تۆ لەسەر قسەکانی پێشوت بخەمە لەرزە .

وتم: زۆر باشە ئێستا تێگەیشتم چ دۆسییەکت کردۆتەوە، إن شاءالله سبەینێ قسەی لەسەر دەکەین .

بەپێی ئەو ناونیشانەی پێیدام ، دۆزینەوەی ئاسان بوو . بۆیە لە مزگەوتی نزیك ماڵیان نوێژم کردو وردە وردە بەرەو ناونیشانەکە نزیك بومەوە ، تاوام لێهات بە پرسیارێك دەرگاو ماڵەکەیان دیاری بکەم، بەلاّم حەزم نەکرد، بۆیە پەنام بردەوە بەر مۆبایلەکەو تەلەفۆنم بۆ کرد. وەلاّمی دامەوە وتی:

وا هاتمە بەر دەرگا ... کە هاتە دەرەوە، ئافرەتێکی ٥٠ بۆ ٥٥ ساڵە - دیارە دایکی بوو - لەگە ڵیدا بە گەرمی بەخێرهاتنی کردم، دواتر کە چووینە ژوورەوە پیاوێکی ٦٠ بۆ ٦٥ساڵەش کە گۆچانێکی بەدەستەوە بوو دیاربوو کە تەندروستی باش نەبێت، داوای لێبووردنی کرد کە ناتوانێت هەڵبستێت، بەگەرمی بەخێرهاتنی کردم ... پشوویەکی کورتمان لە هۆڵکەدا داو دایکی زۆر گلەیی ئەوەی کرد، کەبۆچی بۆ نیوەڕۆ لەماڵیان نەبووم، پێم ڕاگەیاند بەهۆی کارەوە نەمتوانیوە، ئیتر ئەوانم بەجێهێشت و لەگەڵ کاك ئازاد بەرەو ژوورەکەی لە قاتی سەرەوە بەڕێکەوتین .

ژوورەکەی پێوەی دیاربوو کە سەردەمانێکە بێ ناز جێماوە، دارو دیواری ژوورەکە وێنەی جۆرا و جۆری لەسەر بوو، لەسەر مێزەکە میوەی زۆرو ئاوو شەربەتی دانابوو .... وتم : ئەمە چیە بۆ وات کردوە ؟ وتی: بۆ ئەوەی لەقسەکردن دانەبڕێین و هەموو شتەکان حازربن .

دانیشتم و بەخێرهاتنێکی گەرمی کردم، وتم با دەست پێبکەین، وتی پەلەمەکە، چوو لەسەر مێزەکە فایلێکی گەورەی هێنا، کە پڕبوو لە کاغەزی دەستنوس و کۆپی کتێب و بابەتی ئینتەرنێت و شتی جۆراو جۆر، بەرامبەر بە من لەسەر تەپڵەکەکەی نێوانمان داینا ....

وتی: پێشتر بە تەلەفۆن پێم ڕاگەیاندیت، کەلەم تەوەرەیەدا قسە لەسەر - تناقضات - ی قورئان دەکەین . کەمن لای خۆم لام وایە نەك هەر بەقسە بەڵکە ئەو - فایلە - ی بەردەستم پڕە لە نمونەی جۆراو جۆر کە یەك یەك قسەیان لەسەر دەکەین . ئەوە دەسەلمێنن کە قورئان جارێك قسەیەك دەکات و جارێکی تر پێچەوانەی قسەکانی خۆی قسەیەکی تر دەکات .

ئەمە لە لایەك لە لایەکی ترەوە قورئان زۆر هەڵەی مێژوویی وجوگرافی و ناوی کەسایەتی ... هتد تێدایە . کە خۆشت دەزانی تەنها ساغ بونەوەی یەك هەڵە لەم هەلاّنە خۆی لە خۆیدا بە ناڕاست دەرچونی قورئانە .

وتم: ئەی ئەگەر پێت وایە بە ڕاست دەرچونی یەك هەڵە لەو هەلاّنە ئیتر ـ ڕاستی قورئان ـ دەخاتە ژێر پرسیارەوە ... جەنابت پێویستت بەو هەموو خۆماندوو کردنە نەبوو کە لێرەو لەوێ شت کۆبکەیتەوە، من لام وایە پێش ئەوەی یەکە بە یەکەی نمونەکانت بخەینە بەرباس و توێژینەوە، ئەوا بەگشتی تۆ خۆشت بڕوات بە نمونەکانی خۆت نییە یان باشتر بڵێم کە ئەوانەی کە ئەم نمونانە دروست دەکەن خۆشیان دەزانن کە نمونەکانیان لە ڕووی چۆنیەتیەوە نەك هەر لاوازن بەڵکو ڕووی مەجلیسیان نییە .

بۆیە پەنادەبەنە بەر چەندێتی تا دوبارە تای تەرازووی لاریان هەڵبستێننەوە .

وتی: مامۆستا .... تۆ دەتەوێت هەرلە سەرەتای قسەکانمەوە، هێڵێکی ڕاست و چەپ بهێنیت بەسەر ئەم نمونانەدا. ئایا ئەمە خۆی لە خۆیدا خۆدزینەوەی جەنابتان نییە لە مەسەلەکەو ڕاستی قسەکانی من دەرناخەن ؟

وتم: بەڕێزم قسەکەت کاتێك ڕاست دەردەچوو، کە من ئامادە نەبم قسە لەسەر نمونەکانت بکەم و یەکسەر هەڵبستم و بڕۆم، شینی من ئەمە نییە، شینی من ئەو مەنهەجەیە سەقەتەیە کە جەنابت

پشتت پێبەستووە، ئەی من بۆچی هاتووم گەر وەلاّمی یەکە بە یەکەی گومانەکانت نەدەمەوە، بەلاّم من ئەوەندە بە جەنابت دەڵێم تۆ ئەگەر شەیدای ڕاستی بیت دەبێت بە میکانیزمی ڕاست و دروست بەدوایدا بگەڕێیت، خۆت

نەدەیتە دەست قسەو بۆچونی کەسانێك کە هۆکارێکی نادیار لە پشت چەواشەکارییەکانیەوەیە .

وتی: ئەم شتانەی کە من باسیان دەکەم و بەنمونە دەیخەمە بەر دەستی جەنابتان شتێك نین کە خۆم دروستم کردبێت، بەڵکو پێشتر باسکراوە، بەڵام کەس نەیتوانیوە وەڵامیان بداتەوە، هەر ئاوا بێ وەڵامن .

وتم: بێ وەڵام نین وەڵامیان دراوەتەوە، بەڵام ئەوە بزانە ئەو سەرچاوەی لای تۆ حەزی بە بیستنی وەڵامەکان نییە ...! حەز دەکات وەڵام نەدرێنەوە، تایبەتە بنێشتە خۆشەی سەرزاری، بائەمە لەولاوە بوەستێت لەلایەکی ترەوە، پێویستە تۆزێ بیر لە چۆنیەتی دروستکردنی ئەو- تناقضات- انە بکەینەوە . کە بەلای منەوە وردبونەوەیەکی پێویستە .

**یەکەم/** پێویستە هەموو دەقێك لە میانەی شوێنی سەرەکی خۆیدا شیبکرێتەوە نەك دابڕێت و لە دەرەوەی شوێنی خۆی واتایەکی تری بەبەردا بکرێت .

وتی: مەبەستت چییە ؟

وتم : من ئێستا دەقێکت بۆ دەخوێنمەوە، قەڵەمەکەت بەدەستەوە بگرە، ئەو وشەیەی کە پێم وتیت لەلای خۆت بینوسە، دوایی قسەی لەسەر دەکەین .

وتی : فەرموو... .

وتم: ( مامۆستاکە چاوی لێ بوو، باخەوانەکە لە باخچەی قوتابخانەکەدا خەریکی پاکردنەوەی گوڵەکانە، چوو بەدەمیەوە تا یارمەتی بدات، مەقەستەکەی لێ وەرگرت و کەوتە هاوکاریکردنی

لــە میانــەی چــاکردنی گوڵەکانــدا ئاگــاداری ئــەوە نــەبوو کــە پەنجــەی باخەوانەکەی بە مەقەست بڕیوە ) ئێستا وشەی ـ بڕیوە ـ دەربهێنــەو لای خـۆت بینوسە، باشە تۆ دەتوانیت پێم بڵێت، ئایا مامۆستا دەستبڕن ؟

وتی : نەخێر ناتوانم وا بڵێم ... !

وتم : ئەی ئەوە نییە، دەستی باخەوانەکەی بڕیوە ..؟!

وتی: دەستبڕین بە مانای ـ هەڵفڕیودان و لە خشتەبردن، جیاوازە لە دەست برینداركردنی كەسێك بە نەزانی و بەمەبەستی هاوكاری وكۆمەك كردنی .

وتم: تــەواوە منــیش ئــەوەم دەوێــت کــە تێبگــەیت، وشــەیەك لــە دەقێکـدا دەرنەهێت و واتایەکی تری بەبەردا بکرێت، چـونکە هـەر وشـەیەك لـە شـوێنی شیاوی خۆیدا واتای دیاریکراوی خـۆی دەدات. ئەگـەر پـچڕاندت و دەرتهێنـا، واتاکەت شێواندووە .

با نموونەیەکی ترت بۆ باس بکەم، شیعرەکانی ـ نالی ـ پڕە لە وەسف و پیا هەڵدانی ـ حبیبە ـ پێت وایە ئەو چاوەی ـ حبیبە ـ کـە نـالی وەسـفی دەکـات و پیایا هەڵدەدات .

گەر وای دابنێین ـ دەریبهێنین ـ و لە حوجرەکەیدا بەتەنها بیخەیتە بـەردەم نالی، هەڵوێستی چۆن دەبێت ...؟!

وتی: بێگومان دەترسێت و ڕادەکات .

وتم: بۆ؟ ئێ خۆ هەر ئەو چاوەیە کە وەسـفی دەکـرد. بـەڵام ـ عیللەتەکـە ـ ئەوەیە کە ئەو چاوە بە دابڕان لە سەراپای لاشەو شوێنی خۆی قیمەتی خۆی لـە دەست دەدات، هەموو وشەیەك لە شوێنی تایبەت بە خۆیدا مامەڵە بکەین.

**دووەم/** هـەر دەقێـك كـە جـەنابت یـان هـەر كەسـێكی تـر بـە بەڵگـە دەیهێنیتەوە دەبێت بەبێ هیچ زیادو كەم كردنێـك بیخەیتـە ڕوو، خۆشـت بـاش دەزانیـت كـە قورئـان بـە زمـانی ـ عرەبـی ـ دابـەزیوە، ئـەم زمانـەش خـاوەن پێكهاتەی خۆیەتی، كەم و زیادكردنی دەبێتە كەم و زیادكردنی واتەكـەی، نـەك بە پیتێك بگرە ـ حركة ـ یەكی ( فتحة، كسرة، ضمة )ەش بێت .

**سـێیەم/** هەرچـی بەڵگەیـەك كـە جـەنابت دەیخەیتـە ڕوو دەبێـت لـە سەرچاوەیەكی باوەڕپێكراوەوە بێت قسەی ئەم و ئەو، یـان ئـەو كەسـانەی كـە خۆیـان دژی ئیـسلام و قورئـانن، لـە ڕووی عـەقڵی و ئـاینی و یاسایـشەوە بـە شایەدی وەرناگیرێت، بۆیە ناكرێت هەر داخ لە دڵێك قسەیەكی وت یان نوسـی ..... تۆ پشتی پێ ببەستیت و بیكەیتە ماڵ بەسـەر ئیـسلام و موسـوڵمانانەوە، زۆر شتی تریش كـە نامـەوێت لێـرەدا بیكەمـە ڕێگـر لـە بـەردەم جـەنابت، تـا قسەكانت نەكەیت، بەڵام إن شاء الله لە میانەی قسەو نمونەكانتدا ئەوانی تـریش دەخەینە ڕوو.

وتی: وانەزانی من ئەم شتانە خۆم دروستم كردوون، بەڵكو چـەندین كـەس و لایەن و كەسی شارەزا هەستییان پێكردووە .... !! ئـەركی مـن خـستنە ڕووی نمونەكانە بۆ بەردەم جەنابتان .

بەزەردەخەنەیەكەوە وتم:

بێگومـان هەركەسێك تۆزێ شارەزای هەبێت دەزانێت كە ئەم ـ بانگەشـە ـ گەورە پێویستی بە زمانزانی هەیە وەك یەكەمین كلیل بۆ تێگەیشتن لە قورئان توانای تێكەیشتنی جەنابت و زۆری وەكو بەڕێزت زۆر لەوە ـ متواضع ـ ترە كـە بتوانێت خۆتـان ئـەم ـ تناقضات ـ انـەتان لـەلا گەلاڵـە بێـت هـەروەك خۆتـان

بانگەشەی دەکەن، دیارە کە ئەمە دەستی سەرووی ئێوەیە بەڵام لەمیانەی وەڵام دانەوەکاندا بۆت ڕووندەبێتەوە کە ئەوانە ئێوەیان بە هەڵەدا بردووە، ئەوان پاڵنەرێکی دەمارگیریی و خۆپەسەندی و خۆکەڕکردن لە ئاست ڕاستیەکان بۆتە هۆکاری ئەوەی ئەو بانگەشە نارەوایە بکەن و لە لایەکی تر بە کەسانی خوارخۆیانی بفرۆشنەوە، گوایە خزمەت بەزانست و توێژینەوەی زانست دەکەن.

وتی : مامۆستا دیارە ئێمە هەر بە دەوری مەبەستدا دێین و دەچین، ناچینە ناو باسەکەوە کەخاڵی جەوهەری هەردووکمانە لەم شوێنەدا .

وتم : منیش پێم باشە بەڵام وەکو جارەکانی تریش ئاماژەم پێدا ڕوونکردنەوەشم لەم بوارەدا بە پێویست زانی .. بفەرموون جەنابتان چۆنتان پێ باشە ئاوا قسەکانی خۆتان بکەن، حەز دەکەم یەکە یەکە قسەی خۆت بکەیت و دوایی بواری وەڵام دانەوەم بۆ بەجێبهێڵیت .

دەستی بردە سەر فایلەکە و کاغەزێکی دەرهێنا، وتی:

سەیرکە قورئان کاتێك کە باس لە دروستبوونی مرۆڤ دەکات چۆن کەوتۆتە هەڵەی گەورەو بەرچاوەوە بۆ نمونە لە﴿ أَلَمْ نَخْلُقكُّمْ مِنْ مَاءٍ مَهِينٍ﴾(المرسلات:٢٠) وا باس دەکات کە ئادەمیزاد لە ( ماء مهين ) دروست کراوە لە ﴿... وَجَعَلْنَا مِنْ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلا يُؤْمِنُونَ ﴾( الأنبياء:٣٠) بەس لە ئاوو لە ﴿ أَوَلَمْ يَرَ الإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِنْ نُطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُبِينٌ ﴾(يس:٧٧) و تەنها ـ نوطفە ـ یە لە﴿الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ وَبَدَأَ خَلْقَ الإِنسَانِ مِنْ طِينٍ ﴾(السجدة:٧)دا لە ـ الطين ـ و لە ﴿ خَلَقَ الإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ﴾(العلق:٢) و لە ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا الإِنْسَانَ مِنْ صَلْصَالٍ مِنْ حَمَإٍ مَسْنُونٍ ﴾( الحجر:٢٦) دا لە–حمأ مسنون ـ .... هتد، ئیتر وەرە بزانە ئائەمە چی بەسەر چیەوەیە ؟!!

کەلێ بوەوە پاڵی دایەوە ، بەجۆرێك لە خۆڕازی بونەوە ، کاتەکەی بۆ من گێڕایەوە ،کەتیایا وەلاّم بدەمەوە .

وتم: لە ڕاستیدا گەر جەنابت ورد بابەتەکەت بخوێندایەتەوە یان باش لێی تێگەیشتبایت ، ئەوسا بۆت دەردەکەوت کە بچوکترین هەڵەو ناتەواوی تیانییە، ئەوا جەنابیشت شتەکان تێکەڵ دەکەیت یان لێت تێکەڵ کراوە کە نەتوانیت سەرەداوی ڕاستەقینەت دەست بکەوێت .... !

وتی: ئەوە جەنابت دەڵێی چی ؟ خۆمن قسەی بێ بەڵگەم نەکردووە هەرچی هەیە ئەوە قورئانەکەو

سەیری بکە بزانە وایە یان نا ؟

وتم:

من باس لەوە ناکەم جەنابت ژمارەی ئایەتەکەت نوسیووە یان نا ؟ وە ئایا ئەو ووشەیەی کە کەجەنابت دەرت بڕیووە ئەوەیە یان نە ؟ بەڵکو باس لەو مەنهەجیتە هەڵەیە دەکەم کە تۆی پێگەیشتووەتە ئەم هەڵەیە گەورەیەو پێت نەزانیووە.

بەڕێزم ...... ئەم مەنهەجیەتە ئەوەت لێدەخوازێت کە ئایەتەکان هەموو بەیەکەوە وەربگریت و پاشان پۆلێنیان بکەیت بۆ دوو پۆلێنی جیا لە یەکتر.

**یەکەمیان:** ئەو ئایەتانەی کە باس لە دروستکردنی یەکەمین ئادەمیزاد دەکەن کە ئەویش- آدم- پیغەمبەر "علیه السلام" .

**دووهەمیان:** ئەوئایەتانەن کە باس لەدروستکردنی نەوەکانی- آدم- دەکات واتە دروستبوونی هەرتاکێکی ئاسایی. کە لە دوای دروستبونی- حواء - ەوە هاتونەتە بوون.

کاکە گیان قوناغەکانی دروستبوونی ئادەم بەم جورەبوو لە گلەوە- التراب-ە بوو بە . حمأ مسنون ـ قورێکی ڕەش چونکە بە تێکەڵبوونی لەگەڵ ئاودا گوڕا، کاتێك کە ئەم قوڕە وشك بووەوە بە بێ ئەوەی بەر ئاگر بکەوێت بوو بە . صلصال . کە واتای قوڕی وشك بۆوەی دوور لە ئاگر، دوای ئەم قوناغە جیاوازانە خوای گەورە -روح- ی کردووە بەر ئەم لاشەیە ئەوجا بویە ئادەمیزاد.

واتە لەم قوناغەدا دەبێت ئاوا بەریزبەندی ووشەکان ڕیز بکەین:

-تراب- طین- حمأمسنون- صلصالا".

بەلاّم بەشی دووەم قسەکردنە لەسەر هەمووتاکێکی ئاسایی کەبەندەو جەنابت وهەر تاکێکی تری کۆمەڵگا دەگرێتەوە وەبەوەی کە نەوەکانی-أدم- هەریەکەیان لە ـ نوطفة . یەك دروست بوون کە ئاوە کە گوزارشت دان لە ئاوی پیاو برتییە لە -المنی- و-علق-کە خوێنێکی بەستووە پاشان -المضغة- گۆشت پارە کە هێشتا نەمەیووە پاشان . العظام . ودواتر- اللحم- دروست بوونی گۆشت دواتر ـ الخلق الآخر- ئەمانەش بێ گومان هەموونەمانەش بەویستی پەروەردگار .

جا هەر ئەم قوناغە جاری وا هەیە ئایەتێك باس لەیەك قوناغی دەکات بۆنمونە ئایەتێك دەفەرموێت: کەمەبەست لە ـ امشاج- واتە تێکەڵ مەبەست تێکەڵبوونی ئاوی پیاوئافرەتە یان لە شوێنێکی تردا دەفەرموێت:﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعاً بَصِيراً ﴾الإنسان:٢ .

ئەوە مەبەست پێی وەسفی ئاوەکەیە کە ئاوێکی بەفیچقەیە یان لەشوێنێکی تردا بە-ماء دافق- ﴿خُلِقَ مِن مَّاء دَافِقٍ ﴾الطارق: ٦ هاتووە لەبەر کەمی و لاوازی .

جابەڕێزەکەم لات سەیر نەبێت چەندین زانای گەورەلەم بوارەدا بەهۆی ئـەم وردە کاریانەوە کە قورئان خستویەتەڕوو موسوڵمان بوون.

کەچی لای جـەنابت جێگـای سەرسـوڕمـان ولـێ تێکـچونە بۆیـە واباشـترە وردتر لەگەڵ ئەم باسانەدا بەرخورد بکەیت.

کاغەزەکەی دەستی بەهەڵەوگێڕاوەیی لە سەر مێزەکە دانا وەك بڵێیت ئیتر تەواو بۆیە خێـرا دەسـتی کـردەوە بـە فایلەکەداوکاغـەزێکی تـری دەرهێنـا کـە بەجیاوازی لەگەڵ ئەوەی پێشوو ئەم گەورەتر دیاربوو سەرێکی هەڵبڕی و وتی:

سەیرکە لە قورئاندا واهاتووە ﴿أَفَلاَ يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْـرِ اللّـهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ اخْتِلاَفاً كَثِيراً﴾النساء:٨٢ پاشان وتی تۆ دەڵێی چی؟

وتم: بەوپەڕی قەناعەت وبـاوەڕەوەم کـە ئەگـەر ئـەم قورئانـە لـەلای خـواوە نەبووایە ئەوا هەرگیز بێ کەم وکوڕی و بـێ جیـاوازی دەر نەدەچـوو وەك ئـەوەی کەئێستا قورئان بێ کـەم وکوڕیـە کەئەمـە خـۆی شـایەدی ئەوەیـە کـە قورئـان لەلایەن خواوە نێرراوە.

وتی:

دەی ئاخر من چەندین نمونەت بۆ دەهێنمەوە کەوانیە ..!!

وتم: بفەرموون کالآی خۆتان بخەنەڕوو.

وتی: سەیرکە ئێستا من ٣ ئایەتت بۆدەخوێنمەوە کەبەرامبەر هەریەکەیان ئایەتێکی تر هەیەکە پێچەوانەیەتی.!

وتم دەی بـــابزانین ئـــەم تێگەیـــشتنە تازەچـــیە کەبەســـەر ئێمـــەدا تێپـەڕیووەو١٤٠٠سـاڵ زیـاترە کـەس نـەیزانیووە, ئێـستا بـەرێزتان هەسـتان پێکردووە .

وتی :

ئایەتێك لە قورئاندا دەڵێت: ﴿ لاَ تَبْدِيلَ لِكَلِمَاتِ اللّهِ ﴾وە لە ئایـەتێکی تـردا دەڵێت:{وَإِذَا بَدَّلْنَا آيَةً مَّكَانَ آيَةٍ } هەروەها لە ئایەتێکی تردا دەڵێت: ﴿لاَّ مُبَـدِّلِ لِكَلِمَاتِهِ ﴾کەچی لەشوێنێکی تردا دەڵێت: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ آيَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَا أَوْ مِثْلِهَا﴾ .

وتم : پێش ئەوەی وەڵامت بدەمەوە، ئەم کارەی کە جەنابت پێی هەڵساوی کە دیارە کەسانی پێشتر ئەم قسەیان دارشتووە ئـەوا بابزانیـت سـەراپا مۆنتـاج کردن و قرتاندن و خستنە سەریەك و بەیەکەوە گرێدانی چەندین ڕستەیە .

وتی: بە یارمەتیت، من قسەی خـۆمم نـەهێناوە تـەنها ئایەتـەکانم لەگـەڵ یەکتر بەراورد کردون .

وتم: چـاك دەزانم کارەکـە چـۆنە ئـاخر لای شکـست و هەردسـهێنانی ئـەو واتایەی بەڕێزتان لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە هەر ئایەتەی کە بـۆ مـەبەسـت و تایبەتمەنـدی خـۆی هـاتووە لـە سـیاقی خـۆی دەرت هێنـاوە و هـاتووی بـە خستنەبری و لە شوێنیدا دانان لەواتای سەرەکی و ئامانجداری خـۆی کـە بـۆی هاتووە جارێکی تر دەتەوێت واتایەکی بەو شێوەی کە خۆت خوازیـاری دەسـتت بکەوێت لێ ی دەربهێنیت، بۆیـە لـە ڕووی زانـستیەوە دەبێـت ڕسـتەو وشـە لـە میانەی شوێنی ئاسایی خۆیدا مامەڵەی لەگەڵدا بکرێـت نـەك بگوێزرێتـەوەو لەگـەڵ ڕسـتەیەکی تـردا لەیـەك بـدرێن و پاشـان واتایـەکی تـازە تریـان لێ دەربهێنرێت .

هەر بەم قسانە لێت ڕازی نابم و یەکە بە یەکەی ئایەتەکانت بۆ باس دەکەم تا بزانیت کەیەك تۆز دژایەتی و هەڵە لە قورئاندا نییە . ئەوە هەوڵە هەڵەکانت کە دەرەنجامی هەڵە بە دەستەوە دەدەن .

ئێستا بابێینە سەر باسی ئایەتەکان، یەکەم جار لات وایە کە ئایەتی﴿لاَ تَبْدِيلَ لِكَلِمَاتِ اللّهِ﴾سورەتی ـ یونس ـ دایە لەگەڵ ﴿وَإِذَا بَدَّلْنَا آيَةً مَّكَانَ آيَةٍ ﴾کە لە سورەتی . النحل . دایە . دژ بەیەکن .. ؟! دەبوایە بزانیت کە ـ دژایەتی ـ حوکمێکی عەقڵی مرۆڤە . کە بەو مانایە دێت کە دوو شت هەرگیزاو هەرگیز لە یەك شوێندا کۆنەبنەوە . وەك مردن و ژیان کە هەرگیز ناکرێت شتێك لە یەك کاتدا مردوش بێت و زیندوش بێت .

هەرگیز مرۆڤ لە حاڵەتێکدا نابێت کە نە مردو بێت و نەژیاو . ئەم جۆرە دژایەتی بوونە هەرگیزا و هەرگیز لە قورئاندا بوونی نیە . بۆیە هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ئەو جۆرە لە دژایەتی لە میانەی ئایەتەکانی قورئاندا ڕەنجی ( بێ وەرە ) ! چونکە ئەو ئایەتەی سورەتی ـ یونس ـ ﴿لاَ تَبْدِيلَ لِكَلِمَاتِ اللّهِ﴾ مەبەست پێی نەگۆڕانی قەزاو تقدیری خوایە بۆ دروستکراوەکانی، کە ئەم مانەیە مەبەست پێی سەرجەم یاساو سیستەمە گەردوونیەکان کە سەراپای ژیان و بونەوەر دەگرێتەوە . وەك یاسا کیمیایی و فیزیایی و هێزی کێشکردن وکارلێك و ئاوێتەبوونی مادە جۆراو جۆرەکان لەگەڵ یەکتر ئەمانە﴿ كَلِمَاتِ اللّهِ﴾کە هەرگیز ناگۆڕێن بەو شێوەی بۆیان دیاری کراوە بەردەوامن . هەرگیز{تبدیل} نابن ئەوئایەتەی لە بەرامبەر ئەم ئایەتەدا خوێندتەوە﴿وَإِذَا بَدَّلْنَا آيَةً مَّكَانَ آيَةٍ ﴾مەبەست پێی ئایەتی قورئانەکەیە ئەگەر ئێمە ئایەتێك لە قورئان لابەرین یان حوکمەکەی هەڵگرین و ئایەتێکی تر دابنێین، ئەوا بێ باوەڕو

نەزانەکان دەڵێن تۆ ڕاست ناکەیت، هەریەکە لەم دوو ئایەتە بۆ دوو مەبەستی دوور لە یەك و جیاواز لە یەکتری هاتوون ئیتر بە چ هەقێك تۆ دەیانخەیتە پاڵ یەکتر .

هەروەها تۆ چۆن ئایەتی دووەم{ آيَةٍ } بەمانای{ كَلِمَاتِ} بەراورد دەکەیت ؟! کە جیاوازی ئەم دوو وشەیە روون و بەرچاوە .

ئەگەر قسە لەسەر ئایەتی دووەم بکەین ئەوا دەڵێین:﴿لاَ مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ﴾لەگەڵ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ آيَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَا أَوْ مِثْلِهَا﴾ بە هیچ جۆرێك ناکرێت ئەم دوانە لەیەك بدرێت تا مانایەکی تری بەزۆری لێ دەربهێنرێت چونکە ئایەتی{لاَ مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ }کە لە سورەتی ـ الكهف ـ دایە باسکردنە لەوەی کە وا گۆڕانکاری بەسەر سیستەمی مەخلوقاتدا نایەت، ئەمەش کە دەیڵێم ڕای زانایانە خۆ ئەگەر بتەوێت مەبەست لە{لاَ مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ }قورئان بێت ئەوا ئەمەش هەر تەواوە کە گۆڕان بەسەر قورئاندا نایەت خوای گەورە چۆن ناردویەتی هەر ئاوا بە پارێزراوی دەمێنێتەوە، بەڵام ئایەتی بەرامبەر ئەم کە ئایەتی﴿مَا نَنسَخْ مِنْ آيَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَا أَوْ مِثْلِهَا﴾کە لە سورەتی . البقرة ـ دایە مەبەست پێی ئەو معجیزانەن کە خوای گەورە لە سەر دەستی پێغەمبەران نیشان خەڵکی دەدات، کاتێك کەلادەبرێت ئەوا معجزەیەکی تر دێتە شوێنیان.

دواهەمینیان ئەو ئایەتەی سورەتی ـ الحجر . ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ ﴾لەگەڵ ئەو ئایەتەی سورەتی ـ الرعد . ﴿يَمْحُو اللَّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ وَعِندَهُ أُمُّ الْكِتَابِ ﴾ ئایەتی یەکەم مەبەست لێی ئەوەیە کە قورئان لەلایەن خوای گەورەوە پارێزراوە دوورە لەهەموو کەم و زیادکردنێك و ونبوون و فەوتانێك کە دوچاری ببێتەوە . بەم جۆرە قورئان بەمانای وشە دوورە لەو دەستکاری وکەم و

زیادکردنەی کە کتێبە ئاسمانیەکانی تری وەك و ـ تەورات ـ وـ ئینجیل ـ ڕوبەڕوی بونەوە بە سەلامەتی دەرنەچوون .

بەڵام ئایەتی دووەمیان﴿يَمْحُو اللَّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ﴾ئەوا هەواڵی ئەوە دەدات کە تەنها خوای گەورە کاروباری گەردون هەڵدەسوڕێنێت و کەسی تر ناتوانێت دەست لەم کارە وەربدات، ویستی خوا چۆن بێت هەروا دەڕوات هەر خۆی زیندو دەهێنێت و مردوان دەبات، شیفاو چارەسەرو دەردو نەخۆشی، مردن و ژیان، هەژاری و دەوڵەمەندی ... هتد .

لەلای ئەمەوە کەس ناتوانێت بەرگری لێ بکات، هەر خۆی خاوەنی گەردونە کەس ناتوانێت لە بێ دەسەڵاتی زیاتر شتێکی تر دەربڕێت ! ئیتر کاکە ئازاد من نازانم ئەم مانا جیاوازانە چۆن بە زۆر دروست دەکرێن ..؟!

وتی: تێگەیشتم بەڵام ئەی چی دەڵێیت بەوەی لەسورەتی ـ المزمل . وادەڵێت:﴿رَبُّ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَاتَّخِذْهُ وَكِيلًا﴾دیارە کە مەبەست ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایە . بەڵام . الرحمن . دەڵێت:﴿رَبُّ الْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ الْمَغْرِبَيْنِ﴾ئەمەیان دوانە، لەمەش سەیرتر ئەوەیە کە لە . المعارج . دا دەڵێت:﴿فَلَا أُقْسِمُ بِرَبِّ الْمَشَارِقِ وَالْمَغَارِبِ إِنَّا لَقَادِرُونَ﴾ ئیتر چۆن سەر لەم باسە دەردەکەیت ....؟!

وتم :

ئەگەر یەك تۆز ورتر بۆ مەسەلەکەت بڕوانیایە و خۆت هیلاك بکردایە لە ڕوی زانستیەوە شۆڕبیوبیتایەتەوە ئەم قسەیەت نەدەگوت، ئەوە بزانە قورئان پەیامێکە بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی بەهەموو ئاستە جیاوازەکانی تێگەیشتنەوە دابەزیوە، واتە قورئان پەیامە بۆ پرۆفیسۆرو دکتۆرو نەخوێندەواروخوێندەواری

مامناوەندو ... هتد . دەبێت هەریەکە لەمانە هێندەی توانای خۆی لە قورئان بەهرەمەندبێت.

ئەودەمەی قورئان دەفەرموێت:﴿رَبُّ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ فَاتَّخِذْهُ وَكِيلاً﴾المزمل: ٩ . ئەوا ئەم گوتارە ئاراستەی سەرجەم مرۆڤایەتیە بە هەموو رەهەندە جیاوازەکانی تێگەیشتنەوە . لێرەدا ئەو گوتارەی کە ئاراستەی کەسێکی سادە دەکرێت زۆر ئاساییە کەسی سەرو ئەم لەم گوتارە تێبگات بەلاّم پێچەوانەکەی راست نییە . بۆیە لێرەدا زانیاریەکە سادەیە کە باس لەیەك رۆژهەلاّت و یەك رۆژئاوا بوون دەکات کەهەموو لایەك دەیزانن، بەلاّم لە ـ الرحمن:١٧﴿رَبُّ الْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ الْمَغْرِبَيْنِ﴾گوتارەکە ئاراستەی سەروتر کراوە بۆ ئەو کەسانەیە کە زیاتر لەوانی پێشوو ئاوڕ بەم مەسەلەیە دەدەنەوە ئەوانە دەزانن کە ڕوژئاوا بوون لەلای ئەم ڕۆژهەلاّتنە لەلایەکی تر هەروەك ڕۆژهەلاّتی لای ئەم ڕۆژئاوابونی گەلانی دوای خۆیەتی وە یان هەر ئەمان ئەوەش دەزانن کە خالّی ڕۆژهەلاّت و ڕۆژ ئاوابوون لەیەك خالّی جوگرافیای دیاری کراودا لەیەك جیاوازە بەوەی کە هاوین ڕۆژ لە خالّێکەوە هەلّدێت و لەخالّێکی دیاریکراودا ئاوا دەبێت کە ئەمە لەوەرزی زستاندا دەگۆڕێت لە زستاندا خالّی ڕۆژهەلاّت و ڕۆژئاوابوون هەمان ئەوەی هاوین نییە .

وە لە ئایەتیالمعارج:٤٠ دا دەلّێت:{فَلَا أُقْسِمُ بِرَبِّ الْمَشَارِقِ وَالْمَغَارِبِ إِنَّا لَقَادِرُونَ }گوتارەکە ڕوو لەو کەسانە دەکات کە خاوەن پسپۆڕی و شارەزای گەردوون زانین و بارودۆخی زەوی باش دەزانن ، ئەوان دزانن کە بەردەوام ڕۆژ بۆ خەلّکی لە ڕۆژهەلاّتن و ڕۆژئاوابون دایە ، ئەمەش بەهۆی سوڕانەوەی زەوی بەدەوری خۆیدایە ، کەواتە بەهۆی خولانەوە بەردەوام ڕۆژ لە ڕۆژهەلاّتن و ڕۆژ

ئاوابووندایە . ئیتر تۆ چۆن لات وایە ئەم سێ ئایەتە پێچەوانەی یەکترن لە کاتێکدا هەریەکەیان لە ئاست خۆیەوە جوانترین گوزارشت دەردەبڕێت .

کاغەزەکەی دەستی دانەنا ئەم جارەشیان سەیرێکی کردەوەو وتی:

سەیرکە ئێوە زۆر بە شانازیەوە دەڵێن کە خوا ـ تاك و تەنیایەو هاوبەشی نییە ـ زۆر جار کە قسەتان لەگەڵ دەکرێت یەکسەر دەڵێن{قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ. اللَّهُ الصَّمَدُ}وا دەزانن کارەکە بەمە تەواو دەبێت . بەلاّم ئەگەر ورد قورئان بخوێنیتەوە ئەوا لە چەندین جێگادا ئاماژە بەوە دەدات کە ـ چەندین خوا یان چەندین هاوبەش ـ لەگەڵ خوادان . ئەمەش قسەی من نییە قسەی قورئانە ئەوەتا لە (ق: ٤٣)دا{إِنَّا نَحْنُ نُحْيِي وَنُمِيتُ وَإِلَيْنَا الْمَصِيرُ}هەروەها(الذاريات:٤٧) دەڵێت: {وَالسَّمَاء بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ }وە لە سورەتی(الحج:٥)دا دەڵێت:{يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّنَ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ....} ئەمانە هەمووی ئاماژەن بۆراستی قسەکانم .

ئەم کاغەزەشی خستە سەر کاغەزەکەی پێشوو، پاڵێکی دایەوە ـ وەك بڵێی تەواو ئیتر دواهەمین قسە لەم باسەدا لای ئەو بێت ـ منیش جارێکی تر کەوتمەوە قسەو وتم :

ئەگەر پێت بڵێم تۆ بەم قسەیەت کە کردت، ئەوا ئەو راستیەت سەلماند کە قورئان لەلای خوای گەورەوەیە! ئەوا دڵنیابە زۆر بە ڕاستمە، بەلاّم جەنابت لە بواری ـ قواعد اللغة العربية ـ شارەزایی زیاترت پێویست بوو تابزانی چۆنیەتی دەرچونی بڕیاری سەرو بۆ خوارو بە چ جۆرە راناوێك دەردەچێت هەرگیز دوچار بەم هەڵەیە نەدەبویت، نەك هەر زمانی عەرەبی بەڵکو زمانی کوردی خۆشمان پشتگیری لە قسەکانی جەنابت ناکات، جەنابت وا لەم ئایەتانە گەیشتویت کە

خوای گەورە لەگەڵ بەندەکانی وتوویژ دەکات بەناوی خۆی و هاوبەشەکانیەوەو لە خوایەتیدا قسەیان لەگەڵدا دەکات.....!!

باشە تۆ کە دەیبیستیت پاشای ئەردەن دەڵێت: ـ ئێمە ـ پادشای ئەردەنی هاشمی، وا گومان دەبەیت کە مەملەکەتی هاشمی کۆمپانیایەکی فرە هاوبەش بێت و چەندین پادشای تێدا بێت یان ئەوەتا خۆت باشتر لە من دەزانی کە پادشای ـ ئوردن ـ یەك پاشایە . بەلاّم بەکار هێنانی ناوی ـ کۆ ـ بۆ گەورەکردنە . هەر لە زمانی کوردی خۆماندا کاتێك لەگەڵ یەکێکدا قسە دەکەیت دەزانین کە بڵێن جەنابتان، بەڕێزتان، ئێوە، ... هتد .

کە بۆ کۆ بەکاریدەهێنین یان بۆ گەورەکردنی بەرامبەر بەکاریدەهێنین هەرچەندە بەرامبەرمان تاکە کەسێکیش بێت . ئیتر بۆ دەبێت لە کاتی خوێندنەوەی قورئان ئەم ڕاستیە بشارینەوەو کلاّو بنێنە سەر خەڵکانێك کەشارەزای ئەم وردەکاریانە نەبێت .

دیارە کاك ئازاد دەیزانی قسەکان ڕاستن و ئەو تێگەیشتنەی ئەوان ڕاست نییە بۆیە هەوڵی ئەوەی دا کە خۆی ڕزگار بکات بەوەی قسەکە بە ئاڕاستەیەکی تردا ببات، وتی:

مامۆستا جەنابت وتت ئەم جۆرە گوزارشتانە بۆ گەورە کردنە ئەوەی ئێمە بزانین خۆگەورە کردن ئە خلاقێکی نادروستەو مرۆڤ بە گشتی لێی بێزارە ؟

وتم: جوانە، دەتەوێت گومانەکەی پێشوت وەلابنێیت و شتێکی تر بخەیتە روو ، دەبێت جەنابت بزانیت ئەوەی کە ئاینەکان و باقی مرۆڤەکان لەسەری کۆکن ئەوەیە کە نابێت شتێك گەورە بکرێت .

واتە کەسێك بەسەر کەسێکی تردا نابێت خۆی بە گەورەتر بزانێت، چونکە بەهیچ جۆرێك هێندەی گەردیلەیەك مافی خۆگەورەکردن بەسەر بەرامبەرەکەیدا نیە ، ئاینیش بۆ یەکسان دانانی مرۆڤەکان هاتووە تاکەس خۆی نەکاتە گەورەو کوێخـای کەسـێکی تـرو توشـی (طغیـان) نـەبێت، بـەلاّم گـەورەیی تـەواوو خاوەن(الأسماء الحسنی) کە یەکێکیان (المتکبر)ە هەرشایەنی خودی پـەروەردگار خۆیەتی

ناتوانرێت لەوەوە داڕنرێت بکرێتە بالآی مرۆڤێك کە خۆی بەندەی خودایە، ئەمە خالّی جەوهەری نێوان(الکبریاء)کە شایەنی پـەروەردگارە وە (الإستکبار)کـە سیفەتی مرۆڤە سەرەڕۆو سنور بەزێنەکانە دەبێت لە بەین ببرێت . کەواتـە قـسە کردنی پەروەردگار بەشێوەی راناوی کۆ- بـۆ لای خـۆی- شـایەنی پـەروەردگارە کە گەورەیی و توانا و دەسەلآتی رەهای دەردەخات .

وتی:

لە سورەتی(المجادلة:٢٢)دا قورئان دەڵێت:{لَا تَجِدُ قَوْماً يُؤْمِنُونَ بِاللّٰهِ وَالْيَوْمِ الْـآخِرِ يُـوَادُّونَ مَـنْ حَـادَّ اللّٰـهَ وَرَسُـولَهُ وَلَـوْ كَـانُوا آبَـاءهُمْ أَوْ أَبْنَـاءهُمْ أَوْ إِخْـوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ....}دەبینین زۆر بەتوندی دژایەتی ئەوە دەکات کە کەسـانێکت خـۆش بوێت کە دژایەتی خواو پێغەمبەر دەکەن . هەر چەندە دایك و باوکیش بن بەلاّم لە ئایەتێکی تردا داوا دەکات هەر دەبێت گوێڕایەڵیان بکرێت، ئیتر چۆن ئـەم دوو ئایەتە دژ بەیەك نین ؟!

وتم:

دەبێـت تـۆ بـە وردی ئـەوەت بـەدی بکردایـە کـە ئایـەتی یەکـەم باسـی - خۆشنەویـستنی - کەسـانی بـێ بـاوەڕ دەکـات کـە مەسـەلەکە لـە دڵ و هـەناو

ویژداندایە، کەچی دووەمیان باس لە مامەڵە کردنە کە پەیوەستە بەکاری ڕۆژانەو دەربڕینی ڕێزو حورمەت بۆ ـ باوك و دایك ـ هەرچەندە باوك ودایکەکە بێ باوەڕیش بن .

کەواتە جیاوازی زۆرە لە نێوان ـ خۆشنەویستن ـ کە لەدڵدایە پەیوەستە بە ویژدانەوە لەگەڵ مامەڵە کردنی نەرم و شیاو کە ڕوخساری دەرەوەیە و پەیوەست نییە بە ناخی کەسەکانەوە چەندین (اعتبار)ی تر دەوری تیایا دەگێڕن، نابێت بێ باوەڕی دایك و باوك بکرێتە پاکانەی مامەڵەی نەشیاو، ئیسلام ئەمەی قبوڵ نیە، یان مامەڵەی دایك و باوك لەسەر بناغەی هەڵسەنگاندنی بیرو باوەڕیان بێت !

بەڵکو بەهۆی ـ دایك وباوك ـ بونیانەوە خاوەنی تایبەتمەندیەکی خۆیانن و نابێت خۆمان واتەنی لە گوڵ کاڵتریان پێ بوترێت .

ئەم جارەشیان لە کاغەزەکەی بەردەمی ورد بوەوەو بەڵام بە تیلەی چاو بە خێرایی یەکسەر وتی:

لە (الأنفال: ٣٣)دا دەڵێت:{وَمَا كَانَ اللّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ وَمَا كَانَ اللّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ } واتە خوا بە هۆی بونی تۆ لە نێوانیاندا مەبەستیشی محمدە، ئەوا ئازاریان نادات، کەچی هەر بەدوای ئەم ئایەتەدا دەڵێت:{وَمَا لَهُمْ أَلاَّ يُعَذِّبَهُمُ اللّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَمَا كَانُواْ أَوْلِيَاءهُ إِنْ أَوْلِيَآؤُهُ إِلاَّ الْمُتَّقُونَ وَلَـكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ }(الأنفال: ٣٤) ئیتر ئەم دوو ئایەتە چۆن پێچەوانەی یەکتر نین...!؟

وتم :

مــن پێــشتریش وتم و ناچــارم دوبــارەی بکەمــەوە، کــە جــەنابت بــۆ خــۆ ڕزگــارکردن ئەگــەر مەبەســتت خــۆ ڕزگــارکردن بێــت، (بــە پێکەنینــەوە) ئــەوا پێویستە ورد بخوێنیتەوە بەهــەمان شــێوە وردبکەویتــە بــەراوردکاری . ئــەم دوو ئایەتە کە بەدوای یەکدا دێت زۆر بەئاسانی پێمان دەڵێن کە پێــچەوانەی یــەکتر نین هەریەکەیان ئامانجێکی دیاری کراوی خۆی هەیــە، تــۆ ئەگــەر بەشــێوەیەکی سادەش ئایەتی یەکەم بخوێنیتەوە ئەوا تێدەگەیت کە بــە کــردەوە ـ بــە فیعلــی ـ خوای گەورە بەهۆی بوونی پێغەمبــەر (د.خ) لــەناو هۆزەکەیــدا ئــەوا بەکۆمــەڵ سزایان نادات، واتە بوونی خودی پێغەمبەر(د.خ) لەناو هۆزەکەیدا هۆکارە بــۆ ئەوەی بێتە بەربەستی سزادانی بە کۆمەڵ .

بەڵام ئایەتی دووەم قسەکردنە لەسەر ئەوەی کە ئەوان موستەحەقی عەزابی خواین، بەهۆی ئەوەی مەرجەکانی نازڵ بونی عەزابیان تیایا دەرکەوتووە بەوەی ڕێگری لە مزگەوت دەکەن و نابنە دۆستی، هەرچەندە ئەم موستەحەق بونــەیان بەهۆی بوونی پێغەمبەر(د.خ) لــە ناویاندایــە نابێتــە کــە بــە ـ فعلــی ـ عــەزاب بــدرێن، هــەروەها هەنــدێ لــە ڕاڤــەکارانی قورئــان لایــان وایــە ئایــەتی یەکــەم مەبەست پێی دنیایە

واتە لە دنیادا سزا نادرێن بــەڵام دووەمیــان مەبەســت پێــی ڕۆژی دواییــە، واتە لە ڕۆژی دواییدا سزا دەدرێن، جا کاك ئازاد ئەمە ڕاڤەی یەکــەم بێــت یــان دووەم ئەمانــە ڕاڤــەی قورئــانن و لەگــەڵ مانــاو مەبەســتی قورئــان یەکدێنــەوە. ئەوەی جەنابت لێی دەدوێیت تەنها لەلای ئەو کەسانە دژیەکە کە ڕاڤەی قورئان ناخوێننەوە.

وەرەقەکەی دەستی دانایەوەو وتی:

مامۆستا لە تۆ وایە من ئەم میوەیەم بۆ جوانی داناوە، حەز دەکەم تۆزێك میوە بخۆین، ئەوسا بەردەوام دەبین، وتم:

لام ئاساییە. حەز دەکەم سوود لە کاتەکە وەربگرین، زۆرترین پرسیاری تیایە بخەیتە روو سەبارەت بە میوەکە وردە وردە لەگەڵ قسەکردندا دەخورێت، خەمت لای میوەکە نەبێت. بزانە چی پرسیاری ترت لایە ...؟

وتی: من حەزم کرد پشوویەك بدەیت، ئەگەر نا ئەوەتا(دەستی برد بۆ دۆسیەکەو وەرەقەیەکی تری دەرهێنا). وتم:

لات سەیر نەبێت کە من بە وەڵام دانەوەی جەنابت جۆرێك ئارامی و شادی دڵم دادەگرێت کە هەست دەکەم ئەم چێژەم لە بێدەنگی و دانیشتندا دەست ناکەوێت .

وتی:

باشە ئەگەر سەیری (الأعراف:٥١) بکەیت دەڵێت:{ فَالْيَوْمَ نَنسَاهُمْ كَمَا نَسُواْ لِقَاء يَوْمِهِمْ هَـٰذَا }وە لە (التوبة:٦٧)یشدا دەڵێت:{نَسُواْ اللّهَ فَنَسِيَهُمْ}هەر خۆت سەیر بکە بزانە چۆن بە ئاشکرا ئەم دوو ئایەتە لەگەڵ (مريم:٦٤){ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيّاً } وە (طه:٥٢){ لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى} دژ دەوەستنەوە، دوو مانای دژبەیەك بەدەستەوە دەدەن ...!

وتم: تۆ کە رەخنە لە دەقێك ـ جا هەر دەقێك بێت ـ بگریت ئەوا زۆر لە خاڵی لاوازیەوە قسە دەکەیت ئەگەر رێزمان و چۆنیەتی دروستکردنی رستەو لێکدان و دەربڕینی چۆنیەتی رستەو وشە لە دوو زماندا نەزانیت، یان لانی کەم هەر ئاوا سەرپێیی وێنەیەکی خێرا بگرێت. بە تایبەت بەڕێزت کە تۆ قسە

لەسەر کتێبێك دەکەیت کە نزیکەی ملیارو نیوێك خەڵك بڕوای پێیەتی و بە پیرۆزی دادەنێت. زیاد لە ١٤٠٠ ساڵە هاتۆتە خوار. بەڕێزت دەبوایە ئەوەت بزانیایە کە هەر زمانی کوردی خۆشماندا چەندین وشەمان لە دیوانی شاعیرە - کلاسیکی - یەکاندا هەیە کە رەوان بێژیان لە لوتکەدایە هەستاون بە بەکارهێنانی ئەم جۆرە وشانە کە بە - مشاکلە - ناسراون.

ئەمەش واتای ئەوەیە کە دوو مانای جیا لەیەك، لە یەك وشەدا کۆدەبنەوە، عەرەب وتەنی: (الإتفاق في المبنى والإختلاف في المعنى) ئەگەر سەیری دیوانی مەحوی بکەیت ئەم شیعرە بخوێنیتەوە:

لە سەیری خەستەخانەی عیشقی ئەو سەوزەی کەوا شینە
لەسەر هەر خەستەیەك دێت خوێندنی یاسینە یاشینە
شەهیدی غەمزەیە بەعضیٚ، سەقیمی عیشوەیە جەمعیٚ
دیارە سەر نویشتی ئەهلی دڵ یاشینە یا سینە
لە رۆژی هەڵدڕا ئەو کۆنە خەیمەی تان و پۆشینە
لە سایەیدا شەرابی بەزمی عوشرەت گریە جۆشینە
دەبینی جێیەك ئەمڕۆ بەزمی عەیش و بادە نۆشینە
سبەینیٚ زوو زەمانە وەضعی گۆڕیوە، لە نۆشینە
لە کیٚ پرسم دڵی بۆ پڕ لە خوێنی حەسرەتە یاقووت
عەزا پۆشی چییە و کێیە؟ جلی پیرۆزە بۆ شینە

دوایی سەیری وشەکانی (یاسین، یاشین) بکە بزانە هەریەکە لەم وشانە کـە یەك وشەن چۆن بە ئاڵوگۆڕی جیاجیا بۆ ئەوەی پێکهاتـەی نوسـینیان بگـۆڕێ واتایان گۆڕداوە. ئەمە تایبەتمەندی و لایەنی ڕەوانبێژی زمانە.

ئێستا ئەگـەر بێینـە سـەر وەڵامدانـەوەی جـەنابت ئـەوا دەبـێ بڵـێم کـە ـ لەبیرکردن ـ کە لە ئایـەتی یەکـەم و دووەم ئامـاژەت پێـدا مـەبەسـتی ئایەتەکـە ئەوەیە کە خوای گەورە ئەوان پشتگوێ دەخات و ئاوڕیان لێ ناداتەوە بـەڵام ئـەو دوو ئایەتەی کە دواتر ئاماژەت پێدان مەبەسـتی ئایەتـەکان ئەوەیـە کـە خـوای گەورە هەرگیز وانیە شتی لە بیر بچێت و بێ ئاگا بێت لـە ئاسـت هـەر ڕووداوو گۆڕانکاریەك لە گەردوون و کردەوەی بەندەکانیدا واتە ئەو لەبیرچـوونەی بەسـەر من و تۆی بەندەدا دێت ئەوا هەرگیز بەسەر خوای گەورەدا نایەت چونکە خـوای گەورە (حفيظ عليم)ە

ـ نسیان ـ لە زۆر شوێنی قورئاندا بە مانـای ئـەوە هـاتووە کـە لـە بیرخـۆ دەبرێتەوە یان شتەکە بە گـرنگ وەرناگیرێـت ئەوسـا دوچـار بـە لـەبیر چـوونەوە دەبێت هەروەك لە سورەتی(طه: ١١٥)دا هاتووە دەفەرموێت: {وَلَقَدْ عَهِدْنَا إِلَى آدَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُ عَزْماً } واتـە پەیمانەکـەی لـەبیر کـرد، چـونکە بەهەندی وەرنەگرت. چونکە ئەگەر بەراستی بیری بچوایە ئەوا لۆمە نـەدەکرا. وە لە(الحشر: ١٩)دا دەفەرموێت: {وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ نَسُوا اللَّهَ فَأَنسَاهُمْ أَنفُسَهُمْ أُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ }واتە وەك ئەوان مەبن کە خوایان لە ژیانی خۆیانـدا لـەبیر کـردووە. وە لـە(طـه:١٢٦)دا دەفـەرموێت:{ قَالَ كَذَلِكَ أَتَتْكَ آيَاتُنَا فَنَسِيتَهَا وَكَذَلِكَ الْيَوْمَ تُنسَى}واتە ئایەتەکانی ئێمـەت پـشتگوێ خـستووەو بـە هەنـدت

وەرنەگرتووە. بۆیە ئەمڕۆ تۆش پشتگوێ دەخرێیت و چاودێری و میهرەبانی خوا ناتگرێتەوە.

وە رایەکی تریش هەیە کە ئەویش لای وایە {نسوا الله فنسيهم} مەبەست پێی ئەوەیە ئەوان لە ژیانی دونیادا خوایان لەبیر کرد بەوەی گوێڕایەڵی فەرمانەکانیان نەدەکرد، خوای گەورەش لە ڕۆژی دواییدا لە پاداشتی ئەم کردەوەیەیان پشتگوێی خستن و ڕووی ڕەحمەتی تێنەکردن.

وتی: باشە بۆچی لە{ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَى بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُبِينٍ (٢٣) إِلَى فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَقَارُونَ فَقَالُوا سَاحِرٌ كَذَّابٌ (٢٤) فَلَمَّا جَاءَهُمْ بِالْحَقِّ مِنْ عِنْدِنَا قَالُوا اقْتُلُوا أَبْنَاءَ الَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ وَاسْتَحْيُوا نِسَاءَهُمْ وَمَا كَيْدُ الْكَافِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَالٍ }(غافر:٢٣ ،٢٥) و لە{ وَقَالَ الْمَلَأُ مِنْ قَوْمِ فِرْعَوْنَ أَتَذَرُ مُوسَى وَقَوْمَهُ لِيُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَيَذَرَكَ وَآلِهَتَكَ قَالَ سَنُقَتِّلُ أَبْنَاءَهُمْ وَنَسْتَحْيِي نِسَاءَهُمْ وَإِنَّا فَوْقَهُمْ قَاهِرُونَ }(الأعراف: ١٢٧) دا باس لەوە دەکات کە فیرعەون ئەوەی بەبیردا هات ڕەگەزی نێرینەی بەنی ئیسرائیلیەکان بکوژێت و ئافرەتەکانیشیان بهێڵێتەوە.

ئەمەش لەدوای ئەوەوە هات کە موسا سەریهەڵدا و داوای لێ کرد باوەڕی پێ بهێنێت. کەچی هەر ئەم باسە لە { إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي الْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعاً يَسْتَضْعِفُ طَائِفَةً مِنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَاءَهُمْ وَيَسْتَحْيِي نِسَاءَهُمْ إِنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ }(القصص:٤) و {أَنْ اقْذِفِيهِ فِي التَّابُوتِ فَاقْذِفِيهِ فِي الْيَمِّ فَلْيُلْقِهِ الْيَمُّ بِالسَّاحِلِ يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِي وَعَدُوٌّ لَهُ وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِنِّي وَلِتُصْنَعَ عَلَى عَيْنِي }(طه:٣٩) و { وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ أَنجَاكُمْ مِنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ وَيُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ وَفِي ذَلِكُمْ بَلَاءٌ مِنْ رَبِّكُمْ عَظِيمٌ }(إبراهيم:٦) و { وَإِذْ أَنجَيْنَاكُمْ مِنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ

سُوءَ الْعَذَابِ يُقَتِّلُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ وَفِي ذَلِكُمْ بَلاءٌ مِنْ رَبِّكُمْ عَظِيمٌ }(الأعراف:١٤١) و {} وَإِذْ نَجَّيْنَاكُمْ مِنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ يُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ وَفِي ذَلِكُمْ بَلاءٌ مِنْ رَبِّكُمْ عَظِيمٌ }(البقرة:٤٩)دا باس لەوە دەكات ئەم هەڵمەتی قەتڵ و عامی نێرینەیە لە پێش هاتنی موسادا بووە....؟ بڕوا بەمە بكەم.....یان بەوەی پێشویان ؟

زەردەخەنەیەكم كردو وتم:

ئەگەر بە قسەی من دەكەیت.... بڕوا بەهەردوكیان بكە. ئەمەش لەخۆمەوە ناڵێم ئێستا بۆت باس دەكەم چاوەكەم.

فیرعەون لە پێش هاتنە دنیای (حەزرەتی موسا) فەرمانی ئەوەی دابوو كە لە ترسی ئەوەی لەناو بەنی ئیسرائیلدا كەسی وا لەدایك نەبێت خەوەكەشی بەدی نەهات و زیندە بەچاڵ بوو، ئیتر لەگەڵ ئەوەی كە حەزرەتی موسا(علیە السلام) بووە سەرچاوەی مەترسی بۆ فیرعەون دوای ئەوەی ساحیرەكان باوەڕیان پێهێنا بانگەوازی حەزرەتی موسا بەهێز بوو رادەی جەماوەرو شوێنكەوتەی بەرز بۆوە، جارێكی تر فیرعەون ئەو كەڵكەڵەیە دایەوە لەكەڵلەی و كە دوبارە رەگەزی نێرینە قڕ بكات و ئافرەتەكانیش وەك كارەكەر و كەنیزەك بهێڵێتەوە.

ئەوە بوو بەختی رەشی نەیهێناو خۆی تیاچوو.

كەواتە كوشتنی یەكەمجار بۆ ئەوە بوو كە كەسێك لەناویاندا لە دایك نەبێت كە مەترسی بۆ سەر كۆشك و دەستەلاتی ئەو ببێت، بەڵام دوایی كەلەدایك بوو وە گەورە بوو زانی تازە كوشتن بێ سوودە تازە لە دایك بووە وازی لە كوشتن هێنا بەڵام جاری دووەم كە زانی رادەی جەماوەرو شوێنكەوتوی زۆر بووە هەوڵیدا پەنا بەرێتەوە سەر كوشتن بۆ دانانی سنورێك بۆ

شوێنکەوتوانی موسا بەلاّم ئەوە بوو خۆی و داروودەستەکەی دوچاری چەندین بەلاّو نەهامەتی هاتنەوەو پێش وەدی هاتنی ئەم خەوەیان خۆیان سەریان نایەوەو لەناو چوون.

وتی:

باشە. تۆ ئەم ئایەتەت خوێندۆتەوە کە لە (مریم:٧١)دایە دەڵێت:{ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْماً مَّقْضِيّاً }ئەم گوتارە گشتیە واتە بە مسوڵمان و ئەوەی ئێوە پێی دەڵێن ـ کافر ـ دەگرێتەوە کەوا هەردوکیان دەچنە جەهەنمەوە. ئەمەش لە خۆمەوە ناڵێم ئەوەتا لە (مریم:٧٢)دا دەڵێت:{ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيّاً }کە دەڵێت:{ وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا }واتە هەردوکیان هەر دەچنە ناو دۆزەخ بە مسوڵمان و کافرەوە . بەلاّم دوایی مسوڵمانەکە دەردەهێنرێت وکافرەکانیش دەمێننەوە ..... ئایا ئەمە ڕێك لەگەڵ ئەو ئایەتەی (الأنبياء:١٠١، ١٠٢) دژبەیەك ناوەستێتەوە کە دەڵێت: { إِنَّ الَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا الْحُسْنَى أُوْلَئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ . لَا يَسْمَعُونَ حَسِيسَهَا وَهُمْ فِي مَا اشْتَهَتْ أَنفُسُهُمْ خَالِدُونَ } کە ئەوە ڕەت دەکاتەوە باوەڕداران لە دۆزەخ نزیك ببنەوە بەڵکو لێی دووردەخرێتەوە.

ئیتر چۆن تۆ پێت وایە کە دژایەتیەك لەم ناوەدا نیە .؟!

هەرکە تەواو بوو پەرداخێك شەربەتی تێکردو فەرموی کردم، بەلاّم من وەلاّم دانەوەکەم لەلا گرنگتر بوون بۆیە وێڕای سوپاسکردنی وتم:

جەنابت قەت چویت بۆ بەندیخانە ؟

وتی: مەبەستت چیە؟

وتم: دەڵێم جەنابت قەت چویتە ناو بەندیخانە ؟

وتـی: لـە ڕاسـتیدا تـا - ئێـستا- یـەکجار چـوم . ئـەویش بـۆ سـەردانی خزمێکمان کە بەند کرابوو.

وتم: جوانە. کەواتە تۆ لە بەندیخانە بویت و خزمەکەشت هـەر لـە بەندیخانـە بـوو. بـەڵام هـەر خـۆت ببـە بـە دادوەر بزانـە چـەندە جیـاوازی لـە نێـوان تـۆو خزمەکەتدا هەبوو کە هەردوکیشتان پێکەوە لە یەك بەندیخانـەدا بـوون. تـۆ بـۆ سەردان، ئەو گیرا بوو. تۆ بە ئارەزووی خۆت چویت کەچی ئەو پەلکێش کرابـوو . تۆ بە دەستی دیاریەوە چویت ئـەو بەکەلەبـچەکراوی. تـۆ بـە شـەوقی بینینـی ئەوەوە ئەو بە خەم و پەستیەوە، .....هتد . هەمـوو ئەمانە پێمان دەڵێـت هـەموو چونێك بە مانایەکی کۆنکرێتی داڕێژراو نایەت.

وتی: وابزانم دەتەوێ خۆت لە قـسەکانم بدزیتـەوە، مـن باسـی دوو ئایـەت قورئانت بۆ دەکەم... کەچی تۆ باسی چی بۆ من دەکەیت ؟!

وتم: ورد بۆ مەسەلەکان نەچویت و هەر زوو تەسلیم بە قسەکانی بەرامبـەر بویت. دەنا دەتزانـی کـە ئـەم قـسانەی مـن بـۆت دەکـەم - نقطة نظام - ەو لـە کرۆکی بابەتەکە لام نەداوە ئەوە جەنابتیت حەزناکەیت بابەتێکی ئـاوا زانـستی ورد بکرێتەوە هەر بە ڕێگاوە بڕیاری کۆتایی خۆتی لەسەر دەدەیت.

بۆ ئەوەی خۆت وتەنی لە باسەکە دوور نەکەومـەوە دەبێ بڵێم:

ئەم چونە دۆزەخە بە مانای ئەوە نایەت کە ئەوانیش سزا دەدرێت بەڵکو بە مانای چاودێری کردن و بینینـی ئـەو پەیمانـە خوداییـە بـە چـاوی سـەر کـە بـە بەندەکانی خۆی داوە. لێرەدا بڕوادار یەك تۆز زەرەرمەندی نابینێت و دوچار بـە ئازار نایەت.

ئەگەر یەکەبەیەکەی ئایەتەکان ڕاڤە بکەین ئەوا دەبێت بڵێین: دوای ئەوەی خوای گەورە لە چەندین ئایەتدا باس لە چارەنوسی خراپەکاران و ملهوڕان دەکات و چۆنیەتی سزادانەکەیان دەخاتە ڕوو. ئەوا ئەو دەم باس لەوە دەکات کە بڕواداریش سەرەی ئەوەیان دێت بچن و ئەو دیمەنانە ببینین و کە پیایا تێدەپەڕن خوای گەورە لەوە دەیانپارێزێت کە بکەونە ناو دۆزەخەوە {ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيّاً }واتە ڕزگاریان دەکەین { وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا }بەلاّم بیّ باوەڕان لەسەر چۆك دەخرێنە ناوی.

یەکسەر وتی: ئەم مانایەت لە کویّ هێنا ؟

وتم: هەڵقولاّوی چەندین ئایەتی قورئانە کە دەفەرموێت: {فَأَرْسَلُواْ وَارِدَهُمْ فَأَدْلَى دَلْوَهُ }(یوسف:١٩) هەر لەم ئایەتەدا دیارە کە ـ ورود ـ بە مانای چونە ناو نیە، بەڵکو بەمانای نزیکبونەوە دێت. وە لە ئایەتێکی تردا کە باسی حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لێبێت) دەکات دەفەرموێت: {وَلَمَّا وَرَدَ مَاء مَدْيَنَ }واتە ئەو کاتەی لە ئاوەکە نزیك بۆوە. وە لە زمانی عەرەبیدا ـ الوارد ـ بەو کەسە دەڵێن کە لە ئاو نزیك دەبێتەوە تا ئاو بۆ خەڵکانی تر بهێنێت.

واتە ئەو کەسەیان نارد کە ئاوی بۆ دەهێنان بۆیە بە هەموو ئەوانەی لە ئاوەکە نزیك دەبنەوە دەوترێت ـ وارد ـ { وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا } واتە هەموو لێی نزیك دەبنەوە، بەلاّم ناچنە ناوی.

وەبەرچاوترین بەڵگەش ئەمەیە کە هەر نزیك دەبنەوەو ناچنە ناوی ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێت: { إِنَّ الَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا الْحُسْنَى أُوْلَئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ . لَا يَسْمَعُونَ حَسِيسَهَا.... }(الأنبياء:١٠١، ١٠٢)

وتی:

باشە تۆ دەڵێی چی ئەگەر من ئێستا ئەمجارەیان شتێکیترم نیشاندایت و بۆ باسکردنی کە خۆی بە زەقی ئەوە دەردەخات کە قورئان دژبەیەکە . چونکە لە شوێنێکدا باس لە دروستکردنی ئاسمان و زەوی دەکات لە ماوەی ٦ ڕۆژدا کەچی هەر هەمان باس لە شوێنێکی تردا دەڵێت بە ٨ ڕۆژ بووە.

ئێ خۆ ئەمجارەیان هەردوکیان ژمارەن ناشکرێت ژمارە جیا لە مانای خۆی خوێندنەوەی تایبەتی تر هەڵبگرێت. چونکە ژمارە خۆی لە خۆیدا بێ لایەنە.

ویستم ئەم قسەیەم بەسەردا تێنەپەڕێت و لە میانەی وەڵامدانەوەدا ونی نەکەم، وتم:

من هەرگیز گرفتم لەگەڵ دەقەکاندا نەبووە و نیە ئەوە خوێندنەوەکانی جەنابتن کە جێگای تێڕامان و گومانن، بۆیە من ئەوەندەی قسەکانی تۆ شیکار دەکەم، هەرگیز بەلای دەقەکاندا ناچم چونکە دەزانم کە ئەوان تەواو ڕێك و پڕ مانان. بەڵام خوێندنەوەکانی بەڕێزتان لارو ناهاوسەنگن ؟!!

وتی:

دەتۆ خۆت سەیری ئەم ئایەتانە بکە بزانە چۆن لێی تێدەگەیت. لە لایەکی ترەوە با ئەو شتەش کە ناوتان ناوە ـ إعجازی زانستی ـ لێی روون بێت کە قورئان لە شوێنێکدا دەڵێت ئاسمان پێش زەوی دروست کراوەو لە شوێنێکی ترا دەڵێت زەوی پێش ئاسمان . ئایەتەکانیش { قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَندَاداً ذَلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ (٩) وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِنْ فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاءً لِلسَّائِلِينَ (١٠) ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعاً فَقَالَ لَهَا وَلِلأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعاً أَوْ كَرْهاً قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ (١١) فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ

وَأَوْحَى فِي كُلِّ سَمَاءٍ أَمْرَهَا وَزَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَحِفْظاً ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ }(فصلت:١٢.٩) و

{أَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقاً أَمِ السَّمَاءُ بَنَاهَا (٢٧) رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّاهَا (٢٨) وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَاهَا (٢٩) وَالأَرْضَ بَعْدَ ذَلِكَ دَحَاهَا }(النازعات:٣٠.٢٧) و {مَا جَعَلَ اللَّهُ لِرَجُلٍ مِنْ قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِ وَمَا جَعَلَ أَزْوَاجَكُمْ اللائِي تُظَاهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَاتِكُمْ وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَاءَكُمْ أَبْنَاءَكُمْ ذَلِكُمْ قَوْلُكُمْ بِأَفْوَاهِكُمْ وَاللَّهُ يَقُولُ الْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِي السَّبِيلَ}(السجدة: ٤).

وتم:

با پێش هەموو شتێك ئەوەت بۆ روونبکەمەوە، کە هیچ جیاوازیەك نیە لە نێوان ئەوەی کە قورئان باس لەوە دەکات کە ماوەی دروستکردنی زەوی و ئاسمانەکان ٦ رۆژەو لەگەڵ ئەوەی زانستی ئەمڕۆ باس لەوە دەکات کە چەندین ملیۆن ساڵی پێ چووە. چونکە ماوەی پێوانەی ـ رۆژێك ـ لە لای خوای گەورە جیاوازترە لەو ماوە پێوانەییەی کە لای ئێمە بۆ رۆژ هەیە و خۆمان لەسەری راهاتوین.

ئەمەش بە بەڵگەی ئایەتی(٢٥٩)ی (البقرة): {أَوْ كَالَّذِي مَرَّ عَلَى قَرْيَةٍ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَى عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّى يُحْيِي هَذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا فَأَمَاتَهُ اللَّهُ مِئَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ قَالَ لَبِثْتُ يَوْماً أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِئَةَ عَامٍ فَانظُرْ إِلَى طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ وَانظُرْ إِلَى حِمَارِكَ وَلِنَجْعَلَكَ آيَةً لِّلنَّاسِ وَانظُرْ إِلَى العِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْماً فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ }کە لە ئایەتەکەدا هاتووە بەمانای(بەشێك لە رۆژێك)دێت، ئەگینا لای ئێمەی مرۆڤ ئەوا ١٠٠ساڵ بووە، کە دەکاتە ٣٧٠٠٠ هەزار رۆژ.

هەر بەهەمان شێوەش(أصحاب الكهف) کە لە خەو هەستان وایان زانی رۆژێك یان بەشێك لە رۆژێك خەویان لێ کەوتووە، کەچی بە سالنامەی هەتاوی ٣٠٠ سالّ و بە سالنامەی مانگی ٣٠٩ سالّ دەکات.

ئەمە لە لایەك لەلایەکی ترەوە ئایەتەکە بە روونی باس لەوە دەکات کە زەوی پێش ئاسمان دروست بووە، بەلاّم رێك بوون و توانای ژیان تیایا دواکەوت بۆ چەند رۆژێکی تر وەك وتمان ئەم رۆژانەش رۆژانی خوای گەورەن نەك ئەو رۆژانەی لای ئێمە کە لە دەرەنجامی گۆرانی دروستکراوەکانی خوا لەلامان دەکەینە پێوەری کات و وەرزەکان.

دوا سەرنجیش ئەوەیە کە هیچکات ئایەتی دووەم(فصلت: ٩- ١٢){ قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَندَاداً ذَلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ (٩) وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِنْ فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاءً لِلسَّائِلِينَ (١٠) ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعاً أَوْ كَرْهاً قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ (١١) فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَى فِي كُلِّ سَمَاءٍ أَمْرَهَا وَزَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَحِفْظاً ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ } بەو مانایە نایەت ئەوە خوێندنەوەی هەڵەی بەرێزتە کە لە میانەی کۆکردنەوەی رۆژەکان لە جیاتی ٦ رۆژ دەیکەیتە ٨ رۆژ ئەگینا هەموو ئایەتەکان باس لەوە دەکەن کە دروستکردنی زەوی و بارهێنان و رەخساندنی زەوی بۆ ژیان و - تقدیر - ی رزق و رۆزی تیایا بە ٦ رۆژ بە ئەنجام گەیشتووە.

وەك ئەوەی هەڵەیەکی گەورەم کردبێت یان بۆشیەکی گەورەم بەدەستەوە دابێت خێرا وتی:

بە یارمەتیت! ئادەی بزانم چۆن من لە کۆکردنەوەی ئایەتەکاندا هەڵە بووبم بڵێی نەتوانم تا ٨ کۆبکەمەوە ؟

وتم: کاکە گیان میکانیزمی کۆکردنەوەت هەڵەیە نەك لێ نەزانینی ژمارەکان ، ئەگینا ڕووە بیرکاریەکەی هێندە ئاسانە قوتابییەکی سەرەتایی دەیزانێت.

با ئێستا نمونەیەکت بۆ بهێنمەوە ئەوسا باش لێم تێدەگەیت . بۆ نمونە بەختیار دەڵێت: لە هەولێرەوە بە سەعاتێك گەیشتمە کۆیە، بەڵام بە ٣ سەعات گەیشتمە سلێمانی. ئێستا با لێت بپرسم، واتە بە چەند سەعات لە هەولێرەوە گەیشتە سلێمانی؟

یەکسەر وتی: بێگومان بە ٣ سەعات .

وتم: تەواوە بەڵام تۆ لە هەولێرەوە بۆ کۆیە بە سەعاتێك و لە کۆیەشەوە بۆ سلێمانی بە ٣ سەعات دەی کەواتە بە ٤ سەعات گەیشتووە ؟

وتی: ئاخر لە هەولێر بۆ کۆیە بە سەعاتێك و لە کۆیەشەوە بە ٢ سەعات گەیشتۆتە سلێمانی ئەوا کردیە ٣ سەعات .

وتم: باشە . ئەی بۆ ئەم کۆکردنەوەیەش بۆ ئایەتە قورئانیەکە ناکەیت ؟ بۆچی کە ئەم جۆرە باسانە لە قورئاندا دەخرێتە ڕوو خۆتی لێ هەڵە دەکەیت ؟ سەرەڕای ئەم خۆبواردنەت لە ڕاستی، زۆر بەخەم ساردیەوە دەڵێیت قورئان دژبەیەکە .

وتی: ئاخر ئەوەی قورئان باسی دەکات جیاوازترە لەو نمونە ئاسانەی کە باستکرد.

وتم: قەڵەمەکەت بەدەستەوە بگرە بنوسە بزانە هەر هەمان جۆر نیە بەڵام ئەوەیە جەنابت وا تێگەیشتوویت یان باشتر بڵێم وا تێگەیەنراویت.

خێرا قەڵەم و پارچەیەك کاغەزی بەدەستەوە گرت.

وتم: دیارە ئەم ئایەتانەی کە باسی دەکەیت لە سورەتی (فصلت)دایە کە دەفەرموێت:{خَلَقَ الأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ}واتە لە ٢ ڕۆژدا زەوی دروستکرا. بنوسە ٢ . پاشان {وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِن فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاء لِّلسَّائِلِينَ}واتە لە دوای دروستکردنی زەویەوە ٢ ڕۆژی تر بۆ رزق و ڕۆزی دیاری کرا، کەواتە ٢ یەکی تر بنووسە.

وە هەڵەی ئێوە لێرەدایە کە (خلق الرواسي وتقدير الأقوات) بەزۆر دەکەن بە ٤ ڕۆژی سەربەخۆ کە خۆی دوانە، دوای ئەمە {فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ}کەواتە ژمارە ٢ یەکی تر بنووسە.

ئێستا کردیە چەند ؟

وتی: دیارە کردیە ٦ ڕۆژ.

دوبارە بە ناچاریەکەوە پاڵێکی دایەوە هیچی نەوت، زانیم کە پەشیمانە لەوەی کە چۆن هەر ئاوا بە ئاسانی وەرگرتووە، لێی ورد نەبۆتەوە بۆ ئەوەی لانی کەم لەم شوێنەدا دوچار بەو دەرەنجامە نەخوازراوە نەبێت.

نەمویست ئەم هەڵەیەی بکەم بە خاڵی خۆبەهێزکردن و تەنگە پێهەڵچنینی ئەوو بگرە بەزەییم بەم و بەو جۆرە کەسانە دێتەوە کە بە قسەی کەسانی ترەوە دەبن. بۆیە وتم:

با بچینە سەر بابەتێکی تر. باسەکە تەواو بزانە چی تر هەیە با لەکاتەکەمان دەرفەت وەربگرین.

وتی:

لە سورەتی (النساء:٤٢)دا دەڵێت:{يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُواْ وَعَصَوُاْ الرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّى بِهِمُ الأَرْضُ وَلاَ يَكْتُمُونَ اللّهَ حَدِيثاً}لێرەدا باس لەوە دەکاتکە هیچ قسەو باسێك ناشارنەوە کە ئەمەش رێك لەگەڵ ئەو ئایەتەدا پێچەوانەیە کە لە سورەتی(الأنعام:٢٣)دایە دەڵێت:{ ثُمَّ لَمْ تَكُن فِتْنَتُهُمْ إِلاَّ أَن قَالُواْ وَاللّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ }کەچی ئەوەتا ـ مشرك ـ بوونی خۆیان دەشارنەوە .

وتم: چاوەکەم ئەگەر باش لەئایەتەکە تێ بگەیت دەزانیت کە ئایەتی یەکەم قسەیە لەسەر خۆزگەو ئاواتی دڵیان، کە هیواداربوون ئاشکرا نەبوایە. بەڵام لە رۆژی دواییدا چی بشارنەوە، چۆن بتوانن ـ مشرك ـ بوون بشارنەوە. لە کاتێکدا هەموو ئەندامەکانی لەشیان شایەتە بەسەریانەوە کە چیان کردووەو چیان وتووە.

وتی: باشە لە (الشورى:٤٠)دا دەڵێت:{وَجَزَاء سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا.....}
بەڵام لە (هود:٢٠)دا دەڵێت:{.... يُضَاعَفُ لَهُمُ الْعَذَابُ ....}

وتم: مەسەلەی تۆڵەسەندنەوەی بە هێندەی تاوان، تایبەتە بە دنیاو لە مەسەلەکانی سزادان و تۆڵەسەندنەوەدا باسیان دەکرێت . کە ئەم ئایەتەی یەکەم باس لەوە دەکات و تۆش وەك من دەزانی کە ئەمە پەیڕەوی دادگاکانە لە هەر کوێ بێت.

بەڵام چەن قات بوونی سزاکان لە رۆژی دواییدایە کە پەیوەستە بەو گوناهە گەورەیەی کە ئەنجامی داوە . پاشان سەیری شوێنەواری گوناهەکە دەکرێت ئاخۆ چەندە کاریگەری کۆمەڵایەتی ، ئابووری، دەروونی، .... هتد

هەیە لە دوای خۆی جیّ دەهیّلیّت، هەر بۆ نموونە تۆ لە دنیادا یەکجار ـ صدام حسین ـ لە سیّدارە بدەیت لە تۆڵەی ئەو سەدان هەزار کەسە بیّتاوانەی کە لەسەر دەستی ئەو کوژراون کە ئەمەش لەوپەڕی توندیشدا ناگاتە گیانی یەکیّك لەو سەدان هەزارەی کە ئەو کردونیەتە قوربانی خواستە نەشیاوەکانی، دەی باشە ئەیَ تۆڵەی ئەو سەدان هەزار کەسانەی تر چۆن وەربگرینەوە، ئەگەر سزادانەکانیان چەندین قات نەکریّن. بەم شیّوەیە گشت ملهوڕو ستەم کارو دیکتاتۆران دوچار بە سزای چەندین بارە دەبن.

کاغەزیّکی تری بە دەستەوە گرت و ئەوی تری دانایەوە سەیریّکی خیّرای کردو وتی:

قورئان لە چەندین جیّگادا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە قورئان{لِسَانٌ عَرَبِيُ مُبِين} (الشعراء:١٩٥) کەچی من ئیّستا دەتوانم چەندین وشەت پیّ بڵیّم کە عەرەبی نین لەو وشانە ( اباریق ، أرائك ، إستبرق ، تابوت ، جهنم ، خبز، حور ، زكاة ، الله ، .... )

وتم: دەبوایە ئەو زانیارییە سەرەتاییەت بزانیبایە کە هەرچی زمان هەیە لە دنیادا بەردەوام لە ئاڵوگۆڕدایە لەگەڵ زمانەکانی تر، هەموو زمانیّك دەشبەخشیّت و وەردەگریّت، هیچ کام ئەم بەخشین و وەرگرتنەش بەنەنگی و کەم و کوڕی نایەتە ژماردن و بە دۆخیّکی ئاسایی دیّتە ژماردن.

جا ئەگەر زمانیّکی زیندوو گەورەی وەك ئینگلیزی و فەرەنسی و بەو خزمەتە زۆرو باڵادەستی ئابووری و رۆشنبیری و سیاسیەی کە هەیانە لە چنگ ئەم کارەدا هیچیان پیّ نەکریّت ساڵانە وشەی جۆراو جۆر دیّتە ناو زمانەکانیانەوەو ئەوانیش لە هەوڵی بە خۆماڵی کردنی ئەم کارەدان.

وتی:

من باسی چی دەکەم تۆ باسی چی دەکەیت، وەلاّمی پرسیارەکەی من بدەرەوە؟

وتم:

بەردەوام ئەو گلەییەت لێ دەکەم کە تۆ لە وەرگرتنی راستیەکان تەنگەنەفەسی دیارە ئەمەش بەهۆی ئەوەوە بووە کە تۆ پێشتر دنیایەك زانیاری ناڕاستت لەچاوتروکانێکدا خراوەتە بەردەستت دەتەوێت بەهەمان نەفەس لەگەڵ راستیدا مامەڵە بکەیت. ئەمەش شتێکی دروست نیە چونکە من دەمەوێت قەناعەت بە قسەکەی من بهێنی بۆیە پێویستم بە پانتاییەکی فراوانتر هەیە .

کاکە ئازاد: ئەگەر سەیری زمانی کوردی خۆشمان بکەیت سەیر دەکەیت ئەم زمانە جیا لەوەی لە هەر پارچەیەکی کوردستان لە ژێر کاریگەری حکومەتە دەسەلاّتدارەکاندا بووە. ئەوا بەزۆرو بە خۆشی چەندین وشە کە نایەنە بژاردن هاتونەتە ناو زمانەکەمانەوە کە زۆر ئاساییە ئەمڕۆ ئەم وشانە بەشێك لە زمانەکەی خۆمان بزانین. بەلاّم با بزانیت مەرج نیە زمان هەر بکەوێتە ژێر کاریگەری زمانی لە خۆی بالاّترەوە، بەڵکو زۆر جار لە رێگای ئاڵوگۆڕەوە وشەو دەستەواژەی زمانەکانی تریش کە لە خوار ئەمەوەن و پانتاییەکی کەمیشیان هەیە دێنە ناوەوە، ئەو دەم خۆماڵی دەبن و ناکرێت خۆمانیان لێ بدزینەوە یان بەزۆر فڕێیان بدەینە دەرەوە.

ئێستا من ئەم رستەیەت بۆ دەخوێنمەوە بزانە هەست دەکەیت وشەی بیانی تیادا بێت(سەیران پاکەتێك پاقلاوەی بۆ خەباتی برای کڕی چونکە لە بازاڕ خشڵەکانی بۆ فرۆشت)

سەیرێکی کردم و وتی:

(پاقلاوە) وابزانم عەرەبیە، ئەوانی تر وشەی کوردین.

وتم: بابزانیت عەرەبیش ئەم وشەیەی لە تورکیەوە وەرگرتووە، پاشان جگە لە وشەی (بازاڕ، پاکەت) کە ئەوانیش هەر وەرگیراون ئەوا وشەکانی (خشڵ و خەبات) سریانین بەڵام زۆر ئاساییە ئەم رستەیە بە رستەیەکی کوردی بدەینە قەڵەم. جا کاك ئازاد تۆ ئێستا لە زیاتر لە ٦٦٠٠ ئایەتی قورئان چەند وشەیەکت بەدەستەوە گرتووە کە کەسانی لە تۆ شارەزاتر بەوپەڕی رەخنەگرانەشەوە چاویان گێڕاوە لە ٢٥ وشە زیاتریان نەدۆزیوەتەوە کە بڵێن عەرەبی نیە ئەمەش نەك هەر هیچ نیەو جێی باس نیە، بەڵکو زمانەوانە عەرەبییەکان ریشەی هەریەکە لەو وشانەیان گێڕاوەتەوە بۆ عەرەبی، باس لەوە دەکەن دەبوایە ئەوە بزانیت کە بوونی ـ رستە ـ ناوی ـ یان ـ کرداری ـ لەناو دەقدا کەلەزمانی بێگانەوە وەرگیرا بێت دەبێتە نەنگی کە ئەمەش ـ تحدی ـ ی بەرێزت و هەموو ئەوانە دەکەم کە شارەزاییان هەیە شتی وا لە قورئاندا بوونی نیە. پاشان دەبێت بزانیت کە (اسماء العلم) وەرناگێڕدرێتە سەر زمانەکەی تر، بەڵکو وەکو خۆی دەردەبڕدرێت کە هەیە، وە سەبارەت بەو وشانەی کە باست کردن زمانزانانی عەرەب پێیان وایە هەموویان عەرەبین بۆ نمونە (اباریق) لە (برق)ەوەیە، (ارائك)لە (ارك)ەوەیە، (تابوت)لە (تَبُتَ)ەوەیە، (جهنم)لە (جَهْمَ)ەوەیە، وە (خَبَرْ)لە (خبر)ەوەیە، وە(حور)لە (حَوْرَ)ەوەیە، وە(زکاة)لە (زکوَ)ەوەیە،....هتد، بەڵام بۆ وشەی(الله) کە پێیان وایە سریانیە هیچ بناغەیەکی نیە، چونکە نەك پێش ئیسلام بگرە بە هیچ جۆرێك لە کتێبی پەیمانی کۆن و نوێدا وشەی (الله) بەکارنەهاتووە، ئیتر سریانی چی ..!؟

زەنگی دەرگاکەیان لێیدا.. گوێم لێ بوو دایکی بانگی کاك ئازادی کرد، وەرە بزانە کێیە ؟ ئەویش روخسەتی لێ وەرگرتم تا بچێتە بەر دەرگا.منیش پێم باش بوو چونکە پێش ماوەیەکی کەم بانگی عەسری فەرموو، وتم نوێژەکەم دەکەم.

نوێژەکەم تەواو نەکرد کە دەنگی برادەرێکی تر کە لەگەڵ کاك ئازاد روەو ژوورەکەی لای ئێمە هات، خێرا دانیش، منیش کە لە نوێژ بوومەوە هەستامەوەو بەخێر هاتنم کرد، کاك ئازاد وتی:

مامۆستا، ئەمە سەربەستە هاوڕێمە، ئەو پێش من گەڕاوەتەوە. ئێستا لێرەیە .... ویستم باشتر بیناسم .. بەزەردەخەنەیەکەوە وتم:

لە خۆمانە یان لە خۆتان ؟

یەکسەر وتی:

لە خۆمانە.. کوڕی کۆنە.. ئەمیش حەزی بەوە هەیە لەو بارەیەوە قسە بکات کە پێم ڕاگەیاند حەزی کرد بەشدار بێت لەگەڵمان. بەڵام ئەم حەزی بە چەپ بوون هەرماوە.

وتم: منیش زیاتر پێم خۆشە. بەڵام ئاستی خوێندن و خوێندنەوەی چۆنە؟

دیار بوو سەربەست خۆی پێنەگیرا . وتی:

خوێندن مەرج نیە، هێندەی خوێندنەوەو گەڕان و خولیا بوون بەدوای شتێکدا مەبەستە، چی دەڵێیت بەوانەی خاوەن بڕوانامەن و ناتوانن لەم جۆرە باسانە قسەیەك بکەن.

وتم: ببورە وا دیارە جەنابت خراپ لە من گەیشتوویت من مەبەستم ئەوە بوو لە بواری خوێندندا چیت خوێندووە، تایبەتمەندی و پسپۆریت تا چەندە و لە چ بوارێکدا شارەزایت ؟

سەربەست دوبارە خۆی پێنەگیراو وتی:

گرنگ ئەوەیە لەم بوارەی ئێوەدا کە قسەی لەسەر دەکەن شارەزام، ئەمە یەکەمجارم نیە بکەومە ناو ئەم باسانەوە بەلاّم کەس نەیتوانیوە قسەی خۆی بەسەر قسەمدا سەرخات.

وتم: سوپاس بۆ ئەو هەستی متمانە بەخۆبوونەت، بەلاّم ئەم متمانە بەخۆ بوونە ئەگەر لەودیویەوە گەنجینەیەکی زانستی و زانیاری لەگەڵدا نەبێت ئەوا زۆر بە ئاسانی وات لێ دەکات کە مل بۆ هیچ راستیەك کەچ نەکەیت و وا بزانیت هەقیقەتی رەها تەنهاو تەنها لای تۆیە، منیش خۆم حەزم بەم جۆرە گفتوگۆیانە نیە، چونکە هیچ دەرەنجامێکی وای لێ ناکەوێتەوە کە جێگای دڵخۆشی بێت. وتی:

من چ لێرەو چ لە ئەوروپا زۆرجار کەوتومەتە وتووێژەوە، بەلاّم وەك وتم قسەی دوایی هەر لای من بووە، بۆیە قەناعەتی تەواوم بە خۆم هەیە، جا نازانم لەگەڵ ئازاد چیتان باسکردوەو چۆن چۆنی مناقەشەکەتان دەست پێکردووە. ؟

وتم: سەرەتا وا بریارماندا ئێمە دوو ئاینی جیا لە یەکبین، دوو جیهان بینی جیاوازمان لەیەکتر هەیە، بۆیە حەزم کرد ئەو چی پرسیارێك کە هەیەتی لەسەر ئیسلام بخاتە روو منیش وەلاّمی بدەمەوە، دوایی لەدەرفەتێکی تردا من پرسیار لەو بکەم و یان باشتر بڵێم من بکەومە شەن و کەوکردنی ئەم ئایینەی کە ئەو لە ئەوروپا قەناعەتی پێهێناوە. بێگومان سەبارەت بەوەی کە ئێمەی

مسولّمان بڕوای تەواومان هەیەو بەوپەڕی قەناعەتەوەین کە قورئان پارێزراوە لە هەموو کەموکورتی و دژایەتی بوون و کەم و زیاد بوونێك. ئەوا ئەم باسە بۆتە خاڵی سەرەکی گفتوگۆکەمان چونکە گەر بەشێوەیەکی زانستی سەلماندمان قورئان دوورە لە هەموو کەم و کوڕی و ناتەواویەك ئەوا ئاساییە کە راستی ئیسلام و پەیامەکەی دەردەخات حەزمان نەکرد قسە لەسەر مێژوو کەسایەتی ولاّتان مێژوو بکەین چونکە بەلای هەردوو لامانەوە وایە کە ئەم باسە خۆی لە خۆیدا چەند رەهەند خوێندنەوەی جیاواز هەڵدەگرێت، بەلاّم قورئان معجزەی نەبڕاوەو بەردەوامی ئەم ئیسلامەیە بۆیە خاڵی جەوهەری باسەکەمان قورئانە فەرموون بەرێزیشتان چیتان لەو بارەیەوە هەیە بخەنە روو.

سەربەست سەیرێکی ئازادی کرد. ئازادیش ئەو پرسیارانەی کە لە منی کردبوو خستیە بەردەم سەربەست، سەربەستیش تۆزێك لێیان وردبووەو دایەوە دەست ئازاد .....

وتی: نازانم وەلاّمی ئەم پرسیارانەت چۆن بووە، تا چەندە جێگای قەناعەت بوون بەلاّم وادیارە چەندی گفتوگۆتان کردووە هەر لە سەر بوونی ـ تناقضات ـ بووە لە قورئاندا کە لەوانەیە منیش ئەو رایەم هەبێت کە دەشێت دەقێك چەندین خوێندنەوەی جیاوازی بۆ بکرێت، بەلاّم ئەوەی من دەمەوێت لێی بدوێم ئەوەیە کە چەندین هەڵەی زەق لە ناوی کەسایەتی و شوێن وبگرە هەڵەی زانستی و مێژوویی و جوگرافی ..... هتد . لە قورئاندا بونیان هەیە بەلاّم ئێوە چونکە هەر بۆ بەرەکەت قورئان دەخوێننەوە ئەوا دیارە بەسەرتاندا تێپەڕدەبێت و هەستی پێ ناکەن .!

تەواو گوێم لێ گرت تا تەواو بوو .

وتم:

ببورن، مـن و تـۆ هـەردوکمان هـاوڕای ئـەوین کـە دنیـای ئـەمڕۆ دنیـای پسپۆری و شارەزابونە، زانست هێندە بەربلاو بووە کە وەك جـاران نیـە خـەڵکی لە هەموو زانست و زانیاریەکدا سەر دەرکـەن، ئێـستا بـواری تایبەتمەنـدی زۆر بچوك بۆتەوە پرسـیاری ئـەوەم کـرد کـە جـەنابتان لـە چـی بوارێکـدا پـسپۆڕن وەلامـتان نەبوو.

بەڕێزتان ئازادن لەوەی وەلام بدەنەوە یان نا ؟ من بۆیە ئەم پرسیارەم کـرد تا بزانم ئەم قسانەی بەڕێزتان دەیکەن و ئاوا بـەو گەورەییـە رەخنـە لـە قورئـان دەگرن، ئایا بلێی خۆتان لەمیانەی خوێندنەوەی قورئان و تەفـسیردا، بەسـەریدا کەوتبن یان ئەوەتا ئەم قسانە هی خەڵکانی ترە وەك ( قووتوەمەنی ـ معلبات) هێنراوەتە ئەم ولاتە.

سەربەست وتی: ئەمەیان کەی گرفتی جەنابتـە تـۆ وەلامدانـەوەت لەسـەرە نەك ئەوەی مـن سەرچاوەی وەرگرتنی زانیاریەکانی خۆمت بدەمـێ .

وتم: من پێویستم بەوە نیە کە تۆ سەرچاوەی زانیاری خۆتم بدەیتێ چـونکە مـنیش سەرچاوەکەی وەکو تۆ دەزانم کە کێ یەو بۆچـی ئـەم پرسـیارانە دەخەنـە روو، بگـرە دەتـوانم پرسیارەکانیـشت هـەموو بـۆ بنوسمـەوە چـونکە هـەر ئـەم کۆمەڵە پرسیاردیە لەم دەزگـاو ناوەنـدو کەسـایەتیەوە بـۆ ئـەو دەزگـاو ناوەنـدو کەسایەتی تر دەستاو دەستی پێ دەکرێت.

وەلامدانەوەشیان ئاسانە و هیچی تـێ ناچێت، بـەلام ئەگـەر پرسـیارەکان هەڵقولاوی جەنابتان بن ئەوا خۆشترەو قسەکردن لەسەریشیان ئاسـانترە چـونکە پرسیارەکە لەلای خۆت دروست بووە، هەر کە وەلامت وەرگرت ئەوا بە گوێرەی

وەلاّمەکە قەناعەت دەهێنی. بەلاّم کە پرسیار هی خۆت نەبوو بە ئامادەکراوی بەردەستت خرابوو ئەوا لەوانەیە سەر لەوەلاّمەکە دەرنەکەیت ئەو دەم دەبێتە گفتوگۆیەکی نەزۆك، منیش حەز بەم جۆرە گفتوگۆیانە ناکەم ، کات لەوە بە گرنگتر دەزانم ئاوا بە فیڕۆ بدرێت.

ئازاد وتی:

مامۆستا ئاواش نا! خەریکی لە ناوەڕاستدا ریسەکە دەکەیتەوە بە خوری، بڕوا بکە من خۆم زۆر لەم گفتوگۆیە سوودمەند بووم، من تا ئێستا وام زانیوە هەردەبێت قسەبکەم خەلّکی گوێم لێ بگرن بەلاّم کاتێك کە دەبیستمەوە هەست دەکەم لە زۆر لاوە زانیاریەکانم کەم و کورت بوون یان بە گوێرەی پێویست نەبوون. بۆیە من پێم خۆشە چۆن لە چەند دانیشتنی تردا قسەمان کردووە هەر ئاوا بەردەوام بین.

وتم: بەوپەڕشی خۆشحالّیەوە بفەرموون تا ئەوەندەی بەیەکەوە بوین پرسیاری خۆتان بکەن.

سەربەست وتی: مادام خۆتان قورئانتان دیاری کردووە ئەوا منیش هەولّ دەدەم پرسیارەکانم لەبارەی قورئانەوە بێت. یەکەمین پرسیاریشم ئەمەیە خۆت لە من باشتر دەزانیت کە پانتایی زەمەنی زۆر لە نێوان دایکی(یسوع) واتە ـ مریەم ـ و ـ هارون ـ ی برای(موسا)دا هەیە، کەچی لە قورئاندا بۆ مەریەمی پاکیزە بە خوشکی(هارون) ناو دەبات کە چەندە لە یەکەوە دورن، ئەم هەلّەیە چۆن هەر ئاوا تێپەڕ بووە و حسابی بۆ نەکراوە؟

وتم: چەند سەرنجێکی بچوکم بۆ قسەکانی جەنابت هەیە.

سەرەتا با ئەوەت لەلا روون بێت کە ئەم ناوە قورئان نەیداوەتە پاڵ (مەریەم) بەڵکو قەومەکەی (مەریەمی دایکی عیسا ـ ع.س ـ)یان پێ وتووە، قورئانیش ئەو دیمەنە ئەگرێت و ئەیگێڕێتەوە.

تۆش وەك من دەزانیت کە لەیەکچوونی ناو ماناى ـ یەك کەس ـ بون ناگرێتەوە، بەڵکو ئەمە خوازیاری ئەوەیە لێمان زیاتر وردببینەوە پێش حوکم دانمان، ئەم پرسیارەی جونابت دیکەیت ١٤٠٠ ساڵ بەر لە ئێستا وەڵام دراوەتەوە کاتێك وەفدی (مەسیحیەکانی نەجران) کە دێنە خزمەت پێغەمبەرو ئەم پرسیارە لە (مغیرە بن شعبە) دەکەن ئەو وەڵامی نازانێت بەلام کاتێك پرسیارەکە روبەرووی پێغەمبەر(د.خ)دەکاتەوە، پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت: (دەبوایە ئەوەت پێ بوتنایە کە میللەتانی پێشوو منالەکانیان بەناوی پێغەمبەرو پیاو چاکەکانیانەوە ناو دەنا) واتە ناوی هارون لەناو جولەکەکاندا ناوێکی بەربلاو بووە وەك چۆن ناوی ـ مایکڵ و جۆن ـ لەئەمەریکاو (محمد) لەلای خۆمان کە بۆ خۆشەویستی پێغەمبەر(د.خ)بلاوە، ئەوکاتەش ئاوا ئەو ناوانە بلاوبون وەهیچ بەڵگەیەك بەدەستەوە نیە لە قورئان و فەرمودەکە پێمان بلێت بەلێ ئەم هارونەی کە ئەوان مەبەستیانە هەمان هارونی برای موسایە کە چەندین سەدە پێش(مەریەم) ژیاوە.

هەر لەمیانەی راوبۆچونی زانایان لەم بارەیەوە ئەو رایەش هەیە کە گوایە (هارون) پیاوێکی خراپی (بنی إسرائیل)بووە، بۆی ئەم تۆمەتە گەورەیان داوەتە پاڵ ئەو.

با لەلات روون بێت کە ئێمە خۆشمان لە زمانی شیرینی کوردیدا ئەم دەستەواژانەی وەکو(کوڕی دوای راپەڕین ، باوکی فەقیرو هەژار، برای تەنگانە،

....هتد) بەکار دەهێنین کە مەبەستمان دیارە، لایەنی فسیۆلۆجی نیە هێندەی مەبەستمان لایەنی مەعنەویە.

ئازاد حەزی کرد پێش سەربەست بکەوێت لە پرسیار کردندا بۆیە خێرا وتی:

سەربەست گیان ببورە ویستم هەر ئەم باسە نەگوێزینەوە پرسیارێکی ترم بەخەیاڵدا هات ئەویش ئەوەیە کە قورئان ناوی باوکی (ئیبراهیم)ی بە (ئازەر) هێناوە کە ئەمە لە راستیدا هەڵەیەو ـ تارح ـ راستە کە لە کتێبی پیرۆزدا ئاماژەی پێکراوە.

وتم:

پێش ئەوەی وەڵامی پرسیارەکەت بدەمەوە دەمەوێت لەمەودوا هەر شتێ ویستت شتێ راست بکەیتەوە نابێ ئاماژە بە ـ کتێبی پیرۆز ـ بدەیت ئەگەر ئەو باسی کرد ئەوا باشە ئەگینا وانیە دەبێت باسەکەی خۆت خۆی قوەتی بەرگری لەخۆکردنی هەبێت و توانای شیکاری هەبێت .

نابێت کتێبی پیرۆز بکەنە مەرجەع بۆ قورئان چونکە من بەوپەڕی قەناعەتی خۆمەوە بڕوام وایە کە کتێبی پیرۆزتان سەردەمانێکی دردنگ نوسراوەتەوە دوچار بەدەستکاری و گۆڕانکاری زۆر هاتووە بۆیە من پشتی پێ نابەستم، ئێوەش بەهەمان شێوە ئەو مافەتان هەیە کە نابێت من قورئان بکەمە مەرجەع بۆ کتێبی پیرۆز بەڵکو دەبێت هەر لایەکمان هێزی بەڵگە هێنانەوەو بەراووردکاری و لۆژیکی قسەکردنی بکەینە دادوەر، گەر بگەڕێمەوە سەر پرسیارەکەت ئەوا دەبێ بڵێم ئەگەر باش لە کتێبی پیرۆز ـ پەیمانی کۆن ـ ورد بوبێتنەوە ئەوا دەبینن لە نێوان نوسخەکانی پەیمانی کۆنی ( سامری،

عیبرانی، یۆنانی) جیاوازیەکی جۆری ڕەچەڵەك هەیە هەروەك جیاوازی تەمەنی باوکەکانی نێوان ئادەم تا ئیبراهیم دوبارە لە نوسخە جۆراوجۆرەکاندا لە یەك جیاوازن بۆیە پێم باشە جاری ئەم هەڵانە لەبەرچاو بگرن . . . .       .

سەربەست زوتر گەرم بوو بۆیە وتی:

مامۆستا ئازاد باسی هەڵەی ناوی باوکی ئیبراهیم ی لە قورئاندا لێ پرسیت کەچی تۆ دێیت قسە لەسەر پەیمانی کۆن دەکەیت! ئەی تۆ ئێستا وتت چی... ؟

وتم: چاوەکەم.... ئەم دانیشتنانە دانیشتنی زانستین دەبێت بەوپەڕی سنگ فراوانیەوە قسەکردن قەبوڵ بکەیت. دوایی لە دەرفەتی خۆتدا ئازادیت چۆن گوزارشت لە بۆچونەکانت دەدەیت.

من هێشتا وەڵامی پرسیارەکەتم نەداوەتەوە دەمویست پێت بڵێم ئەگەر ئەو کەسانەی ئەم پرسیارانە دەوروژێنن گەر لەبەر لایەنی راستی و زانستی ئەم کارە دەکەن، ئەوا نەدەبوو چاو لەو هەموو هەڵانە بپۆشن کەلە کتێبی پیرۆزدایە..؟! واتە با دەرزیەك بکەن بەسەری پەنجە خۆیان ئەو دەم سوژن لە لاڕانی بەرامبەرەکانیان بدەن. بێینەوە سەر وەڵامەکەت ئەوەی جێگای قسەی شارەزایانی ئەم باسەیە کە باوکە (إبراهیم ـ ع.س.) دوو ناوی هەبووە یان بڵێین نازناوێکی هاوتای ناوەکەی خۆی هەبووە، (خۆی ناوی ـ ئازەر ـ بووەو نازناوەکەی ـ تارح ـ بووە) بەهۆی زیاد بەکارهێنانی نازناوەکەی ناوەکەی کەمتر ناسراوە.

سەربەست دوبارە ناوبڕێکی خستە قسەکانم وتی:

ئەم قسەیەت لەکویّ هیّنا ..... خۆ قورئانەکەشتان باسی لەم جۆرەی تیایا نیە ..؟

وتم: ئەوەی کە پشتگیری قسەکانی من دەکات ئەوەیە کە ـ تارح ـ وەك لە کتێبی پیرۆزدا هاتووە لە زمانی عیبریدا بەمانای کەسی ـ تەمبەڵ ـ دێت کە دابنیشێت و کار نەکات، بەڵام (ئازەر) بە مانای کەسی (چالاك، بەهێز، پشتگیر) کە بەمانای پشتگیرو هاوکار دێت. حەزرەتی موسا لە قورئاندا کاتێك داوا لە خوا دەات کە ـ هارون ـ ی برای لەگەڵدا بنێرێت و بیکاتە ـ وەزیر ـ دەڵێت

{اشْدُدْ بِهِ أَزْرِي }طه٣١ ئەگەر سەیر بکەیت لە زمانی عیبریدا وشەکانی (عازر، عزیر) زۆر جیاوازە.

لە سورەتی (الأعراف:١٥٧)قورئان دەفەرموێت:{...فَالَّذِينَ آمَنُواْ بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ ...}سەیر دەکەین وشەی{عزر}بەمانای پشتگیر دێت، وە لە زمانی عیبریدا پیتی ـ ع ـ دەرناکەوێت زیاتر وەك ـ ه ـ و ـ أـ دەیخوێنینەوە.

تۆش لەگەڵ من هاورِایت کە کەسایەتیەکی وەکو ـ یعقوب ـ پێشی دەووترێت ـ ئیسرائیل ـ کە دوو ناوە بۆ یەك کەس، ئەمە لە لایەك لە لایەکی ترەوە وەك وتم ئەم باسانە پەیوەستن بە مێژوو زمانەوە دەبێت وردتر بۆی رۆبچین بەشێك لەو زانایانە لایان وایە کە زمانی عەرەبی جیاوازی دەکات لەنێوان وشەی (أب) و(والد) واتە هەموو(والد) یێك(أب)ە، بەڵام هەموو(أب)یێك (والد) نیە. چونکە هەر خۆشمان جاری وا هەیە منداڵەکان لە جیاتی باپیرە بە ـ باوە ـ بانگی باپیرەکانیان دەکەن، هەروەها لە زمانی عەرەبیدا ـ أب ـ بۆ پەروەرشیارو رابەر و مامۆستاش بەکار دەهێنرێت، بگرە بۆ ـ مام ـ یش هەر

بەکاری دەهێنین، هەروەك لە قورئاندا سورەتی (البقرة:١٣٢)دەفەرموێت:{... قَالُواْ نَعْبُدُ إِلَـهَكَ وَإِلَـهَ آبَائِكَ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ إِلَـهاً وَاحِداً....}دیارە کە ئیسماعیل مامی ـ یعقوب ـ بووە، کەچی لێرەدا بە ـ باوك ـ هاتووە .

سەربەست ئەم جارەشیان هەروا سەیرێکی کردم و وتی:

قورئان چەندین ئایەتی تیایە کە شیعری شاعیری عەرەبی(إمرؤ القیس)ە ئەمە خۆی دەری دەخات کە قورئان لە دەقی جۆراوجۆری پێش خۆیەوە وەرگیراوە.

وتم: کامەیە ئەو شیعرەی کە جەنابت دەڵێی قورئان لێی وەرگرتووە؟

لەناو کاغەزەکاندا گەڕا پارچەیەك کاغەزی دەرهێنا دەستی کرد بە خوێندنەوە.

يتمنى المرء في الصيف الشتاء    فإذا جاء الشتاء انكره
فهو لا يرضى بحال واحد    قتل الإنسان ما أكفره

هەروەها:

اقتربت الساعة وانشق القمر    من غزال صاد قلبي ونفر

هەروەها:

إذا زلزلت الأرض زلزالها    وأخرجت الأرض أثقالها
تقوم الأنام على رسلها    ليوم الحساب ترى حالها.

کە لە خوێندنەوەی بۆوە یەکسەر وتی:

خۆت بینیت کەچەندە قورئان سوودی لێوەرگرتووە.. ئایەتەکانی لێ دەرهێناوە.

بەزەییم بەم جۆرە حاڵەتانەدا دێتەوە کە کەسانێك بۆ ئەوەی دژایەتی قورئان بکەن گوێ لە هەموو کەس دەگرن و هەرچی دژ بە قورئان بوترێت بە راستی دەزانن، بێ ئەوەی خۆیان یەك تۆز وردبونەوەیان هەبێت، بۆیە ناچار بووم بکەومە لەیەك هەڵوەشاندنەوەی ئەم بەناو بەڵگەیەی، وتم:

تۆ بەم کارەت (إمرؤ القيس)شەرمەزار دەکەیت! وتی بۆ؟

وتم: جاریّ(إمرؤ القيس) هێندە لاواز نەبووە کەئەم جۆرە بەیت و باڵۆرانە بڵێت، شاعیرێکە تا ئێستاشی لەگەڵ بێت لە ئەدەبی عەرەبیدا خاوەن کاریگەری خۆیەتی. ئەمە لەلایەك، لە لایەکی تر تەحەددای بەرێزت دەکەم کە ئەم شتانەی تۆ باسی دەکەیت لە دیوانەکەیدا نیە، خەڵك لەملاولاوە دەیدەنە پاڵی، پرسیارێکم لێت هەیە... مەبەستی جەنابت لە (إمرؤ القيس) کامەیە ؟

یەکسەر وتی:

(إمرؤ القيس) هەریەك کەسەو مەشهوردو ئیتر بۆ ئاڵۆزی دەکەیت ؟

وتم: کەواتە ئێستا زانیم کە جەنابت تەنها ناوی (إمرؤ القيس) ت بیستووە، دەنا ئاگادار نیت کە چەند (إمرؤ القيس) هەیە. با بزانیت کە لە ئەدبی عەرەبیدا ٤ (إمرؤ القيس) هەیە کە رەنگە تۆ هەر نەشت بیستبێ...... !

یەکەم/ إمرؤ القيس بن حجر بن الحارث الكندي(سەردەمی جاهیلی) کە بەناو بانگترینیانە.

دووەم/ إمرؤ القيس بن حبلە السكوني(سەردەمی جاهیلی)

سێیەم/ إمرؤ القيس بن حمام بن مالك بن عبيدة(سەردەمی جاهیلی)

چوارەم/ إمرؤ القيس بن عابس بن منذر(سەردەمی ئیسلام)

کام لەمانە ئەم شعرەی وتووە؟

وەلآم ........

زانیم نایزانێت. ویستم هێواشتر بیمەوە هێندە ـ إحراج ـ نەبێت، بۆیە وتم:

خۆت لەسەرەتای شیعرێکدا وتت (اقتربت الساعة) واتە ڕۆژی دوایی نزیك بۆتەوە، باشە خۆ هەموو کەس دەزانێت کە عەرەبی سەردەمی پێش ئیسلام باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نەبووە، (ڕۆژی دوایی) ئیسلام کردی بە پایەیەك لە پایەکانی باوەڕی مرۆڤی مسوڵمان. هەروەها خۆتان دەزانن شیعرەکانی (إمرؤ القیس) ئەودەم بەهۆی ئەوەی بازاڕی شیعر گەرمترین بازاڕ بووەشیعرەکانی ئەمیش لە (المعلقات السبع) بووە، لەسەر زاری زۆربەی کەس و کوڕو کۆمەڵەکان بووە، خۆ ئەگەر قورئان ئەمەی لەوەوە وەربگرتایە ئەوا هەر زوو ئەوەی کە قورئان داوایان لێ دەکات کە بتوانن نموونەی ئەم قورئانە بهێنن ئەوا زۆر بە ئاسانی ئەوانیش دەیانهێنن و کارەکە دەبڕایەوە دەبڕایەوە. یان لانی کەم ئەوەیان دەدا بەگوێی خەڵکیدا کە ئەم قورئانەی(محمد ـ د.خ ـ) لە شیعرەکانی( إمرؤ القیس )ەوە وەرگیراون، بەلآم بێدەنگ بوونیان ئاماژەیەکە سەرچاوەی ئەم قورئانە لە لایەن خوای گەورەوەیە.

سەربەست پارچە کاغەزەکەی هەر بەدەستەوە بوو سەیرێکی کردو وتی:

{إِنَّ اللَّـهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيماً }الأحزاب٥٦

ئێمە دەزانین کە ئێوە نوێژ بۆ خوا دەکەن بەپێی ئەم ئایەتە بێت ئەی فریشتە و خوا چۆن نوێژ بۆ پێغەمبەر دەکەن ... ؟

وتم: ماڵت ئاوا بێت وات لە خۆت شێواندووە لەهەر لایەکەوە دەستی دەدەیتێ هەر کۆڵەواریت، ئەم ئایەتە کەی باسی نوێژ کردنە ! ئەمە باسی لە (صەلاوات)دانە کە ماناکەی بەم جۆرەیە:

١/ صەلاوات دانی خوا بۆ بەندەکانی دابەزینی بەرەکەت و بەزەییە .

٢/ صەلاوات دانی فریشتەکان بۆ بەندەکان داواکردنی لێخۆش بوون و لێبووردنە .

٣/ صەلاوات دانی خوا بۆ پێغەمبەر(د.خ)مەبەست پێی (سەنا خوانی و دەرخستنی گەورەیی و پیرۆزی) پێغەمبەری خوایە.

وەئەو کاتەی ئێمە دەڵێین ( اللّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّد ) مەبەستمان پێی خوایە پلەو پایەی پێغەمبەر (د.خ) بەرز رابگرە، شەریعەتەکەی سەرخە، لە کۆڕی فریشتەکاندا سەنا بکرێت، دوارۆژ ببێتە شەفاعەت کارمان، پاداشتی زیادکە ...... هتد .

ئازاد سەیرێکی سەربەستی کرد وتی :

حەز دەکەم با مامۆستاش پشوویەك بدات هێندە پرسیار نەکەیت، با تۆزێك میوە بخۆین، دایکیشم وا دیارە سینیەك چای هێناوە .

پێم خۆش بوو کە پشوویەك بدەین لانی کەم بۆ ئەوەی مەجلیسەکە مەجلیسی پرسیارو وەلام نەبێت جۆرێك پێکەوە ژیان دروست ببێت، کە ئێمە ئەمرۆ زۆر پێویستمان بە پێکەوە ژیانی دەنگ و رەنگە جیاوازەکانە ماوەی چایی خواردنەوەو میوە خواردن نزیکەی چارەکێکی پێچوو، کە سەربەست بە هێواشی دەستی برد بۆ کتێبەکەو کاغەزێکی تری دەرهێنا، ئازادیش هەستا

شتەکانی بردەوە، دەرگاکەی داخست و گەڕایەوە دانیشت، یەکسەر سەربەست وتی:

پێت چۆنە بچینەوە سەر باسەکەی خۆمان ؟

وتم: ئەی بۆچی دانیشتووم. ئەگەر لەبەر ئەو باسە نەبێت .؟! بفەرموون .

سەربەست وتی:

لە قورئاندا هاتووە { الَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ إِلَّا اللَّمَمَ إِنَّ رَبَّكَ وَاسِعُ الْمَغْفِرَةِ }(النجم:٣٢) بەپێی ئەم ئایەتە بێت گوناهی بچوك دەرگای لەسەر پشتە. واتە بەس زیناو کە بە گوناهی ـ کبیرة ـ ی ناو دەبەن گوناهە، ئەگینا پێشەکیەکانی وەك سەیر کردن و پێکەوەمانەوەو دەستلێدان و .... هتد دروستن و هیچمان لەسەر نیە ؟

وتم: وادیارە جار جار لە پرسیارکردنەوە سەنگەری خەباتتدەگوێزیتەوە بۆ ئەوەی بیتە ڕاڤەکاری قورئان. بەڵام چ ڕاڤەکارێك کە تەنها بەو جۆرەی کە خۆت بە دڵتە نەك بەو جۆرەی کە قورئان داوای دەکات و مەبەستیەتی.

جەنابت مەبەستت وشەی ـ اللمم ـ ە دیارە وشەکە بەو مانایە دێت کە مەبەست پێی ئەو گوناهانەیە کە کەسانێك نەبێت کە خوا دەیانپارێزێ ئەگینا زۆربەی خەڵکی دەکەونە ناوی.

ئەمەش بەو مانایە نیە کە ئەم گوناهانە ـ مباح ـ بن، و دروست بێت ئەنجام بدرێن و قەیناکا کەس ئەنجامی دا . بەڵکو هەموو مەبەستی ئایەتەکە ئەمەیە کە ئەم گوناهانە ڕاستە گوناهی بچوکن بەڵام ئەنجامدانیان هەر حەرامە. ئایەتەکەش هیچ باس لەوە ناکات کە دەرگا لەسەر پشت بێت بۆ ئەنجامدانی . بەڵکو باس لەوە دەکات کە حاڵی کەسانی بڕوادار وایە کە خۆیان

لە ئەنجامدانی گوناهی گەورە دەپارێزن وناکەونە داویەوە، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا بە حوکمی مرۆڤ بونیان دەکەونە ناو داوی گوناهی بچوکەوە .

ئایەتەکە نالێت ئەم گوناهە بچوکانە ( مباح )ن و ئەنجامیادەن، بەڵکو دەفەرموێت ئەم گوناانە حەرامن بەلاّم ئەوەیە کە بچوکن هێندەی گوناهە گەورەکان لێپرسینەوەیان لەسەر ناکرێت، چونکە سروشتی هەموو مرۆڤێك وایە کە گوناه دەکات بەلاّم باشترین کەسی گوناهکار ئەوەیە کە داوای تەوبەو پەشیمانی دەربڕێت. بەلاّم ئەو پێشەکیانەی ـ زینا ـ کە تۆ باستکردن ئەوا بە دەقی ئایەت حەرامە. {قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ }النور٣٠.

خۆشت دەزانی قورئان نافەرموێت زینا مەکەن دەڵێت نزیکی مەکەونەوە کەواتە هەموو پێشەکیەکانی زینا کە سەرەتان بۆ نزیك بونەوە لەو گوناهە ئەوا هەر گوناهەو نابێت ئەنجام بدرێت.

ئازاد وتی:

لە سورەتی(القصص:٣٨)دەڵێت:{ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَهٍ غَيْرِي فَأَوْقِدْ لِي يَا هَامَانُ عَلَى الطِّينِ فَاجْعَل لِّي صَرْحاً لَّعَلِّي أَطَّلِعُ إِلَى إِلَهِ مُوسَى وَإِنِّي لَأَظُنُّهُ مِنَ الْكَاذِبِينَ}

دیارە ئاماژە بەوە دەکا کە ـ فرعەون ـ داوا دەکات کە ـ هامان ـ کە من قسەیەکم لەسەر ئەم ناوە هەیە. بەلاّم دواتر باسی دەکەین هەستێت بە خشت و کۆشك و ساختمانێکی گەورە بۆ فرعەون دروست بکات تا فرعەون ـ خوای ـ موسا ـ ی لێوە ببینێت. پرسیارەکەم ئەوەیە کە ئەوەی کە زانایان باسی لێوە دەکەن ئەوەیە کە لە سەردەمی ـ موسا ـ دا خانوو بینا بە خشت نەکراوە،

بەڵکو هەر بە کەڵەکە بەرد بووە هەروەك لە ـ أهرام ـ ەکان و شانۆی رۆمانی لە ـ بصری ـ دا دەیبینێت.

وتم: کاك ئازاد نازانم چۆن کەوتویتە داوی ئەم هەڵە گەورەیەوە .... !

چونکە ئەوەی کە مێژوو باسی دەکات ئەوەیە کە مرۆڤ پێش ٥ هەزار ساڵ پێش زایین خشتی سورەوەکراوی بەکار هێناوە، هەر لە میسردا خشتی وا دۆزراوەتەوە کە مێژوویەکەی دەگەڕێتەوە بۆ لانی کەم ٥ هەزار ساڵ پێش زایین، ئەمە جگە لەوەی کە هەر لە بابل و پەرستگاکانی ئاشورو سۆمەریەکانی(٢٥٠٠) ساڵ پێش زایین و پاشان تاقی کیسرا هەر لە خشت دروستکراون.

(دیورانت) لە چیرۆکی شارستانیەتەکان باس لەوە دەکات کە ـ أور ـ پایتەختی سۆمەریەکان کە دەکەوێتە قەراغ روباری دیجلەو فورات زۆربەی خانوو بیناکانیان لە خشت و گەچ بوون. بۆیە حەز دەکەم ئەم زانیاریانەت راست بکەیتەوە.

دیار بوو سەربەست لەم پرسیارە رازی نەبوو، بۆیە رووی کردە ئازادو وتی:

پرسیارێك کە بە گرنگ و جەوهەری دانەنێیت مەیکە. لەوانەبوو ئەو پرسیارەشت لە من بکردایە منیش وەکو مامۆستا وەڵامم دابایتەوە چونکە خۆ ئەم پرسیارە وەڵامەکەی بەسەیرکردنێکی سەرپێیی شوێنەوارە کۆنەکان دەردەکەوێت کەوانیە .

منیش ویستم کەش و هەوای دانیشتنەکە خۆشترکەم، وتم:

لێیگەڕێ کابرا چی کردووە، کاغەزەکە چی لێ نوسراوە؟ ئەو پرسیاری کردووە خەتای ئەم چیە خەتای ئەو کەسەیە کە پەنا دەبەنە ئەم کارانە.

دیار بوو کاك ئازاد ئەمجارەیان ویستی پرسیارێك بکات کەلە جەوهەری بابەتەکەماندا بێت وتی:

لە قورئاندا لە ٣ جێگادا باس لەوە دەکات کە - یسوع - بە منالی و لەسەر بێشکە قسەی کردووە، ئەو ئایەتانەش { وَيُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ وَكَهْلاً وَمِنَ الصَّالِحِينَ }(آل عمران:٤٦) و { ..... تُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ وَكَهْلاً .... }(المائدة:١١٠) و { فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ قَالُوا كَيْفَ نُكَلِّمُ مَنْ كَانَ فِي الْمَهْدِ صَبِيّاً }(مريم: ٢٩) ئەگەر ئەمە وابوایە دەبوایە ئێمە خۆمان ئەم شتەمان باس بکردایە. نەك ئاتاج بەوە بین دوای ٦١٠سال قورئان بێت پێمان بلێت کە - یسوع - ئەو معجزەیەی هەبووە. بە زەردەخەنەیەکەوە پالێکی دایەوەو وتی:

خۆ ئەمجارەیان نالێیت پرسیارەکەت سادەبوو پێویستی بەخستنە روو نەبوو؟

وتم:

زۆر ئاساییە هەر پرسیارێك کە دەیکەیت مافی خۆتە. ئەوەی کەوتیشت ئەوە رای کاك سەربەست بوو، من تەنها وەلامم دایەوەو بەس. ئەگەر بێینە سەر وەلامی ئەم پرسیارەت ئەوا بە پشتیوانی خوای گەورە دەلێین لە راستیدا ئەم نارەزاییبونە کاتێك لە جێگای خۆیدا دەبوو کە مەسیحیەت بیتوانیایە بە درێژایی مێژوو بەلگەنامەو سەنەدە ئاینیەکانی خۆی بپاراستایە لە فەوتان و لەناوچون رزگاری بکردنایەو نەیخستنایەتە بەردەمی رەحمەتی - تحريف - و گۆڕین و دەست تێوەردان. بەداخەوە کاری یەکەمی مەسیحیەت لەبەلگەنامەیەکی پتەوە دروستەوە سەرچاوەی نەگرتووە. هێندەی گەڕانەوەیە بۆ ئەفسانەو داستانی جۆراوجۆر. بۆیە هەر لە سەرەتاوە نارۆشنەو لێلی سەرچاوەکەی داگرتووە تەنانەت ژیانی ئەم پەیامبەرە بەرزە (حەزرەتی عیسا-

ع.س) لەلای ئەم بەڵگەنامانە دوچار بە ئاڵۆزی و نادیاریەکی بەرچاو بۆتەوە. هەرسێ ئینجیلی(متی، مرقص، لۆقا) لەو(٣٣) معجیزەیەی حەزرەتی مەسیح تەنها یەك معجزەیەتان باسکردووە لە ئینجیلی (یوحنا:٧)دانەی تر باس کراوە ئەی ئیتر ئەوانی تر دەبێت لە کوێدا باس کرابن ..؟!

دیار بوو ئەم جارەش خۆیان پێ نەگیرا بۆیە کاك ئازاد وتی:

مامۆستا من پرسیاری قورئانت لێ دەکەم . تۆ باسی کتێبی پیرۆز دەکەیت ؟ لێ گەڕێ ئەوە بۆ ئێمە جێ بهێڵە . خۆمان شارەزاترین لە کتێبی خۆمان ؟!

وتم: ئاخر کورد واتەنی دەردەکە لێرەدایە کەوا دەزانن شارەزان و کەچی شارەزاش نین، من دەزانم تۆ پرسیارەکەت لە قورئانە بەلاّم حەز ناکەم باز بەسەر کتێبی پیرۆزدا بدەیت، چونکە تۆ لات وایە ئەم بابەتە باس نەکراوەناچارم کە بت گێڕمەوە بۆ کتێبی پیرۆزو پێت بڵێم کە ئەم - ئینجیل - انە !! هەرچەندە سەردەمی نوسینیان لەگەڵ یەکتر هێندە دوورو دابڕاو نین کە پێدەچێت دوای تەواو بوونی ئەرکی حەزرەتی عیسا نوسرابنەوە، کەچی تێکەڵ و پێکەڵیەکی بەرچاو داپۆشیوەچاك و خراپی تیایا تۆمار کراوە دوای ئەوەی مەسیحیەکان لە چنگ ئازارو نارەحەتیەکان رزگاریان بوو کەنیسە کەوتە سەرو بەندی ئەوەی یەکێك لەو دەقانە هەڵبژێرێت و بیکاتە بیروڕای فەرمی کەنیسە. ئینجیلەکان شتێکیان نیە ناوی - سند - بێت، بە هیچ جۆرێك نوسخەیەك لەدەست نوسەکان لەبەر دەستدا نیە تا بەراورد بکرێن، ئیتر تێڕامان و بەد گومانی حاڵی هەموو کەسێکە کە زانستیانە لەم مەسەلە بڕوانێت. لێرەوە دێمە سەر خاڵی جەوهەری پرسیارەکەتان، کە ئەم بێ سەرەو بەرەیی و پەشۆکاویەی

نوسینەوەی ـ ئینجیل ـ وای کردووە کە ـ لۆقا ـ لە ـ ئینجیل ـ ەکەیدا قسەکردنی سەر بێشکە بگێڕێتەوە بۆ ـ یوحنا المعمدان ـ واتە (یحیی کوڕی زەکەریا) نەك (عیسی کوڕی مەریەم) ئیتر ئینجیلەکانی تریش لە ئاست ئەم کارە بێ دەنگیان هەڵبژاردووە لە ئینجیلی لۆقادا ئاماژە بەوە دەدات کە لە سەردەمی هێرۆدۆتس مەلیکی جولەکەی (٤٠ ـ ٤ پێش زایین) ـ کاهین ـ یێك هەبووە ناوی ـ زەکەریا ـ بووەو هاوسەرەکەشی لە کچەکانی ـ هارون ـ بوو ناوی ـ ئەلیسابات ـ بوو، نەزۆك بوو، ئەو دەمەی زەکەریای هاوسەری لە پەرستگاکەدا خەریکی پەرستن بوو ئەوا فریشتەکان دەوریان داو مژدەی بەخشینی ـ یحیی ـ یان پێ گوت. ئەو دەمەی ـ ئەلیسابات ـ دوو گیان بوو ئەوا ٥ مانگ خۆی پەنهان کرد، لە مانگی شەشەمدا ـ جبرائیل ـ نێردرا بۆ شاری ـ ناصرة ـ بۆ لای مەریەمی پاکیزە تا مژدەی پێدانی ـ عیسی ـ ی پێ بدات، وە پێی وت: ئەوە ـ ئەلیسابات ـ ی پوریشت ڕۆیشت بەو تەمەنەی دووگیانە لەو ڕۆژانەدا مەریەم چوو بۆ شاری ـ یهوذا ـ چووە لای ـ ئەلیسابات ـ و سەلامی لێکردو ٣ مانگ لەلای مایەوەو پاشان گەڕایەوە بۆ ـ ناصرة ـ بۆ ماڵەکەی خۆی. دوای ئەوەی کاتی دوو گیانی ـ ئەلیسابات ـ تەواو بوو ئەوا کوڕێکی بوو دەرو دراوسێش بیستیان و پێی خۆشحاڵ بوون. ڕۆژی هەشتەم چون بۆ لای تا سونەتی بکەن (خەتەنە) ناویان نا (یحیی) ئەمەش بە ئاماژەیەکی باوکی بوو. هەر لەم کاتەدا ئەم منداڵە دەمی کردەو زمانی پژاو خوای بە پیرۆز ڕاگرت. ئیتر ئامادەبوان هەمویان لەم کارە نامۆیە سەرسام بوون ؟! بەڵام مەریەمی پاك داوێن کە ڕۆژانی دووگیانی تەواو بوو ئەوا سکەکەی داناو کوڕێکی بوو پێچایەوە. کە هەشت ڕۆژی تەواو کرد ئەوا هاتن بۆ ئەوەی ئەم منالە سونەتی

بکەن(خەتەنە) ناویان نا ـ یسوع ـ . پرسیاری جەوهەری من ئەوەیە کە لەو کەسەی کە ئینجیلی نوسیوە. ئایا هیچ پێویست بەوەی دەکرد کە ـ یحیی ـ لە رۆژی هەشتەمی تەمەنیدا زمانی بپژێت و قسە بکات؟

ئاشکرایە معجیزەو شتی نائاسایی تا هۆکارێك نەبێت بۆ ئەنجامدانیان لەخۆوە ئەنجام نادرێت دەبێ چ پێویستیەك لە گۆڕێ بوبێت تا ئەمەی ـ یحیی ـ ئەنجام بدرێت ؟

کە لە راستیدا ئەمە رێك و رەوان هەڵەی نوسەرو کاتی نووسینەوەیەو کاری ئەنقەستە ئەەو لە لایەکی ترەوە قورئانی پیرۆز ئەوە باس ناکات کە حەزرەتی مەسیح بەشیرەخۆرەیی قسەی کردبێت ئەوەندەی کە باسکراوە ئەوا خوای گەورە باس لەو نیعمەتانە دەکات کە بە حەزرەتی مەسیحی بەخشیوە هەر لەوەی بە گیانی پیرۆز پشتگیری لێ کردووەو هەر لە منداڵیەوە خاوەن عەقڵ و کامڵ و نەجیب بوو، وەك پیاوێکی دنیا دیدە قسەی دەکرد. هەر لە ١٢ ساڵیدا لەگەڵ گەورە زانایانی ئۆرشەلیم مناقشەی کردون ئەوانیش پێی سەرسام بوون تا ئەوەی دایکی ترسا لەوەی کە کوڕەکەی لەسەر دەستی ئەوان توشی خراپەیەك بێت بۆیە لێپێچینەوەی لەگەڵدا کرد. ئەمەیە کە دەفەرموێت: {إِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسى ابْنَ مَرْيَمَ اذْكُرْ نِعْمَتِي عَلَيْكَ وَعَلَى وَالِدَتِكَ إِذْ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ الْقُدُسِ تُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ وَكَهْلاً وَإِذْ عَلَّمْتُكَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَالتَّوْرَاةَ وَالإِنجِيلَ وَإِذْ تَخْلُقُ مِنَ الطِّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ بِإِذْنِي فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيْراً بِإِذْنِي وَتُبْرِئُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ بِإِذْنِي وَإِذْ تُخْرِجُ الْمَوتَى بِإِذْنِي وَإِذْ كَفَفْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ عَنكَ إِذْ جِئْتَهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ إِنْ هَـذَا إِلاَّ سِحْرٌ مُّبِينٌ} المائدة١١٠

کە ئەمە لای زانایان بەو مانایە دێت کە لە منداڵی و گەورەیی و پیری دا قسەی لەگەڵ کردون. وەهەندێك لە زانایان دەڵێن لە ـ مهد ـ واتە ـ بێشکە ـ ئەوەیە کە هەر لە منداڵیەکی زوەوە قسەی کردووە. مەرج نیە هەر شیرە خۆرە بێت، وەکو ئەوەی خۆمان دەڵێت( داوای زانست بکەن لە بێشکەوە تا ناو گۆڕ) دیارە داواکردن لەسەر بێشکە نابێت، بەڵکو دەبێت بۆ چەند ساڵ دوای ئەو تەمەنە بێت .

ئازاد وتی: مامۆستا هەرچەند کاتەکەشمان درەنگ کرد بەلاّم پێشتریش وتم لەبارەی ـ هامان ـ ەوە پرسیارم بکەم. کە ـ هامان ـ لە قورئاندا نزیك فیرعەونە وەزیرە یان نا ئەوەیان نازانم، بەلاّم ئەوەندەی من بزانم ئەمە هەڵەیەکی مێژوویە کە قورئان کردوویەتی، چونکە ـ هامان ـ لە میسر نەبووە، لە ـ بابل ـ وەزیری ـ شا ئەحشوێرش ـ ی فارس بووە. لە نێوان فیرعەون و ئەحشوێرش نزیکەی ١٠٠٠ ساڵ جیاوازی هەیە.

وتم: تۆ وتت کات درەنگە کەچی ئەم پرسیارەت هەڵگرت بۆ کۆتایی کە ئەم وەلاّمە قسەی زیاتر هەڵدەگرێت چونکە بەلای ئێمەوە ئەم وەلاّمە نەك ئەوە دەسەلمێنێت کە ئەو دەرەنجامەی جەنابت پێی گەیشتویت هەڵەیە، بەڵکو ئەوە دەردەخات کە خودی ناوهێنانی ـ هامان ـ جۆرێکە لە جۆرەکانی ئیعجازی قورئان.

هەردوکیان چاویان تێ بڕیم و بێدەنگ مان، وتم:

باشە ئەگەر ئێستا بڵێم ـ کاوەی ئاسنگەر ـ ماڵیان لە تەنیشت ماڵی ئێمەیە کەستان دەتوانێت بڵێت وانیە ؟ چونکە کاوەی ئاسنگەر چەند هەزار

ساڵ پێش ئێستا بووە ؟ وتیان ناتوانین بڵێین وانیە . چونکە خۆ کاوە هەر یەك کاوە نیەو پیشەکەشی کە ئاسنگەریە بەرچاوە ...

وتم: بە کورتی بۆ ناڵێن لە ڕاستیدا لەیەکچوونی ناو هەیەو ئیتر من چ هەڵەیەکم نەکردووە.

بەڵام هەر ئاوا بەشێوەیەکی جەدەلی کۆتایی بە مەسەلەکە ناهێنم بەڵکو حەز دەکەمشۆڕببینەوە بۆ مێژوو. دەبێت بڵێین کێ دەڵێت کە هامان وەزیری فیرعەون بووە؟ واتە کێ دەڵێت هامان ناوە؟ ئەوەی کە لە ئایەتەکان وەردەگیرێت ـ هامان ـ ناوی پلەوپایەی دەستەڵاتە چۆن ـ فیرعەون ـ ناوی کەس نیە بەڵکو بە پاشاکانی سەردەمی ـ موسی ـ وتراوە ـ فیرعەون ـ بەڵام هەمان پلەوپایە لەسەردەمی حەزرەتی ـ یوسف ـ دا پێی وتراوە ـ پاشا ـ مەلیك ـ .

ئیتر کە زانیمان ـ هامان ـ ناوی کەس نیە بەڵکو پلەوپایەو دەستەڵاتە، کەواتە دەشێت ئەم ـ هامان ـ ە بدرێتە پاڵ هەر جێگرو وەزیرێك، هەرچەندە پانتایی زەمەن فراوان بێت.

کەواتە {إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ} کە دەکاتە پاشاو جێگرەکەی {وَجُنُودَهُمَا كَانُوا خَاطِئِينَ } (القصص:٨) ئەمە ڕایەکە وەك وتم ئێمە مێژوو دەگەڕێین بۆیە بەلاتانەوە ئاسایی بێت کە ڕای جیاوازیش بێتە سەر ڕێمان ئەو دەم ئێمە خۆمان ئازادین کامیانمان بەلاوە بەهێز بوو ئەوەیان قەناعەت پێ بکەین.

ئەوەی جەنابت پشتت پێ بەستووە بە زانینی ناوی ـ هامان ـ تەنها پەیمانی کۆنە لە ـ سفر أستیر ـ هەرچەندە پێش وەخت لەسەر ئەوە ڕێکەوتین کە نابێت

هیچ لایکمان کتێبی خۆی بکاتە مەرجەع بۆ بە هەڵە زانینی بەرامبەر بەڵکو دەبێت پشت بەهێزی بەڵگەو لۆژیك ببەستێت.

ـ سفر استیر ـ کە لەو تەوراتەدایە باس لەوە دەکات کە ـ هامان ـ وەزیری پاشا ـ ئەحشۆیرش ـ ی فارسی بووە ـ مردخای ـ جولەکەش هەر لەلای ئەم پاشایە بوو، کێشە کەوتە نێوان ـ هامان ـ ی فارسی و ـ مردخای ـ جولەکە . ـ مردخای ـ جولەکە توانی کچە سەرنج راکێشەکەی برازای کە ناوی ـ أستیر ـ بوو بدات بە پاشا، ـ هامان ـ هات قەناعەتی بە پاشا کرد کە هەرچی جولەکەی دەوڵەتی فارسیە بکوژێت، ئەمەش لەبەر ئەوەی زۆر کاری خراپ و ناجۆریان دەکرد.

بەڵام شاژنە ـ أستیر ـ و ـ مردخای ـ مامی توانیان ئەم بڕیارە بە پاشا هەڵبوەشێننەوە وەربگرە بڕیارێکی تازەشی پێ دەربکەن، بەوەی هەرچی لەگەڵ ـ هامان ـ دا بوون بکوژرێن. ئیتر پاشا ـ هامان ـ ی وەزیری کوشت و پیاوەکانی لەناو برد، لێرەوەجولەکە بەسەر فارسە نیشتمانیەکاندا سەرکەوتن، تا ماوەیەکی زۆر دەست بەکار بوون. لێرەوە ـ حاخام ـ ەکان ئەم کارەی ـ أستیر ـ یان بە پاڵەوانیەکی بێ وێنە لە قەڵەمداو کردیانە ـ سفر ـ ێك لە تەورات .

ئەمە باسی ـ هامان ـ ە کە تەورات ئاماژەی پێداوە، بەڵام زانایان ئەم باسەیان بە خەیاڵبازی وئەفسانە لە قەڵەمداوە، چونکە بەلای ئەم زانایانەوە ئەم باسە جگە لە تەورات هیچ سەرچاوەیەکی فارسی و غەیرە فارسی لێی نەدواون. هەردوو پەیامبەر(عـزراو نحمیا ) کەلەسەردەتای ئەوانەن کە لە ـ بابل ـ گەڕاونەتەوە باسیان لەدەستبەسەریەکەی ـ بابل ـ کردووە، بە هیچ جۆرێك خۆیا لەم باسە نەداوە ناوی ـ أستیر ـ یان نەهێناوە. هەروەها مێژوونوسی ئەغریقی

(هیرۆدۆتس) کە هاو زەمانی ـ ئەکزییس ـ بووە بەسەرهاتەکانی نووسیوەتەوەو باسی ـ أستیر ـ ی نەکردووە.

وەك پێشتر وتم: ئێمە مێژوو دەگەڕێین بۆیە رایەکی تریش هەیە ئەویش رای ـ د. مۆریس بۆکای ـ ە کە ئەم پێی وایە ـ هامان ـ ناوی سەرۆکی بینا سازان و پرۆژە گەورەکانی بیناسازیە. ئەو دەڵێت ـ هامان ـ کە ناوی لە قورئاندا هاتووە ئەوا گەورە بیناسازو تەلارساز بووە، کە کتێبی پیرۆز هیچی لەبارەی ئەم ـ هامان ـ ەوە نەوتووە.

هەستام بە نوسینی وشەی ـ هامان ـ بە زمانی هێرۆگلۆفی (زمانی میسریە کۆنەکان) نیشانی یەکێك لە پسپۆڕە تایبەتەکانی مێژووی کۆنی میسرم دا بۆ ئەوەی نەکەوێتە ژێر کاریگەری هیچ جۆرە بیروبۆچونێکەوە، ئەم وت لە قورئاندا هاتووە، وتم ئەمە لە بەڵگە نامەیەکی عەرەبیدا هاتووە کە مێژووەکەی بۆ سەدەی حەوتەمی زایین دەگەڕێتەوە پاش سەیر کردن وتی:

مەحاڵە ئەمە لە هیچ بەڵگە نامەیەکی سەدەی حەوتی زاییندا ناو هاتبێت، چونکە لەو سەدەیەدا هێشتا رەمزەکانی زمانی هێرۆگلۆفی حەل نەکرابون، هەر بۆ دڵنیا بوونی زیاتر و لێکۆڵینەوەی قوڵتر داوای لێکردم کە سەیری فەرهەنگی (ناوی کەسەکانی ئیمپڕاتۆریەتی نوێ) بکەم کە (لامنـد رانك) نووسیویەتی، کە سەیری ئەم فەرهەنگەم کرد دەبینم ئەم ناوەی تیایە بە خەتی هێرۆگلۆفی و بە زمانی ئەڵمانی نووسرا بوو، هەروەها مانای وشەکەش بە وەرگێڕدراوی کە ئاوا نوسرا بوو لە تەنیشتیەوە (سەرۆکی کرێکارەکانی کانە بەردەکان) ئەم ناوەش ئەو کاتە بەو کەسانە دەووترا کە سەرپەرشتی ئەو پرۆژە گەورانەی بکردایە. ئەو لاپەڕەیەم کۆپی کردو بردمەوە بۆ لای ئەو برادەرەی کە

یەکەمجار پێی وتم بیخوێنەرەوە، پاشان قورئانەکەم کردەوەو ناوی ـ هامان ـ م نیشاندا ئیتر سەری سوڕماو هیچی پێ نەووتراو بێدەنگ بوو.

هاتنی ئەم ناوە بەو شێوە سەرسوڕهێنەرە جێگای تێڕامانە بە هیچ شتێك راڤە ناکرێت ئەوە نەبێت کە بڵێین ئەمە مەعجیزەی قورئانە.

لە راستیدا هیچ لێکۆڵەرەوەیەك و مێژوو نوسێك ئاماژەیان بە ناوی ـ هامان ـ ی لای ـ فرعەون ـ نەداوە، هەروەك لەوە دەستە پاچەتربوون بتوانن وردەکاری ئەو سەردەمە کۆنەی میسر بەردەست بخەن چونکە نوسینی زمانی میسری کۆن بە خەتی هێرۆگلۆفی بووە.

وە لە دوای بلاّو بوونەوەی ئاینی مەسیحیەت خەتی هێرۆگلۆفی نەماو فەوتا. دواهەمین دەق کە بەو خەتە نوسرا بێت لە ساڵی ٣٩٤ز کە لەوەو دوا کەس نازانێت بەو خەتە بخوێنێت و بنوسێتەوە.

بەم شێوەیە بەردەوام بوو تا ساڵی ١٨٢٢ز کە زانای فەرەنسی ـ فراجان فرانسوا شامبلیۆن ـ توانی رەمزی ئەم زمانە حەل بکات کە لەسەر بەردی ـ الرشید ـ نوسرابون. ئەم بەردەش پێشتر لەلایەن ئەفسەرێکی فەرەنسی لە ساڵی ١٧٩٩ز لە میانەی هەڵمەتی سوپای ناپلیۆن بۆ سەر میسر لە گوندی ـ الرشید ـ دۆزرایەوە کە دەکەوێتە پارێزگای ـ البحيرة ـ ئەم دەقە بە شان و شەوکەتی فرعەون هەڵی دەداو بەهەر سێ زمانی ـ هێرۆگلۆفی و ئەغریقی و دیمۆتیکی ـ کە زمانی جلفەی میسریە کۆنەکان بو نوسرابۆوە. مێژووی نوسینی دەگەڕایەوە بۆ ساڵی ١٩٦ پێش زایین.

لە دوای حەل کردنی رەمزەکانی زمانی نوسینی هێرۆگلۆفی کە لەسەر ئەو بەردە کۆنانە نوسرابون، ئاماژەی روونی ئەوە دەرکەوت کە کەسێك زۆر لە

نزیکی فرعەونی سەردەمی حەزرەتی - موسی - ژیاوە ، بەرپرسی ئەو کۆشکانە یان بڵێین پلەی بەرزی لە حوکمدا هەبووە ناوی - هامان - بووە ، دوا جاریش دەڵێم یەکێك لەو بەردانە ئێستا لە مۆزەخانەی - هۆف - لە ڤییەننای پایتەختی نەمسا دانراوە.

ئازاد وتی:

مامۆستا ئێمە پرسیارمان لە چی کرد بەڵام تۆ بردینت بۆ کوێ؟!

وتم: ئاخر گرفتی سەرەکی ئەمەیە کە نەتەوێت وەڵامی تەواوت دەست بکەوێت.

یەکسەر وتی:

نیگەران مەبە بڕوا بکە سودمان بینی دیارە وەڵامی هەموو پرسیارەکان هەر بە گەڕانەوە بۆ قورئان تەواو نابێت دەبێت بگەڕێنەوە بۆ مێژوو، زمان، کەلەپوور، ... هتد .

سەربەست وتی:

مامۆستا کات درەنگە من خۆشحاڵ بووم بە قسەو باسی نێوانمان، پرسیاری زۆرم لا ماوە گەر بوارت هەبێت لە نزیکترین کاتدا یەکت دەبینین.

منیش ئامادەیی خۆمم بۆ دەربڕی وتیان با بزانین چۆن بۆمان دەگونجێت وەڵامت دەددینەوە.

تا بەردەرگاکە لەگەڵم هاتن، بەرێزەوە لە یەکتر جیا بووینەوەو بەو ئومێدەی لە نزیکترین دەرفەتدا بەیەکتر بگەین... هەر کە جێم هێشتن هەرچی پرسیارەکانیانە بە شێوەیەکی خێرا بە مێشکمدا دەهاتن و دەچوون. دەمزانی ئەمان بەس پرسیارەکانیان خوێندۆتەوە کە ئەو پرسیارانە دروست دەکەن.

ئەو پرسیارانە زادەی پێگەیشتنی خۆیان نەبوون، بۆیە کە وەڵامم دەدانەوە توانای ئەوەیان نەبوو بەرگری لە قسەکانی خۆیان بکەن. بەزەییم بەو جۆرە هەڵوێستانەدا دێتەوە بەڵام چی بکەم؟ ڕۆڵەی شارو گەل و وڵاتەکەمن ڕۆژگارێك لە بارودۆخێکی نەخوازراودا ڕێگای ڕاستیان لێ ون بووە ئەمڕۆ بە کوێرە ڕێگادا کەوتونەتە ڕێ، کوێرە ڕێگایەك کە نەك ئەمان بگرە ئەوانەی پێش ئەمانیش نازانن بەرەو چ کەندو هەڵدێرێکیان دەبات.

دوای پێنج ڕۆژ لە دواهەمین دیدارمان لە ماڵی کاك ئازاد، ڕۆژێکیان سەربەست تەلەفۆنی کردو وتی:

سبەینێ شەممەیە حەزمان کرد جارێکی تر پێکەوە دابنیشین و هەندێ قسەو باسی تر بکەین. ئەم جارە زیاتریشین، هەندێ لە خزمەکانی ئازاد حەز دەکەن بەشداری دانیشتنەکانمان بن، ئەگەر پێت باش بێت بەیانی لە ماڵی کاك ئازاد دادەنیشین؟

وتم: منیش پێم باشە. دەبێت دەرفەت دروست بکەم ئەگینا ڕۆژێك تا ئێوارە بۆ هەموو لا ماندوو بوونە، ئەمە لە لایەك لە لایەکی تر کە زۆر بووین باس و خواسی لاوەکی دێتە پێشەوە لە وانەیە نەتوانین مافی تەواو بە قسەو باسە سەرەکیەکانمان بدەین.

سەربەست وتی:

تازە ئەوان زانیویانە حەزدەکەن بەشدار بن، مەسەلەی دورکەوتنەوەش لەباسی سەرەکی ئەوە بە من بسپێرە، من خۆم پێشتر ئاگاداریان دەکەم یان لانی کەم لە مەجلیسەکەدا ناهێڵم کەس لە باسی سەرەکی لابدات.

ڕێکەوتین کە بەیانی سەعات هەشت لە ماڵی کاك ئازاد ئامادە بم.

شەممە سەعات حەوت و نیو ماڵم بەجێ هێشت بە ئومێدی لە کاتی دیاری کراودا لەوێ ئامادە بم یان لانی کەم هێندە دوانەکەوم کە نیگەران ببم. کە لە دەرگامدا ئەمجارەیان خێرا ئازاد دەرگاکەی کردەوەو فەرمووی ژوورەوەی لێکردم.

یەکسەر بردمی بۆ ژوورەکەی خۆی لەسەرەوە داینیشاندم و داوای لێبوردنی کرد کە درەنگ هەستاوە چونکە شەو درەنگ (رزگار)ی کوڕی پوری لەوێ بووە، تا درەنگ قسەیان کردووە بۆیە درەنگ هەستاوە .

یەکسەر کەسێکی تۆزێك قەڵەوی لە ئازاد بەتەمەنتر شانەیەکی بەدەستەوە بوو هاتە ژوورەوە. ئازاد وتی:

ئەمە رزگاری کوڕی پورمە... خۆشحاڵیم دەربڕی بە ناسینی. دیار بوو پێشتر منی پێناساندبوو بۆیە داوای ناسینی لێنەکردم.

وتم: با دەست پێ بکەین حەز دەکەم زوو دەست بەکار بین، تا بتوانین لەسەر زۆرترین بابەت قسەبکەین.

ئازاد وتی: ئێمەش پێمان خۆشە. بەڵام هێشتا ماومانە تریفەی خوشکی رزگار نەهاتووەو سەربەستیش کە دوێنێ لەگەڵمان بوو وتی منیش دێمەوە چاوەڕێ بکەن. ئێستا تا چایەکت بۆ دێنم ئەوانیش دێن.

پێشینەکەی راست دەرچوو، هێشتا چاکەم نەخواردبۆوە لە دەرگا درا. ئافرەتێکی هاوتەمەنی خۆی هاتە ژوورەوە دیارە ئەویش هەر زانیاری هەبوو لەو بوارانەداو بۆیە خۆشحاڵی خۆی دەربڕی بە بەشداربوونی دانیشتنەکە.

ئازاد وتی: تریفە کچی پورمە، خوشکی رزگارە.

هێشتا لە بەخێرهاتنی تریفە تەواو نەبوبوین کە ـ سەربەست ـ یش تەلەفۆنی کرد ،کەوا لەبەردەرگایە. لە زەنگ دەدات کەس لێی ناکاتەوە ... ئازاد داوای لێبوردنی کرد کە بەهۆی پچڕانی کارەباوە گوێمان لە زەنگ نەبووە.

ژوورەکەی ئازاد لەوە بچوکتر بوو کە بتوانین چوار کەس بۆ ئەو ماوە زۆرە تیایا قسە بکەن یان بە ئیسراحەت تیایا دابنیشن، بۆیە ئەمجارەیان فەرمووی ژووری میوانی کردین، کە زۆر گونجاو بوو وە بە لادانی پەردەی پەنجەرەکە ژوورەکە رووناك بۆوەو هەموو دانیشتین.

سەیرم کرد لە یەکتر ورد دەبنەوە، وەك بڵێی کامیان یەکسەر دەست پێ بکات بۆیە بە دەرفەتم زانی و وتم:

سەرەتا من خۆم ە خۆشحاڵ دەزانم کە ئاوا بەم جۆرە مێزی قسەو پەیڤین لەگەڵ یەکتر کۆی کردووینەتەوە. راستە تا رادەیەك کاك ئازادو کاك سەربەستم ناسیوەو دەزانم لەسەر چ هێڵێك کاردەکەن ئەوا بۆ ئەو دووبەڕێزەی تر (کاك رزگارو تریفە خان)نازانم بە چ باکگراوندێکەوە بەشدارمان دەبن بە لاّم دیارە هەرچۆنێك بێت جۆری پرسیارەکان باکگراووندەکان دەردەخەن ، لە لایەکی تر من هەست بە جۆرێك لە نا هاوسەنگی دەکەم لەم مەجلیسەدا.

سەربەست وتی:

بۆ هەر لەبەر ئەوەی تۆ خۆت بە تەنهایت و ئێمە چوار کەسین ؟! ئەگەر پێت خۆش بێت تۆش لای خۆت کەسانی تر بەشدار بکەیت ئەوا ئێمە بە لامانەوە ئاساییە .

وتم: ببورە کاك سەربەست تۆ ویستت شتێك بڵێیت کە من مەبەستم نەبوو. سوپاس بۆ خوا من لە خۆم رادەبینم ـ کە ئەمە ئازایەتی نیە ـ بەڵکو

ڕاستیەتی حەققانیەتی قورئانە کە خۆی لە خۆیدا بەهێزەو پێویستی بەوە نیە ژمارەی زۆر بخەنە پاڵیەك بەڵکو کەسێك خۆی شارەزا بێت ئەوا ئاساییە بە لایەوە وەڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە. من کە خۆم بە قوتابیەکی سەرەتایی دەزانم لە بواری زانستی شەرعیدا بەڵام ئەوەندە دەزانم ـ سوپاس بۆ خوا ـ قەناعەت بە بەرامبەر بکەم. مەبەستی من لە ناهاوسەنگی مەجلیسەکەمان ئەوە بوو کە دەبوایە هەردوو ڕەگەزەکە تەواوکاری یەکترن، هەردووکیان لە هەوڵی ئەوەدان کە کەم و کوڕیەکانی بەرامبەر داپۆشن لە میانەی ئەمکارەیاندا وەچەیەکی باش بخەنەوەو پەروەردەیەکی باشیان بکەن.

بۆیە گوتاری قورئان بە گشتی ئاراستەی پیاوان و ئافرەتان کراوە بەبێ جیاوازی. هەردوکیانی بە بەرپرس زانیوە کە جگە لە هەندێك جێگا کە قسە لەسەر تایبەتمەندی هەریەکەیان دەکات. ئەگینا بەیەك چاو سەیری هەردولایان دەکات ..

تریفە خان وتی:

من لای خۆم چەند تێبینیەکم لەسەر قسەکانی جەنابتان هەبوو.

ڕزگاریش بەپێکەنینەوە وتی: بڵێ ڕزگاری براشم.

وتم: دەی دیارە کە جەنابتان قسەکانی منتان قەبوڵ نیە منیش بۆیە ئەم قسانەم کرد. لە لایەك کە حەزم دەکرد دوو ئافرەتی تر بەشداریان بکردایە چونکە ئەوان خۆیان باشتر گوزارشت لە خۆیان دەدەن . نەك وەك ئەوەی لە دنیای دەرەوەی ئیسلامدا خەڵکانی تر لە جیاتی ئافرەتان بیردەکەنەوەو دەبنە وتەبێژیان و بگرە هێندە بە لاوازیان دەزانن بەرگریان لێدەکەن کە ئێمە ئەوەمان قەبوڵ نیە.

لە قورئان و سیرەدا ئافرەت خۆی کاراکتەری کارای داکۆکی لە ماف و بەجێهێنانی ئەرکی سەرشانی بووە. دواتریش بۆیە ئەم قسانەم کرد کە گۆمی بێدەنگی بشڵەقێنم و بکەوینە سەر باسەکەی خۆمان.

ئازاد وتی: با ئەو گۆمە من بیشڵەقێنم، پرسیارەکەم ئەوەیە. لە قورئانداو لە کۆتایی سورەتی (

الکهف ) دا قورئان باس لە ( ذو القرنین) دەکات و دەڵێت: رۆشتیت تا گەیشتە شوێنێك کەلەو شوێنەدا رۆژ لەناو سەرچاوە ئاوێك یان بڵێین کانیەکدا ئاوا دەبوو، پرسیارەکەم ئەمەیە چۆن ئەم هەڵە گەورەیە لە قورئاندایە ؟ ئەمە خۆی من دەخاتە ئەو قەناعەتەی لە سەرچاوەی هاتنی قورئان بەد گومیان بم .. ؟

وتم: ئەگەر قسەکەم لێ وەربگریت و لێم زویر نەبیت ئەوا دەڵێم ئەم قسەیەی جەنابت منی گێڕایەوە بۆ سەردەمی منالیم کەوام دەزانی خۆر لەودیو شاخی گۆیژەی سلێمانیەوە سەردەردەهێنێت و لەولاشەوە لە رۆژ ئاوای شاری سلێمانیەوە لای تاسلوجەوەو ئەولاییەوە دەچێتە پشت شاخەکان تا سبەینێ بەیانی.

رزگارو سەربەست و تریفە بزەیەك گرتنی بەلام نەیان ویست دۆخی ئاسایی مەجلیسەکە تێك بچێت بۆیە چاوەڕێی ئەوە بوون من وەلام بدەمەوە، منیش وتم:

ئەگەر بزەش بتانگرێت هەقی خۆتانە، بەلام نەك بە پرسیارەکەی ئازاد بەلکو بەو کەسەی تێنەگەیشتنی خۆی لە قورئانی پیرۆز کردۆتە پرسیارێکی

ئاوا نەشیاو تا ئەم برادەرەش لێرەوە لەبەر زیانی نەزانینی کەسی پرسیار دروستکار کەوت.

کاکە ئازاد ئەم باسەی جەنابت دەفەرمویت ئایەتی ژمارە ٨٦ ی سورەتی (الکهف) کە دەفەرموێت {حَتَّى إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ الشَّمْسِ وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِي عَيْنٍ حَمِئَةٍ وَوَجَدَ عِندَهَا قَوْماً} مەبەست لە ـ عین حمأـ واتە سەرچاوە ئاوێکی رەش واتە قورەکەی رەشە . تۆش وەك من دەزانی کە زانستی سەردەم ئەو شتەی بڕاندۆتەوە کە زەوی خڕەو بەدەوری خۆیی وخۆردا دەخولێتەوە، کاتێك کە رۆژ لەسەر شوێنێك ئاوا دەبێت مانای ئەوە نیە کە خۆر دەچێتە ناو ئەو شوێنەوە یان شوێنێکی ترەوە.

تریفە کە ماوەیەك بێدەنگ بوو یەکسەر وتی:

ئێستا ئەم پرسیارە گرنگە ئایا چ جۆرە دژایەتیەك هەیە لە نێوان ئەوەی کە قورئان باس دەکات لەگەڵ ئەوەی کە زانست پێی گەیشتووە، ئەگەر لەیەك نەچون و دژایەتیەك هەیە ئەوە بخەنە روو.

منیش وتم:

دەست خۆش ئەمەیان گرنگە. لە راستیدا نەك هیچ جۆرە دژایەتیەك باسی نیە بەڵکو بەد گومانی و بەخەیاڵدا هاتنیشی بواری تیایا نیە.

مەسەلە زانستیەکە رونە کە چۆنە. وە ئایەتە قورئانیەکەش باس لەوە دەکات کە لە چاوی خەڵکی ئەو شوێنەدا کە (ذو القرنین) چووە بۆ لایان خۆر لەو سەرچاوە ئاوەدا ئاوا بوو. دواهەمین بواری بینینی چاویان وای دەرخستووە کە خۆر لەوێدا ئاوا دەبێت، واتە خۆر لەو دەریاچە رەشەدا ئاوا دەبێت .

ئێستا من و تۆو هەریەکەمان لە قەراغ دەریا دانیشین وسەیری دیمەنی خۆرئاوا بوون بکەین ئەوا وا هەست دەکەین کە خۆر وردە وردە دەچێتە ناو دەریاوە، ئەمە بینینی چاوی ئێمەیە نەك ڕاستی خۆر ئاوا بوون لەو دەریاچە رەشەدا. قورئانیش دێت قسە لەسەر تێڕوانینی ئەو خەڵکە دەکات نەك ئەوەی وەك حەقیقەتی زانستی بیسەپێنێت و بڵێت خۆر دەچێتە ناو بیرێکەوە !!

سەربەست وتی:

من بیستورمە خەڵکی باسی (قولەی قاف) دەکەن وەك شاخێکی بەرزو گەورە. دوایی سەیرم کرد ئەم باسە پەیوەستە بە سورەتی (ق) لە قورئاندا {ق وَالْقُرْآنِ الْمَجِيدِ} تەنانەت کتێبی (عرائس المجالس)ی ـ الثعلبي ـ باسی لێوە کردووە .

وتم: پێشتر وتم کە نابێت کەس قسەی ئەم و ئەو بکات بە ماڵ بەسەر کەسەوە، قسەی نادروست و نەشیاو بەرەو ڕووی ساحێبی دەبێتەوە. قورئان چ پەیوەندی بەو باسەوە هەیە بە تایبەت خۆتان دەزانن ئەم سورەتە بە پیتە پچڕپچڕەکان دەستی پێکردووە. ئەمەش خۆی ماناو مەدلولی تایبەتی خۆی هەیە. بۆیە حەز دەکەم ئەم قسەیەی ـ الثعلبي ـ ڕوبەڕووی خۆی بکرێتەوەو ئەم کتێبەش لەلایەن زانایانەوە قەبوڵ نیە، پڕە لە شتی سەیرو سەمەرە کە هەرگیز ناکرێت بکرێتە ڕاڤەکاری قورئان و لەوێوە ڕاڤەی قورئان بکەین، داستان و ئەفسانەو شتی بێ بەڵگەو گۆترەکاری سەراپای کتێبەکەی داپۆشیوە. بۆیە هیوادارم کە لەم کونەوە مەیەنە ناو باسەکەوە، باسەکەمان ڕوبەری فراوانە.

رزگار کە هەروا بێدەنگ دانیشتبوو وتی:

بە یارمەتیتان من پرسیارێکم هەیە، وتم فەرموو:

وتی: لە ڕاستیدا هەرچی قورئان بخوێنێتەوە لە سەرەتاوە بۆ کۆتـایی ئـەوا شتێکی وای تیایا نیە کە گرەنتی لە ١٠٠٪ ئەوە بکات کـە بـچێتە بەهەشـت، لەوەش ناخۆشتر نیە کە ژیان بە ترس و دڵەڕاوکێ ـ دوارۆژ ـ بگوزەرێنیت .

پرسیارەکەی بە ئاقار بردنی مەجلیسەکەدا بوو بۆیـە چـەند سـاتێکی کـەم بێـدەنگی بـاڵی بەسـەر مـەجلیـسەکەماندا کێـشا، وتم بـزانم چـی دەگوزەرێـت کەسێکی تر قسەکە پشت ڕاست دەکاتەوە کەچی هەر بێدەنگی بوو بۆیە وتم:

لە ڕاستیدا ئەگەر جەنابت ورد قورئانت خوێندبێتەوە تێدەگەیت کـە بـەڵێ گرەنتی چونە بەهەشت هەیـە ... بـەڵام یـەك جیـاوازی هەیـە لەگـەڵ ئـەوەی لـە ڕۆژئاوادا پێیان وتووە بلیتی بەهەشت (صـکوك الغفـران) کـە ئـەوان بـە پـارە بەهەشتیان دەفرۆشت.

دیارە بەهەشـتیش بـەو گرانیـە هـەر بـەر دەوڵەمەنـدەکان دەکـەوت، بـەڵام تێڕوانینی ئیسلام وایە کە هەموو کەسێك بەبێ جیاوازی بە ویستی خۆی بـەڵام بە ـ کردەوە ـ ی خۆی بەهەشت و ڕەزامەنـدی خـوای گـەورە بەدەسـت دەخـات. ئـەوەی کـە جـەنابت بـیری لـێ دەکەیتـەوەو دەتـەوێت لەمیانـەی پرسـیارەکەتدا گوزارشتی لێ بدەیت. واتە هەر لە دنیادا تاك گرەنتـی ١٠٠٪ بـدرێتێ . ئـەوا دنیا پڕ دەبێت لە خراپەو تاوان و تاوانکاران، چونکە خۆمـان وتەنی ـ لەو دنیـا ـ بێ خەم بوون ئیتر چیان ئارەزوو کرد لە خراپە ئـەنجامی دەدەن چـونکە پـشت بەو (صکوك الغفـران)ە دەبەسـتن کـە بـە دەسـتیان هێنـاوە. بەمـەش شـیرازەی کۆمەڵایەتی فیکری، ڕۆشنبیری، سیاسـی ... هتـد ، کۆمـەڵگا هەڵدەتـەکێت . خۆشتان ئەم شتانە دەبینن لە پیاوانی ئایینی مەسیحی و جولەکە لە میانەی ـ لێ خۆش بوون ـ لە تاوانکـاران چـۆن ئـەنجامی دەدەن، لـە ڕاسـتیدا مـەسـەلەی

چونە بەهەشت نە بە حەزو ئارەزوی ئێمەیە و نەبە حەزو ئارەزوی گەلانی ترە بەڵکو ئەوە ـ کردەوە ـ یە دیاری دەکات {لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلا أَمَانِيِّ أَهْلِ الْكِتَابِ مَن يَعْمَلْ سُوءاً يُجْزَ بِهِ وَلاَ يَجِدْ لَهُ مِن دُونِ اللّهِ وَلِيّاً وَلاَ نَصِيراً }. (النساء:١٢٣) قورئان لە چەندین ئایەتدا باس لەوە دەکات کە هەر کەسێك مسوڵمانی دڵسۆزو گوێڕایەڵ بێت بۆ خواو پەیامی خواو بەو حاڵەوە دنیا بەجێ بهێڵێت ئەوا بەهەشتیە { وَالَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَداً وَعْدَ اللّهِ حَقّاً وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللّهِ قِيلاً}. (النساء:١٢٢) وە لە سورەتی (المائدة:٩) {وَعَدَ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ} وە سورەتی (مریم:٦١)دا {جَنَّاتِ عَدْنٍ الَّتِي وَعَدَ الرَّحْمَنُ عِبَادَهُ بِالْغَيْبِ إِنَّهُ كَانَ وَعْدُهُ مَأْتِيّاً} وە سورەتی (الفرقان:١٥) {قُلْ أَذَلِكَ خَيْرٌ أَمْ جَنَّةُ الْخُلْدِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ كَانَتْ لَهُمْ جَزَاء وَمَصِيراً} وەسورەتی (الزمر:٢٠) { لَكِنِ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ لَهُمْ غُرَفٌ مِّن فَوْقِهَا غُرَفٌ مَّبْنِيَّةٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَعْدَ اللَّهِ لَا يُخْلِفُ اللَّهُ الْمِيعَادَ} بەهەمان شێوە بێ باوەڕانیش گەر هەروا لەسەر ڕێتمی بێ باوەڕی بژین و بمرن ئەوا دۆزەخین .

وە لە یاساکانی قورئاندا ئەوە بەرچاوە کە دەیەوێت مسوڵمان لە نێوان (ترس و هیوا) ـ (الخوف والرجاء)دا بژی. بڕیاری بەهەشتی بونی یەکجاری نەدات چونکە ئەمە سەردەکێشێت بۆ خراپەو تاوانکاری وە بڕیاری چونە جەهەننەمی خۆشی نەدات چونکە ئەمەش سەر لە بێ هیوابون لە رەحمی خواوە دەردەهێنێت وە بێ هیوا بون لە قورئاندا حەرام کراوە.

بەم جۆرە کەسی بڕوادار کاری چاکە دەکات و داوا دەکات خوای گەورە جێگیری بکات و گەر گوناهیشی کرد خێرا پەشیمان دەبێتەوەو تەوبە دەکات.

وەهەرگیز بە کردەوەکانی خۆشی ـ مغرور ـ نابێت چونکە دەزانێت کردەوەکانی لەبارتەقای بەهەشتدا هیچ نین بۆیە چاوی لە رەزامەندی و لێخۆش بوونی خواییە. هەروەك لە کردەوەکانی خۆشی دەترسێت کە نەك ـ ریاو ـ ی تێبکەوێت یان وای لێ بکات بە خۆی سەرسام بێت. {وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوا وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ أَنَّهُمْ إِلَى رَبِّهِمْ رَاجِعُونَ }(المؤمنون:٦٠).

دیار بوو تریفە خان ویستی لای خۆیەوە گۆمی بێدەنگی خۆی بشڵەقێنێت بۆیە وتی:

لە راستیدا منیش پرسیارەکەم هەر ئاراستەی قورئانە قورئان بە چاوێکی جیا سەیری ئافرەتان دەکات واتە جیاکاری دەکات ـ التمییز ـ لەوانەیە بەڵگەی بەرچاوم بۆ ئەم قسانە ئەوە بێت لە ئایەتی ١١ ی (النساء)دا{ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ }زوڵم لە رەگەزی مێیینە دەکات کە تیایا رەگەزی مێ کەم سەیر دەکات و نیوەی بەشە میراتی پیاوی بۆ حساب دەکات .پرسیارەکەم ئەمەیە ئەگەر تێروانینی قورئان جیاکاری ناکات، بۆچی ئافرەت نیوەی پیاوان وەردەگرن ؟

وتم: سوپاس بۆ پرسیارەکەت. پێم باشە ئاوا هەر چیت هەیە بیخەیتە روو، بەڵام بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەبێت بەرێزت و باقی کاك ئازادو کاك سەربەست و کاك رزگار پشوو درێژتربن لەوەی کاتی زیاترمان دەوێت بۆ وەڵامدانەوە. ئەمەش بۆیە وا دەڵێم تا لە وەڵامی ئەم پرسیارەی تریفە خانەوە

چەند چەمکێك بخەمە روو وە هەندێ تێروانینی ئیسلام لەبارەی زۆر تێروانینی هەڵەوە راست

بکەمەوە. چونکە دەشێت لە وەڵامی ئەم پرسیارەوە وەڵامی کۆمەڵێك پرسیاری ترمان دەست بکەوێت. هەموو پاڵیان دایەوەو خۆیان بەسەر قەنەفەکاندا داو چاوەڕوانی ئەوە بوون جیا لە وەڵامەکانی پێشوو بە نەفەسێکی ترەوە وەڵام بدەمەوە. وتم:

ئەگەر بە وردی لە قورئان ورد بینەوە ئەوا دۆخی ئافرەت لە ڕوانگەی قورئانەوە لە چەندین خاڵی کۆنکرێتی دارێژراودا دەبینین. لەوانە:

یەکەم/ ئافرەت لە قورئاندا لە بەهاو پلەو پایەیدا هاوشانی پیاوە:

واتە لە تێڕوانینی قورئانەوە ئەو مەخلوقەیە کە ئەویش هەر وەك پیاوان هەر خوای گەورە خۆی دروستی کردووە. لێرەوە هیچ پلەبەندیەك نیە لە نێوان پیاوو ئافرەتدا لە ڕووی بەرزیو نزمی ئاست و پلەو پایەیانەوەو یەکسانن. بۆ شی کردنەوەی قسەکانم چەند باسێك دەخەینە ڕوو کە ڕاستی زیاتر ڕوون دەبێتەوە .

١/ لە کاروباری ئاییینیدا: یەکەمین دیمەن کە قورئان پیاوو ئافرەتی تیایا یەکسان کردووە مەسەلەی کاروبارە ئاییینیەکانی وەکو دروست بوونی هەریەکەیان، ئەرکە ئاییینیەکان، پاداشت و سزا.

أ- دروست بوونی مرۆڤایەتی(پیاوو ئافرەت):

قورئان بە هیچ جۆرێك ئەو باس و چیرۆك و ئەفسانانە لە خۆ ناگرێت کەوا لە شان و پلەو پایەی ئافرەت کەم بکاتەوە هەروەك ئەوەی لە تەوراتدا هاتووە. قورئان قەت لەوە نادوێت و بەراستی نازانێت کە یەکەمین ئافرەت کە خوا دروستی کرد پلەوپایەی لە پیاو کەمتر بوو. وەیان ئافرەت لە پەراسوی پیاو دروست بووبێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە قورئان دەفەرموێت( هەردووکتان -

ئافرەت و پیاو ـ لە یەك ـ نفس ـ دروست بوون {يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً} (النساء:١) وە لە سورەتی(الأعراف:١٨٩){هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا فَلَمَّا تَغَشَّاهَا حَمَلَتْ حَمْلاً خَفِيفاً فَمَرَّتْ بِهِ فَلَمَّا أَثْقَلَت دَّعَوَا اللّهَ رَبَّهُمَا لَئِنْ آتَيْتَنَا صَالِحاً لَّنَكُونَنَّ مِنَ الشَّاكِرِينَ}ئەم تێڕوانینەی قورئان تەواو پێچەوانەی تەوراتە کە لای وایە ـ حواء ـ شەیتانەو بۆ لە خشتەبردنی پیاوەکە ـ ئادەم ـ د. قورئان بە یەك ستایل و یەك جۆرە ریتم لە گەڵ پیاوو ئافرەت

دەدوێت، هەروەك لە کاتی ئەنجامدانی سەرپێچیەکەی ـ ئادەم و حوا ـ هەردوکیان وەکو یەك بە لێپرسراو دەزانێت بۆیە لەبەردەم ئەنجامدانی کارێکی لەو جۆرە هەردوکیان وەکویەك سزای دورکەوتنەوە لە بەهەشتیان بەسەردا درا.

ب ـ ئەرکە ئایینیەکان و پاداشت و سزا: قورئان کە پیاوان و ئافرەتانی بەیەکسان زانی لە روانگەی دروست بونیانەوە ئەوا لەبەردەم ئەنجام گەیاندن و نەگەیاندنی ئەرکە ئایینیەکاندا بۆ سزاو پاداشت دانەوە هەربەیەکسانیان دەزانێت.خوای گەورە دەفەرموێت { إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَالْقَانِتِينَ وَالْقَانِتَاتِ وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ وَالْخَاشِعِينَ وَالْخَاشِعَاتِ وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ وَالصَّائِمِينَ وَالصَّائِمَاتِ وَالْحَافِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيراً وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْراً عَظِيماً}(الأحزاب:٣٩) وەهەروەها {وَعَدَ الله الْمُنَافِقِينَ وَالْمُنَافِقَاتِ وَالْكُفَّارَ نَارَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا هِيَ حَسْبُهُمْ وَلَعَنَهُمُ اللّهُ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ}(التوبة:٦٨).

ج ـ ئەرکە ئەخلاقیەکان و پاداشت دان:

لەم خاڵەشدا قورئان زۆر بە روونی پیاوان و ئافرەتان بە یەکسان دەزانێت

{وَمَن يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتَ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُوْلَـئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلاَ يُظْلَمُونَ نَقِيراً}(النساء:١٢٤)

{مَنْ عَمِلَ صَالِحاً مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ}(النحل:٩٧)

{وَعَدَ اللّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللّهِ أَكْبَرُ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ}(التوبة:٧٢)

جا بەڕێزان ئەگەر لە تێڕوانینی قورئاندا پیاوان و ئافرەتان لە پلەوپایەو دروست بووندا یەکسان نەبونایە ئەوا هەرگیز لە ڕوانگەی ئەخلاقی و پاداشت دانەوەیان یەکسان نەدەبون قورئانیش ئاوا باسی نەدەکردن.

د- پەروەردەو فێرکردن:

لە ڕوانگەی قورئانەوە زانست و زانیاری نەك تەنها پاوانی ڕەگەزێکی دیاری کراوی وەك پیاوان بەتەنها نین بەڵکو ئەرکی سەرشانی هەر ڕەگەزەیانە کە بخوێنێت و زانست وزانیاری بەدەست بخات {اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ}(العلق:١) لامان سەیر نیە کە گوتاری ئاسمان بۆ سەر زەوی یەکەمین وشەی ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کە داوا لە هەردوو ڕەگەز دەکات بخوێنن، بەبێ هیچ جیاکاریەکی ڕەگەزی.

هـ - کەسایەتی یاسایی: مافی خۆیەتی، بەڵگەیەکی بەرچاوی تر کە تیایا ئافرەت و پیاو یەکسانن کە قورئان هەموو کەسێك پیاوو ئافرەت لەساتەوەختی هاتنەدنیاوە تامردن و دوای مردنیش مافی تایبەتی خۆی بۆ داناوە. ئەمەش پێچەوانەی تێڕوانینی ڕۆژئاوایە کە سەدەی ١٩ نەیدەهێشت ئافرەت بەبێ ڕەزامەندی هاوسەرەکەی کڕین و فرۆشتن بکات، قورئان چەندین

سەدە پێش ئەم بەرواره بڕیاری ئەوەی داوە کە ئافرەتان خاوەنی کەسایەتی یاسایی سەربەخۆی خۆیانن بە مانای وشە ئازادن لە مامەڵەکردندا.

{وَلاَ تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّلَ اللّهُ بِهِ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبُواْ وَلِلنِّسَاء نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبْنَ وَاسْأَلُواْ اللّهَ مِن فَضْلِهِ إِنَّ اللّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيماً}(النساء:٣٢)

لەبەرامبەر ئەمەشدا قورئان جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئەو دەمەی ئافرەتێك سنوری دیاری کراوی دەبەزێنێت و دەکەوێتە ناو تاوانێکی کۆمەلآیەتی وەك دزی، زینا، یاخی بوون... ئەوا وەکو پیاوان سزادان دەیگرێتەوەو هەڵنابودرێت.

هەروەها ئەگەر ئافرەت لە لایەکی ترەوە زوڵمی لێکراو مافی زەوت کراو ئازاری پێگەیشت ئەوا دەبێت مافی زەوتکراوی بسەندرێتەوەو هەروەها دەبێت مامەڵەی شایسەو شیاوبە کەرامەتی مرۆڤ لەگەڵ ئافرەتاندا ئەنجام بدرێت { يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ النِّسَاء كَرْهاً وَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ إِلاَّ أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئاً وَيَجْعَلَ اللّهُ فِيهِ خَيْراً كَثِيراً}(النساء:١٩)

دەبینین ئیسلام نەك بەتەنها لەگەڵ ئەوەدایە کە ئافرەت وەك پیاو مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت بگرە بە توندی دژی ئەوەش دەوەستێتەوە کە گوایە قورئان زوڵم لە ئافرەت دەکات هەروەك چۆن کتێبەکانی (تەورات و ئینجیل) زوڵمیان لێکردووە .

دووەم/ کۆمەڵگای دورەگەز نەك یەك ڕەگەز:

لەگەڵ ئەوەی قورئان ئافرەت و پیاو بە یەك چاو سەیر دەکات و هاوشان و یەك ئاست لە قەدرو ڕێزیان دەڕوانێت بەلآم لە ساتە وەختی دابەشکردنی ئەرك

و واجباتەکانیان ئەوا سەیری پێکهاتەو قەوارەی هەرلایەکیان دەکات و بە پێی ئامادەباشی و توانایی ئەرکەکان دابەش دەکات.

بە پێچەوانەی رۆژئاواوە کە دەرئەنجامی ئەو زوڵمە زۆرەی لە سەدە جیاوازەکاندا دژ بە ئافرەتان کراوە

بزوتنەوەیەکی فێمنیستی توندرەو هاتە سەر شانۆ کە لە هەوڵی یەکخستن و نەهێشتنی جیاوازی بوو لە جل وبەرگ و پێڵاو و کارکردن و هەڵس وکەوت و جوانکاری .... ئەم رەفتارەی ئەوان کۆمەڵگای بەرەو یەك رەگەزی برد. بۆیە لای ئەوان کارکردنی ئافرەت لە میانەی ماڵ و پێگەیاندنی نەوەکاندا بە چاوێکی تر سەیر دەکەن، ئەمەش وای کرد ئافرەت لە ـ مێ ـ بونی خۆی بێزار بێت و بیەوێت لە دەستی رزگار بێت، بەم جۆرە رۆڵی ئافرەت لە کۆمەڵگای رۆژئاوادا پوکایەوەو رۆڵ و ئەرکی سەرشانی ئافرەت کەوتە سەر شانی دام ودەزگای حکومی وناحکومی کە زیاتر بازرگانین.

بەلاّم تێروانینی قورئان بۆ کۆمەڵگا ئاوایە کە هەردوو رەگەز بەیەکەوە کاردەکەن هەریەکەیان رۆڵی دیاریکراوی خۆی هەیە.

بۆ نمونە ئەرکی سەرەکی پیاو لەدەرەوەی خێزان و دابینکردنی بواری ئابووری خێزانەو ئافرەتانیش پێگەیاندن و گەشەپێدانی رۆڵەکانی ئایندەیان لە ئەستۆیە هەڵبەت ئەمە بە شێوەیەکی گشتی ـ هەروەك ئەمە لە سورەتی (البقرة:٢٣٣)دا دەردەکەوێت{وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ وَعلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ لاَ تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلاَّ وُسْعَهَا لاَ تُضَآرَّ وَالِدَةٌ بِوَلَدِهَا وَلاَ مَوْلُودٌ لَّهُ بِوَلَدِهِ وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالاً عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا وَإِنْ أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُواْ أَوْلاَدَكُمْ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُم مَّا آتَيْتُم بِالْمَعْرُوفِ وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ}

نابێت فەراهەم هێنان وپەروەردەکردنی نەوەکانی ئاییندە کە لە لایەن ئافرەتانەوەیە بەکەم سەیر بکرێت، بەڵکو بەشێکی گرنگە لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا، قورئان ئەم هەڵوێستە بەرچاو دەخات و دەفەرموێت { هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا فَلَمَّا تَغَشَّاهَا حَمَلَتْ حَمْلاً خَفِيفاً فَمَرَّتْ بِهِ فَلَمَّا أَثْقَلَتْ دَعَوَا اللَّهَ رَبَّهُمَا لَئِنْ آتَيْتَنَا صَالِحاً لَنَكُونَنَّ مِنْ الشَّاكِرِينَ }(الأعراف:١٨٩) بۆیە تێڕوانینی قورئان وایە نە ـ پیاو ـ بوون جێی شانازی و فەخرەوە، نە ـ ئافرەت ـ بوون کەمی و خاڵی لاوازیە. ئەوە کەسەکانن لە ئەنجامی جێبەجێ نەکردنی ئەرکی سەرشانی خۆیان کەم و بچوك دەکەنەوە نەك ـ ڕەگەز ـ .

ئێستا با بێینەوە سەر جەوهەری پرسیارەکەی جەنابتان. کە بۆچی لە قورئاندا ئافرەت نیو ئەوەندەی پیاوە؟ وایە تریفە خان ؟

سەرێکی راوەشاندو وتی:

بەڵێ ئەمە پرسیارەکەیە.

وتم: لە راستیدا ئەم پرسیارەی جەنابت پێوەی دیارە کە خۆت لە دەرەنجامی خوێندنەوەی خۆت لەلات

گەلاڵە نەبووە، بەڵکو یەکێکی تر کردویەتی ئەمڕۆش جارێکی تر بەڕێزت روبەڕوی منی دەکەیتەوە.

دیار بوو ئەمیش حەزی بەم باسە نەبوو بۆیە وتی:

پرسیارەکە من کردبێتم یان پێش من گرنگ نیە، گرنگ ئەوەیە بۆ وایە؟! ئەمە جەوهەری باسەکەیە نەك سەرچاوەی پرسیارەکە.

وتم: بەڕێز نیگەران مەبە من بۆیە ئەم پرسیارە دەکەم تا ئەو هەلانەی کە تێی دەکەون و لە ئەنجامی پرسیارکردندا ڕوبەڕوی دەبنەوە کەم بکەنەوە. ئێستا من دەڵێم ئەمەی کە تۆ لات وا بێت لە قورئانـدا هەرچـی نـاوی ڕەگـەزی نێـرە دوئەوەندەی ڕەگەزی مێ میرات وەربگرێ ، تەنها لەبەرئەوەی پیاوەو ڕەگەزەکەی شەفاعەتی بۆ بکات شتی وا لە قورئاندا بونی نیە.

یەکسەر وتی: ئەی کەواتە بە چ حەقێك { لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ }ە ..؟

وتم: من ئەم پێشەکیەی پێشوم بۆیە بۆم باس کردی کە ڕەگەز لە قورئاندا ئەو گرنگیەی نیە شتێك قورئان ناوی نابێت ڕەگەزی سەرو یان ڕەگەزی خواروو، کاتێك لە قورئاندا باسی میرات دابەش کردن دەکرێت پشت لە ڕەگەز دەکرێت و سێ ـ إعتبار ـ ی تر یان سێ ڕەهەندی تر بە هەند وەردەگرێ، ئەوانیش:

یەکـەم/ ڕادەی دورو نزیکـی پلـەی خزمایـەتی کەسـی مـردوو بـە کەسـی میرات وەرگرەوە.

ئیتر گرنگ نیە هەرکام لەمانە ڕەگـەزیان چیە؟ نێـر یـان مـێ. بـە نزیـك بونەوەی خزمایەتی کەسی میراتگر لە کەسی مردووەوە ڕێـژەی میراتەکـەی زیـاد دەکات، وە پێچەوانەکەشی هەر ڕاستە.

کاك ڕزگار وتی:

مەبەست چیە ئەگەر بە نمونە ڕونی بکەیتەوە باشترە . . ؟

وتم: گەر ئافرەتێك مرد کچ و مێردەکەی لە پاش بـەجێماو بونـە میراتگـر ئەوا کچەکەی کە ـ مێ ـ بە نیوەی میراتەکەی بەردەکەوێت، مێـردی ئافرەتەکـە کە پیاویشە (١/٤) یەك لەسەر چواری بەردەکەوێت، لەبەر ئـەوە کـچەکەی کـە ڕادەی خۆیەتی لە مێردەکەی زیاتر لێوەی نزیکە .

دووەم/ شوێنی نەوەی میراتگر . . . مەبەست لەوەیە ئەو میراتگرانەی کە منداڵ و نەوەی نوێن ئەگەری دوچار بونیان بە ئەرك و دابین کردنی پێداویستی زیاترە لەو میراتگرانەی کە تەمەنێکیان سەرف کردەوە خۆمان وتەنی لە پایزی تەمەندان ئەمان ئەو خەون و هیوایەیان نیە کە نەوەی دوای خۆیان خەونی پێوە دەبینن. چونکە ئەو شتەی لەنەوەی رابردوودا خەڵکی یە ـ کمالیات ـ یان داناوە لە لای نەوەی نوێ دەبێتە ـ ضروریات ـ کە ژیا بەبێ ئەو ئەنجام نادرێت ئەمەش پێویستی بە داهاتی زۆرتر هەیە وەك لە نەوەی پێشووتر کە ژیان لە لایان ئاڵۆز نەبووە.

ئەم جارەش کاك ئازاد ویستی قسە بکات. وتم:

دەزانم نمونەت دەوێت بەسەرچاو. کچی کابرایەك کە وەفاتی کردوە ئەوا لە دایکی زیاتر وەردەگرێت ـ کە هەردوکیشیان ئافرەتن ـ بۆ... ؟ چونکە لانی کەم ٢٠ـ٣٠ ساڵ جیاوازیان هەیەو ژیان گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

هەروەها کچی کەسێکی مردوو لە باوکی زیاتر میرات وەردەگرێت خۆ ئەمیان پیاویشە. کەواتە جیاکاری لەسەر بناغەی رەگەزبوونی نیە.

سێیەم/ لە ئەستۆ گرتنی ماڵ و سامان و دابین کردنی خەرجی لە ئەستۆی کێیە؟

لەوانەیە جەوهەری پرسیارەکەی جەنابتان روو لەم مەسەلەیە بکات، کە لە روانگەی قورئانەوە ئەرکی بەڕێوەبردن و خەرجی ماڵ دەکەوێتە سەرشانی کێ ئەوە زیاتر میرات وەردەگرێت وەك لە کەسێکی تر کە ئەرکی پارەو سامانی لە ئەستۆدا نیە، گرنگە ئەوەش بزانیت کە قورئان ئەم حاڵەتەشی نەگشتاندووە ـ تعمیم ـ بەڵکو لە چەند حاڵەتێکی کەم و بچوکدا بە گوێرەی ئەرکەکە داینـاوە

ئەوەش دەزانین کە ئەگەر کەسێك مرد کورِوکچی لە پاش بەجێما ئەوا لە ئەستۆ گرتنی ئافرەتەکەو منالّەکانیشی دەکەوێتە سەرشانی نزیکترین پیاو لێوەی ، ئەو دەمەی ئافرەتەکە کەمیش میرات وەردەگرێت ئەوا لە زۆری براکەی زیاتر فریای دەکەوێت چونکە ئەم بەشەی خۆی داناوەو لەبەشی براکەی دەخوات. ئەو پارەیەی خۆی وەك جۆرێك ـ تأمین ـ لە لای دەمێنێتەوە بۆ ئاییندە.

ئەگەر لەو حالّەتە بچوکە ورد بینەوە ئەوا دەبینین کە پیاو لە چەند لاوە ئەرکی دابین کردنی خەرجی و مەسرەفی لە ئەستۆ دەکەوێت.

١ـ پیاو لەسەرەتای ژیانی هاوسەرێتیەوە. ئەرکی دابین کردنی مەسرەفی هاوسەرگیری و مارەیی دەکەوێتە ئەستۆ.

٢ـ لە حالّەتی هاوسەرگیریشدا دوبارە پیاو دەبێت ئەرکی مالّ دابین بکات هەرچەندە هاوسەرەکەشی دەولّەمەند بێت.

٣ـ هەروەها پیاو بەرامبەر بە خزمەکانی تری دەرەوەی مالّی خۆی لەناو خێزان و بنەمالّەدا جارێکی

تر چەندین ئەرکی بۆنەی کۆمەلاّیەتی و بەدەمەوە چونی و هاریکاری دەکەوێتە سەرشان.

هەر بۆ رونکردنەوەی زیاتری پرسیارەکەت و ئەو دەمەی ئەرکی دابین کردنی خەرجی و مەسرف لە نێوان هەردوو رەگەزدا وەك یەك وابون یان لەسەر شانی پیاوان لا چوو ئەوا ئەو دەم هەردوو رەگەزەکە یەکسان دەبن لە میرات وەرگرتندا نمونە ئەو دەمەی خوشك و برای دایکی دەبنە میراتگر ئەوا بە یەکسانی لە نێوانیاندا بەش دەکرێت {وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ

وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم مِّن بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلاَلَةً أَو امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ فَإِن كَانُوَاْ أَكْثَرَ مِن ذَلِكَ فَهُمْ شُرَكَاء فِي الثُّلُثِ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَى بِهَا أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَآرٍّ وَصِيَّةً مِّنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ}(النساء:١٢).

سەیر دەکەین لێرەدا ئافرەت و پیاو بە یەکسانی میراتەکە وەردەگرن .. بۆچی ؟ چونکە مەسەلەکە لێرەدا روحم و خزمایەتیە نەك لە ئەستۆ گرتنی خەرجی و مەسرەف .

بێدەنگ بونیان هانی دام کە زیاتر بچمە ناو بابەتەکەوە بۆیە وتم:

لەوانەیە ئێستا کۆمەڵێك راستی ئەم بوارەتان بۆ بخەمەروو لاتان سەیر بێت و پێشتر شتی لەو باسەتان نەبیستبێت.

کاك رزگار وتی: مەبەستت چیە ؟

وتم: مەسەلەی دابەش کردنی میرات چەندین حاڵەتی جیاواز لەیەکە. کە بۆم باسکردن ئەوسا دەزانن ئەو مەسەلەی جیاکاریەی کە تریفە خان باسی دەکات بونی نیە. وەك :

- تەنها لە ٤ حاڵەتدا ئافرەتان نیوەی میراتی پیاوان وەردەگرن.
- چەند قاتی ئەم حاڵەتە لە قورئاندا ئافرەتان وەك پیاوان یەکسانن .
- زۆر حاڵەتی جیاوازترمان هەیە کە ئەسڵەن ئافرەتان زیاتر لە پیاوان میرات وەردەگرن.
- حاڵەتی واشمان هەیە کە ئافرەتان میرات وەردەگرن و پیاوان بێ بەش دەبن .

ئەم جارەش کاك رزگار وتی:

مامۆستا ئەگەر بکرێت بۆ هەموو ئەمانە نمونەیەکمان پێ بدەیت، باشتر رون دەبێتەوە.

وتم:

یەکەم/ ئەو حاڵەتانەی کە ئافرەتان تیایا نیوەی میراتی پیاوان وەردەگرن، ئەمانەن:

١. کچ لەگەڵ براکانی کچی کوڕ لەگەڵ کوڕی کوڕ.

٢. باوك ودایك کە منداڵ بونی نەبێت و ژن و مێردیش بونیان نەبێت.

٣. خوشکی دایکی وباوکی لەگەڵ براکانیدا.

٤. خوشکی باوکی لەگەڵ براکانیدا.

دووەم/

ئەو حاڵەتانەی کە ئافرەتان هێندەی پیاوان وەردەگرن:

١. باوك ودایك لە حاڵەتی بونی کوڕی کوڕدا.

٢. براوخوشك لە دایکەوە.

٣. خوشك لەگەڵ براو خوشکانی دایکی.

٤. کچ لەگەڵ مام یان نزیکترین کەسی پشتی باوکی (ئەگەر کەسێکی تر نەبێت بێ بەشیان بکات)

٥. باوك لەگەڵ دایکی دایك وکوڕی کوڕ .

٦. مێردو دایك و دوو خوشکی دایکی و برایەکی دایك و باوکی(حەزرەتی عومەر- رەزای خوای

لێبێت - دوو خوشکی دایکی وبرایەکی دایك وباوکی کردۆتە شەریکی١/٣ - یەك لەسەر سێ -)

٧. لە حاڵەتی نەبونی کەسدا ئەوا دەشێت هەموو میراتەکە بۆ پیاوێك یان بۆ ئافرەتێك بەجێ بهێنێت. کوڕ ئەگەر بە تەنها بوو ئەوا هەموو میراتەکە بە - تعصب - دەبات وە - کچ - یش نیوەی میراتەکە بە - عصبة - و باقیەکەی تری بە - ردّ دەبات .

٨. مێرد لەگەڵ خوشکی دایکی و باوکی، خۆ ئەگەر پیاویش بێت ئەوا هەر ئەوەندە وەردەگرێت وەك ئەوەی ئافرەتێك مێردو برایەکی دایکی و باوکی لەپاش بە جێما، ئەوا مێردەکەی( ١/٢) ــ یەك لەسەر دوو - دەبات و باقیەکەی بە - عصبة - دەبات، خۆ ئەگەر مێردو خوشکی لە پاش جێما ئەوا مێردەکە( ١/٢) ــ یەك لەسەر دوو - دەبات و ( ١/٢) ــ یەك لەسەر دوو - وەکەی تر بۆ خوشکەکەیەتی.

٩. خوشکی دایکی لەگەڵ برای دایك وباوکی، ئەمەش وەك ئەوەی ئەگەر ئافرەتێك لە دوای مردنی مێردو دایك و خوشکێکی دایکی و برایەکی دایك و باوکی لە پاش جێما ئەوا مێردەکەی( ١/٢) ــ یەك لەسەر دوو - دەبات دایکی (١/٦) و خوشکی دایکی(١/٦) پاشماوەکەی بۆ برا باوك و دایکەکەیەتی کە ئەویش (١/٦)بە - عصبة - .

١٠. خزم و کەس وکاری دورتر لەوانەی پێشوو. ئەمانە ئەو خزمانەن کە بەشی دیاری کراویان نیە بەڵام مردووەکە لەمان نزیکتری نیە. وەك (

کچی کچ، کوڕی کچ، خاڵ، پور) ئەمانە بە هەردوو رەگەزەکەیانەوە بە یەکسانی میراتەکەیان بەسەردا دابەش دەکرێت.

١١. شەش(٦) کەس هەن کە بێ بەش نابن، ئەوانیش ٣ پیاو وە ٣ ئافرەتن، پیاوەکان (مێرد، کوڕ، باوك) لە ئافرەتانیش(ژن، کچ، دایك)

سێیەم/ ئەو حاڵەتانەی کە ئافرەتان زیاتر لە پیاوان وەردەگرن.

- مێرد لەگەڵ تاقە کچەکەیدا.
- مێرد لەگەڵ دوو کچەکەیدا.
- کچ لەگەڵ مامەکانی.
- ئەگەر ئافرەتێك مردو ٦٠ دۆنم زەوی لە پاش بەجێماو میراتگرەکانیش (مێرد، باوك، دایك، دوو کچ) بوون ئەوا بەشی دوو کچەکە ٣٢ دۆنمە واتە هەر یەکەیان ١٦ دۆنم وەردەگرێت، بەلاّم ئەگەر دوو کوڕی لەپاش بەجێمایە ئەوا هەریەکەیان ١٢,٥ دۆنمیان وەردەگرت بەشی دوو کچەکە (٢/٣) دوو لە سەر سێی میراتەکەیە، بەلاّم بەشە میراتی دوو کورەکە بە - عصبة - پاشماوەی بەشی خاوەن بەشەکانە.
- ئەگەر ئافرەتێك مردو دوای خۆی ٤٨ دۆنمی لەپاش جێماو میراتگرەکانیش (مێرد، دوو خوشکی دایکی وباوکی، دایك)بوون ئەوا دوو خوشکەکە لە(٢/٣) دوو لە سەر سێی پاشماوەکە دەبەن، واتە بەشی هەریەکەیان ١٢ دۆنمە، ئەمە ئەگەر کوڕ بونایە ئەوا هەریەکەیان ٨ دۆنمی بەردەکەوت، چونکە ئەوان لە دوای بەشی(مێرد، دایك)وە باقیەکەیان بە - عصبة - وەردەگرن.

- ئەگەر ئافرەتێك مردو دوای خۆی ١٥٦ دۆنم زەوی لەپاش جێماو میراتگرەکانیش (مێرد و باوك، دایك وکچ) بوون ئەوا کچەکە نیوەی میراتەکە ٧٢ دۆنمە وەردەگرێتبەلاّم ئەگەر لە جیاتی ئەم ـ کوڕ ـ بووایە ئەوا ٦٥ دۆنم زەوی وەردەگرت چونکە لە دوای مێردو باوك و دایکەوە پاشماوەی بۆ دەمایەوە.
- ئەگەر ئافرەتێك مردو ٤٨ دۆنم زەوی لە پاش بەجێماو میراتگرەکانیش بریتی بوون لە ( مێرد ، دایك، خوشکی دایکی و باوکی ) ئەوا خوشکەکەی ١٨ دۆنمی بەردەکەوێت، خۆ ئەگەر لە جیاتی ئەم خوشکەی برایەکی لەپاش جێبمایەو ئەوا ٨ دۆنمی بەردەکەوت، لەبەر ئەوەی ـ برا ـ کەی بە ـ عصبة ـ لە دوای خاوەن فەرزەکانی وەك (باوك، دایك، مێرد ) بەشی بۆ دەمایەوە، سەیرکەن لێرەدا کچەکە دوو ئەوەندەی ـ براکەی ـ وەردەگرێت .

لە راستیدا زۆرحاڵەتی تریش هەن بەلاّم با من هێندە لێتان ئاڵۆز نەکەم هەر ئەوەندە بەسە .

چوارەم/ ئەو حاڵەتانەی کە ئافرەتان میرات وەردەگرن و کەچی پیاوان تیایا بێ بەش دەبن .

- ئەگەر ئافرەتێك مردو لە دوای خۆی (مێرد ، باوك، دایك، کچ، کچی کوڕی) بوونە میراتگرو ١٩٥ دۆنم زەوی میراتی جێ هێشت ئەوا کچی کوڕ(١/٦ ) یەك لەسەر شەش دەبات کە دەکاتە ٢٦دۆنم، خۆ ئەگەر ئەم ئافرەتە کوڕی کوڕی لە پاش جێ بمایە ئەوا ـ کوڕەکە ـ

بە ـ عصبة ـ پاشماوەی بۆ دەمایەوە کە هیچ پاشماوەیەکیش بە جێ نامێنێت .

● ئەگەر ئافرەتێك لە دوای خۆی (مێرد ، خوشکێکی دایکی و باوکی، خوشکێك لە باوکەوە)ی بوونە میراتگری و میراتەکەش ٨٤ دۆنم بوو، ئەوا خوشکی باوکی (١/٦) یەك لەسەر شەش کە دەکاتە ١٢ دۆنم و خۆ ئەگەر لە جیاتی ئەمە (برای باوکی) بوایە ئەوا هیچی بەرنەکەوت چونکە (١/٢)ی بۆ مێردەکەی و نیوەکەی تری بۆ خوشکی باوکی دایکیەکەی و پاشماوەکەی بۆ براکەی دەمایەوە کەوا دەبینین هیچ بۆ براکەی نامێنێتەوە.

جا تریفە خان نمونە زۆرن بەلاّم خۆمان وتەنی مشتێك نمونەی خەروارێکە بۆتان دەرکەوت مەسەلەی دابەشکردنی میرات هیچ پەیوەندیەکی دوورو نزیکی نیە بە دابەشبوون و جیاکاری رەگەزی بەڵکو بەهۆی پێوەرێکی ستاندەر دابەش دەبێت.

رزگار سەیرێکی کردو وتی:

مامۆستا بڕوا بکە خۆ ئەگەر تریفەش پرسیارەکەی نەکردایە ئەوا من دەمکرد. بەلاّم سوپاس بە راستی من ئاوا بۆی رۆنەچو بووم.

وتم: زۆر ئاساییە بە لامەوە کەسێك شتێك نەزانێت، بەلاّم ئەوەم زۆر لا ناخۆشە کە ئاوا راستیەکان خرانە رو کەسێك هەستێت وەك نەبای دیبێت نە باران پشت لە هەموو ئەم راستیانە بکات و بڵێ (ئیسلام زوڵمی لە ئافرەت کردووە، بەوەی نیوەی بەشە میراتی بۆ داناوە) دەشێت تا نەبوونی زانیاری کەسێك عوزری قەبوڵ بێت، بەلاّم دوای پێگەیشتنی زانیاری دەبێتە مایەی

شەرم گەر یەکێك هەر ئاوا بە خوێن ساردیەوە بڵێت ئیسلام لە بەشکردنی میراتدا زوڵمی لە ئافرەت کردووە.

بەلاّم لەولاتریشەوە ئەم قسەیەم بە لاوە ئاساییە چونکە زۆر لایەن و رێکخراو و ناوەندی جیاجیا دروشم و زەمینەی خۆ ژیاندنیان بەم جۆرە قسانەوە گرێ داوە گەر وا نەڵێن ئەوا نانبڕاو دەبن.

سەربەست وتی:

لە قورئاندا کە باسی گوێرەکە پەرستەکانی سەردەمی - موسی- دەکات ئاماژە بەوە دەکات کە ئەو کەسەی بەم کارە هەڵساوە ناوی - سامري - بووە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا هەڵەیە، چونکە سامرە بە سەدان ساڵ لە دوای - موسی - وە دروست کراوە .. ؟

وتم:

هەڵەی ئەم پرسیارە لەوەدایە کەوا دەزانن ناوی - سامری - لە پێش دروست کردنی ئەم شارەدا بونی نەبوبێت. بەلاّم لە راستیدا هەڵەیەکی گەورەیە کە ئەوانەی ئەم پرسیارە دەوروژێنن بەسەریدا کەوتون چونکە - سامرە - ناوی هۆزە شارەکەش کە دوایی دروست کراوە بە ناوی ئەو هۆزەوە ناونراوە. هەر ئەم باسە لە کتێبی پیرۆزدا نمونەیەکی هەیە ئەویش ئەوەیە کە شاری - دان - پێشتر ناوی - لایش - بورە بەلاّم لە بەر پیرۆز داگرتنی ناوی ئەو هۆزە کە شارەکەی دوای کاول بون دروست کردەوە .

ئەمە خۆی وەلاّمێکی پەسەندە کە من لام وایە تەواوە. بەلاّم هەندێ رای تریش هەیە کە لای وایە - سامری - بە زمانی عیبری ئەوردەم بەکەسی گومڕاو سەرلێشێواو هاتووە. ئیتر هەردوو راکە وەلاّمی پرسیارەکەی جەنابتن.

ئازاد وتی: بە پێی قورئان ـ نمروود ـ فەرمانی داوە ـ إبراهیم ـ بخرێتە ناو ئاگرەوە

{ قَالُوا حَرِّقُوهُ وَانصُرُوا آلِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَاعِلِينَ . قُلْنَا يَا نَارُ كُونِي بَرْداً وَسَلَاماً عَلَى إِبْرَاهِيمَ }(الأنبياء:٦٨,٦٩)، بەلاّم بە پێی کتێبی پیرۆز ناگونجێت کە نەمروود لە سەردەمی ئیبراهیمدا ژیابێت. هەروەك لە (سفر التكوين: ٨/١٠، ١١ و ١٠/ ٢٢, ٢٥)دا باس کراوە.

وتم:

ناوهێنانی پاشای سەردەمی حەزرەتی ئیبراهیم کە دەڵێن ناوی ـ نمرود ـ بووە شتێك نیە قورئان ناوی هێنا بێت . ئەو بەسەرهاتانەی قورئان ئاماژەی پێداون زیاتر سەرنج بۆ ناواخن و پەندو ئامۆژگاری لێ وەرگیراوی رادەکێشێت زیاد لەوەی کە لە هەوڵی زەخرەفەکاری و بابەتی لاوەکیەوە بێت . بۆیە بە لای قورئانەوە گرنگ نیە کە کەسەکە کێ بووە گرنگ ئەوەیە کەسێکی یەکەمی دەسەلاّت بووە هەموو هێزو دەستەلاّتی خۆی بۆ روبەروبونەوەو نەیاری بونی پەیامی حەزرەتی ئیبراهیم بەکاردەهێنێت. جا ئیتر ناوی ئەم پاشایەو ماوەی دەستەلاّتی و ئەسڵ و فەسڵی لەو بابەتانەن کە کتێبە مێژوو و چیرۆك ئامێزەکان خۆیان پێوە خەریك کردووەو لە مەبەستی قورئانەوە دوورن .

ئەم باسانە دەکەوێتە ئەستۆی خۆیان قورئان لێی بەرپرسیار نیە. ئیتر لە پای چی لێرەو لەوێ شت کۆدەکرێتەوە بەزۆر بەسەر قورئاندا ساغی دەکەنەوە کە وەك وتم قورئان هیچ پەیوەندیەکی بە هەڵەو بۆچونی ئەو نوسەرو حیکایەتخوانانەوە نیە وە کاك ئازاد ئەگەر شتێکت لەلا گەلاڵە بووە ئەوا دەبێت

یەخەی ئـەو کتێبانـە بگـری کـە ئـەو ناوەیـان هێنـاوەو نـەئالێیت بـە گومـانی دروست کردن لەسەر قورئان.

سەربەسـت کـە زیـاتر خـۆی بـە دەفتـەرێکی بـچوکەوە خـەریك کردبـوو وەلاّمدانەوەی من و بێدەنگی ئەوانی بـە دەرفـەت زانـی کـە ئـەمیش پرسـیاری خۆی بخاتە روو وتی:

لە سورەتی(التحریم:١٢)دا دەڵێت: { فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا }ئەمـەش مانـای وایە کە ـ یسوع ـ خوایە چونکە بەشێکی دانەبڕاوە لە گیانی خوا!

وتم: تا ئێستا لە پرسیارەکانتا بە دوای وەلاّمێکدا دەگەڕای کەچی ئێـستا بە نیازی بە تیرێك دوو نیشانە بپێکیت. ؟!

وەلاّمەکەم بووە جێی سەرسوڕمان بۆیـە بـە ئاگاداریـەکی زیـاترەوە بۆیـان روانیم و ئازادیش خێرا وتی:

بۆ ؟!

وتم: ئێستا تۆ دەتەوێت لە لایەك مەسەلەی ئەفسانەو نارەوای بە خوابوونی حەزرەتی مەسیح ـ ع.س ـ

جێگیر بکـەیت. لـە لایـەکی تـریش ئـەم کـارە بـە خـراپ تەفـسیر کردنـی ئایەتەکەی قورئان دەکەیت . ئەمە یەك تیرە ئاراسـتەی دوو نیـشانەی دەکـەیت. ئەم کارەش نە بیروباوەڕە ئاڕاستەکەی بەخوا کردنـی حـەزرەتی مەسـیح ـ ع.س ـ پێ دەکرێت نە ئـەو دەسـتەواژە هەڵەیـەش بەدەسـتەوە دەدات گوایـە پـشتگیری کردنە کە بـەخواکردنی مەسـیح، چـونکە لـە تێڕوانینـی ئـاینی مەسیحیـشەوە ئەوەی کە ـ گیانی باوك ـ لەگەڵ گیانی رۆڵەی یەکی نـەگرتووە. بـەڵکو ئـەوەی کە یەکی گرتووە ـ علم ـ زانیاریەکەیە.

لەولاتریش ئەگەر سەیری قورئان بکەین ئەوا دەبینین کە وشەی ـ الروح ـ ی چەندین مانای زۆر دوور لەو مانایەی جەنابتانی خستۆتە روو .

بۆ نمونە بە مانای . الوحي .{وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحاً مِّنْ أَمْرِنَا مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ وَلَكِن جَعَلْنَاهُ نُوراً نَّهْدِي بِهِ مَنْ نَّشَاء مِنْ عِبَادِنَا وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ}(الشورى:٥٢)

یان بە مانای . جبریل . {نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ}(الشعراء:١٩٣)

بە مانای فریشتە گەورەکە لەو دنیا ریز دەبن{يَوْمَ يَقُومُ الرُّوحُ وَالْمَلَائِكَةُ صَفّاً لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ الرحْمَنُ وَقَالَ صَوَاباً}(النبأ:٣٨)

بە مانای گیانی ـ تاکەکەس .{وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً}(الإسراء:٨٥)

وە ئەمەی کە جەنابت باسی لێ دەکەیت و ئەو تەفسیرە هەڵەیەی لێ وەردەگرێت ئایەتەکە دەفەرموێت {فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا}(التحريم:١٢) هەروەك لە (الأنبياء:٩١) داهاتووە ئەوە راڤەی دروستی بە پێی سورەتی مەریەم ئایەتی (١٧. ١٩) دەبێت کە دەفەرموێت{فَاتَّخَذَتْ مِن دُونِهِمْ حِجَاباً فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَراً سَوِيّاً. قَالَتْ إِنِّي أَعُوذُ بِالرَّحْمَن مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيّاً . قَالَ إِنَّمَا أَنَا رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَاماً زَكِيّاً}لێرەدا فریشتەکە پێی راگەیاند کە ئەو پەیامهێنەرو گیانێکە لە لایەن خواوە نێردراوەو بەڵام لە شێوەی مرۆڤێکدا خۆی خستۆتە روو ، کەواتە ـ گیان ـ دروستکراوێکی خوای گەورەیە .

حاڵی حەزرەتی مەسیح لەم رووەوە وەك حەزرەتی ـ آدم ـ سەلامی خوای لێبێت وایە کە خوای گەورە لەبارەیەوە دەفەرموێت{فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُ سَاجِدِينَ}(الحجر:٢٩) حەزرەتی مەسیح هەروەك حەزرەتی ئادەم وایە ـ روح من الله ـ ن ئەوەی بۆ مەسیح کراوە پێشتریش بۆ ئادەم کراوە.

دیاربوو جۆرێك ئاڵۆزی و بەكارهێنانی چەندین دەستەواژەی تازەی تیایا بوو كە لەوانەبوو بە تایبەت كاك رزگارو تریفەخان پێی ئاشنا نەبن بۆیە بە جۆرێكی تر سادەم كردەوەو وتم:

لەوانەیە جەنابت وا تێگەیشتبێتیت كاتێك خۆمان بە یەكێك دەڵێین ـ روحەكەی ـ گیانەكەم ـ روحمی ـ بەهەمان كێش و پێوانە راڤەی قورئانی پێ بكەیت. نازانیت ئێمە لە لاشەو گیان پێك هاتوین روح بۆ ئێمە مانای ژیانە، بەڵام بەكارهێنانی ئەم دەستەواژەیە بەرامبەر بە خوای پاك و بێگەرد، لە رووی قورئانەوە نەشیاوە لە فەرموودەی پێغەمبەر(د.خ) هاتووە كە پێغەمبەر(د.خ) لە سوجدەدا دەیفەرموو ( سبوح القدوس رب الملائكة والروح) واتە ـ گیان ـ یش دروستكراوێكە لە دروستكراوەكانی تری خوای گەورە .

ئازاد وتی:

لە قورئانداو لە سورەتی (النساء:١٧١)دا هاتووە دەڵێت:{ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ}ئەمەش دیارە هەمان رای مەسیحیەتە كە ـ یەسوع ـ وتەی خوایە ـ بێگومان وتەی خوا هەر خوایە چونكە بەشێكی دانەبڕاوە لە خوا .. !!

وتم: خوای گەورە كە بە ـ وشە ـ ناوی بردوو لەبەر ئەوەیە كەلەبەر وشەی ـ ببە بوو ـ خەلق كراوە. دیارە نابێت مانای روكەشی لێ وەرگیرێت، چونكە خۆت وەك من دەزانیت كە حەزرەتی عیسا وشە نەبووە كەسێك بووە وك هەر كەسێكی ئاسایی خەوتووەو خواردویەتی چی بەسەر مرۆڤێكی ئاساییدا بگوزەرێت بەسەر ئەویشدا گوزەراوە. {إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِندَ اللّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِن تُرَابٍ ثِمَّ قَالَ لَهُ كُن فَيَكُونُ }( آل عمران:٥٩) ئیتر ئەم ئایەتە ـ وشە ـ ی راڤە

کردووە کە بریتیە لەوەی ـ ببە بوو ـ.حەزرەتی عیسا ـ وشە ـ ی خوا نیە بەلکو بە ـ وشە ـ ی خوا بووە .

ـ وشە ـ سیفەتێکی کامڵ و پەیوەست بە زاتی پەروەردگارەوە نەك جیا بۆوە لە زاتی خوا. بەلاّم حەزرەتی عیسا کەسێکی سەربەخۆو قەوارەیەکی ئازاد بوو کە دەهات و دەچوو وە خواردنی دەخواردو دەخواردەوە.

لە هەمان سورەتدا(النساء: ١٦٤) دەفەرموێت: { وَكَلَّمَ اللّهُ مُوسَى تَكْلِيماً }بێگومان ئەوە روونە کە خوای گەورە لەگەڵ ـ موسا ـ دا(ع.س)دواوە، ئایا دەتوانی بلێیت ـ وشە ـ کانی خوا کە ئاراستەی حەزرەتی ـ موسی ـ (ع.س) کرا بریتی بوو لە حەزرەتی مەسیح(ع.س) ..؟!

وەلاّم .... (بێ دەنگی) .

وتم: بۆ ئەوەی راڤەی ـ وشەکە ـ تایبەت نەبێت بە قورئان بزانن کتێبی پیرۆز لە بارەی ـ وشە ـ وە چۆن دەدوێت، بزانن لەویشدا ـ وشە ـ بە چەند مانا هاتووە.

١ـ بەمانای پەیمان و مژدەدان: هەروەك لە (ئەرمینیا: ٢٣/ ١٤ـ ١٦)دا:

(وا رۆژەکان دێن خوا دەڵێت: وشەی چاکیان بدەرێ کە پێشتر دراوەتەماڵی ئیسرائیل و یەهودا)

دەبینن دەڵێت ـ وشەی چاك ـ یان بدەرێ ئەگەر ـ وشە ـ بەشێك بوایە لە خوا ئەوا هەرگیز نەیدەگوت ـ وشەی چاك ـ چونکە خوا خۆی کامڵە . دەبینین ـ وشە ـ کە بە مانای مژدەی خێرە.

٢ـ ـ وشە ـ بەمانای هۆشیاری دان: هەروەك لە (حزقیال: ١٢/ ١٩)دایە.

(بە گەلی گوت ئەوەی گەورەتان خوا بە دانیشتوانی ئۆرشەلیم خاکی ئیسرائیلی گرت نان بە حەسرەتەوە دەخۆن بە دڵەڕاوکێش ئاو دەخۆنەوە، خاکیان هەژار دەبێت بەوەی کە بەرهەمی دەهێنێت ئەمەش بەهۆی زوڵمەوە ماڵە ئاوەدانەکان کاول دەبن زەوی قاقڕو هەژار دەبێت، ئەوسا دەزانن من خوام ... تا دەگاتە .. بۆیە پێیان بڵێ ئەوەی گەورەتان خوا هیچ قسەم دوا ناکەوێت، هەرچی ویستم دێتە دی . خواتان وا دەڵێت)

ئەمە تێڕوانینی کتێبی پیرۆزە بۆ ـ وشە ـ ئیتر تۆ چۆن خۆت لەمە رزگار دەکەیت و دێیت بەزۆر واتای ئایەتە قورئانیەکان بەو جۆرەی ك خۆت دەیخوازی دەشکێنیتەوە، بۆیە ببورە گەر بڵێم ئەم راڤەیە سەراپا هەڵەیە .

کاك رزگار وتی: لە قورئاندا باس لە شەوی ـ قدر ـ دەکات، هەروەك رەمەزانانیش بە تایبەت ١٠ شەوی کۆتایی خەڵك لە مزگەوت دەمێننەوە بۆ بەهرەمەند بوون لەو شەوە، چونکە هەروەك لە قورئاندا هاتووە خێری ئەم شەوە لە ١٠٠٠ مانگ زیاترە، ئەمەش ئەوەمان پێ دەڵێت کەوا ئەم شەوە کاتێکی دیاری کراوە بۆ گشت گۆی زەوی، بەلآم نەك من و تۆ بگرە هەر کەسێك بدوێنیت کە کەمێك خوێندەواری هەبێت دەزانێت، کە کاتەکان جێگیر بێت کات بەردەوام لە خاڵێکی جوگرافی دیاری کراوەوە دەگۆڕێت بۆخاڵێکی تر، ئەو دەمەی لە لایەك شەوە ئەوا لە لاکەی تر رۆژە، ئەمەش ئەوەمان پێ دەڵێت کە لە رووی زانستیەوە گەر نەڵێم هەڵەیە ئەوە ئاتاج بە چاو پیاگێڕانەوەیە.

وتم:

لە راستیدا کات لە جەوهەری خۆیدا هیچ جیاوازیەکی تیایا نیە. واتە گەر وەك شتێکی ـ مجرد ـ سەیری کەن ئەوا جیاوازی لە نێوان کاتێك و کاتێکی

تردا نیەو هەردووکیان لە رووی فەزڵ و بەهاوە وەکو یەك وان، ئێمە کە باس لە - کات - دەکەین مەبەستمان جولەی گەردوون و هەسارەکانە، نەك مانا فەلسەفیەکەی. ئەم کاتەی کە ئێمە دامانناوە، پێوەرێکی - إفتراضي - یە بۆ جوڵەی بونەوەر، شەوی قەدرو شەوی هەینی و رۆژی - عرفة - و رۆژانی رەمەزان ... هتد .

هەموویان خاوەنی یەك بەهایی خۆیی و حەقیقی خۆیی خۆیانن.

ئەمە سەبارەت بە کات خۆ ئەگەر بێینە سەر - شوێن - ئەویش لە زاتی خۆیدا هەموی وەکو یەك وایەو خاڵێکی تر لە رووی پێکهاتەو سروشتەوە لە خاڵێکی تر پیرۆزتر نیە. خاکی مەککەو عەرەفەوخاوەن یەك جۆرە خاك و پێکهاتەن، یەك بەهاو نرخیان هەیە. ئەگەر خاکێك لە خاڵێك جیاوازتر بێت، ئەوا تەنها لە رووی سازو لە باری بۆ کشتوکاڵ و بوونی مادەی خاوە.

کاك رزگار قسەکانی پێ خۆش بوو وای زانی ئەمە کۆتایی باسەکەیە یان ویستی بکاتە کۆتایی وەڵامەکەی. بۆیە وتی:

ئیتر من ناڵێم، کاتێك لە کاتێکی تر پیرۆزتر نیەو هەمووی وەکویەك وایە، کەواتە - لیلة القدر - مانای نیە ...!!

وتم:

وادیارە پێش من دەکەویت لە وەڵامدانەو حەز دەکەیت ئەوەی کە دەتەوێت من بیڵێم منیش ئەوەی بە راستی دەزانم دەڵێم بۆیە پێویستە کەمێکی تر گوێم لێ بگری تا بۆت روون بکەمەوە ئەو پرسیارەی جەنابت چۆن وەڵامم دەدەیتەوە .

بەرێزان: پیرۆزی ئەم کاتە لە کاتەکانی تر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە خوای گەورە لێرەوە سۆزو بەزەیی خۆی باراندوەو داواکانی قەبوڵ کردووە وە هانای بەندەکانیەوە هاتووە.ئیتر ئەم حاڵەتە کاتەکەی پیرۆز کردووە. ئەگینا کات لە جەوهەردا هەموویان وەکو یەك وان. کەسیان لە کەسیان پیرۆزتر نین، ئیتر ئەگەر تێگەیشتبن لە قسەکانم ئەوا ئەو بۆچونە هەڵەیەتان لە لا نامێنێت، بەم جۆرە ئەم شەوە پیرۆزە لە کاتی جیاجیا لە یەکتر بەسەر گشت دانیشتوانی سەر زەویدا دێت.

ئازاد وتی:

بۆ نمونەیەکت بۆ نەهێنایەوە تا باشتر تێ بگەین، حەز دەکەم تەواو تێ بگەین، چونکە لە راستیدا ئەم پرسیارانە بۆ تێگەیشتنن .

وتم: باشە. بەلاّم با بزانن ئەمانە نمونەی نزیك کردنەوەی مانان، ئێستا ئێمە لە فەرهەنگی ساڵوەگەری خۆماندا لە ماوەی ساڵێکدا کە ٣٦٥ رۆژە پڕن لە بۆنەی خۆش و ناخۆش، ٣/٥ راپەڕین، ٣/١٦ کیمیا بارانی هەڵەبجە، ٣/٢١ نەورۆز، مانگی ٤/ ئەنفالەکان، مانگی ٩ شەڕی بەردەرکی سەرا ... هتد.

خۆتان دەزانن ئەم بۆنانە هاتونەتە سەر رۆژەکانی ساڵ، بۆیە بونەتە بۆنە، ئەوەی کە چاك بووە ئەوا رۆژەکەی کردووە بە ئاهەنگ و خۆشی، ئەوەی کە خراپیش بووە ماڵوێرانی و کوچ و دەربەدەری بەسەرمان هێناوە، کەواتە رۆژەکانی ساڵ هەموویان وەکو یەك وان بەلاّم لە دەرەوەی ئەمان یان بلّێین ئەوە ئێمە خۆمانین رۆژەکانمان دەکەینە خەم و گریان یان شادی و خەندان. بە جیاوازی ئەوەی کە شەوی قەدر هەرگیز وەك ئەمانە بەراوورد ناکرێت چونکە

شـەوی فـەیزی رەحمـەت و بۆنـەی بـارانی میهـری پـەروەردگارە بـۆ سـەرجەم مرۆڤایەتی.

تریفە خان وتی:

دەبینن لە دنیای ئەمڕۆدا ئافرەت لەگەڵ پیاودا لەسەر سەرجەم بوارەکانی هونەر، زانست، بازرگانی، سیاسی، .... هتد . لەگەڵ پیاودا لە کێبڕکێدایە.

کەچـی قورئـان دەکەینـەوە(النساء:٣٤)دا دەڵێـت: {الرِّجالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّساءِ} ئایا تۆ لات وا نیە کە ئەم سیستم و یاسایە هی سـەدەکانی رابـردووە، بەکەڵکی ئەم سەردەمە نایەت.

وتم: پێش ئەوەی وەڵامی پرسیارەکەت بدەمەوە دەبێـت چـەند زانیاریـەکت بۆ راست بکەمەوە کە جەنابت دەرت بڕین. با بزانیت جگە لە کایەی ـ هونـەر ـ کە ئافرەت تیایا رۆڵی بەرچاوی هەیـە (هـەموو لایـەکیش دەزانـین بۆچـی ئـەم دەرگا فراوانە لەسەر ئافرەت خراوەتە سەرپشت) ئـەوا رۆڵـی ئـافرەت زۆر لـەوە کەمترە کە تۆ بیبیت بکەیتە جێگا شانازی هەر بۆ نمونە رێژەی بەشداری ئافرەت لەسـەرکردایەتی سیاسـیدا لــە ئەمەریکابــە پێــی راپــۆرتی خۆیــان (١,٥) تێناپـەڕێت ..!! بـۆ راسـتی قـسەکانم فـەرموو نـاوی یـەك سـەرۆك کۆمـاری ئەمەریکیم پێ بڵێ کە ئافرەت بوو بێت ؟

وەڵام .... !!!

ئەگەر بگەڕێینەوە سەر کرۆکی پرسـیارەکەت ئـەوا دەبێـت دوو وشـە هـەن لەیەکیان جیاکەینەوە بە مەبەست بێ یـان بـێ مەبەسـت تێکـەڵاویان نەکـەین. ئەوانیش وشەکانی (القوامة) و(الولایة)ن کە لە یەك جیاوازن .

قورئان باس لە بوونی ـ قوامة ـ دەکات: {الرِّجالُ قَوَّامُوْنَ عَلَى النِّساء}بەلاّم ئەوە ڕەت دەکاتەوە کە پیاوان ـ ولاية ـ تیان بەسەر ئافرەتانەوە هەبێت، مـافی ـ ولايه ـ ی بە هاوبەشی داوە بە هەردوکیان کە هـەردووکیان دەبێـت وەکـو یـەك لەگـەڵ یـەکتر بـەکاری بهێـنن {وَالْمُؤْمِنُـونَ وَالْمُؤْمِنَـاتُ بَعْـضُهُمْ أَوْلِيَـاء بَعْضٍ}(التوبة:٧١) ئەمەش لە شەریعەتدا پێی دەوترێت ـ ولاية المتبادلة ـ .

یەکسەر وتی:

جیاوازی چیە لە نێوان (القوامة) و(الولاية)دا..؟

وتم:

(ولايـة) بوون بەسەر کەس و شتێکدا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کـە ئـەو کـەس و شـتە کـەم و کورتیـەکی تیایـە کـە خـۆی ناتوانێـت هەسـتێت بـە ئەنجامـدانی کارەکانی خۆی بـەو جـۆرەی کـە پێویـستە بـە بـێ ڕەزامەنـدی ـ ولـي ـ ەکـەی، ئاشکراشە ئیسلام لە مافی ـ اهلية ـ پێداندا ژن و پیاوی یەکسان کردووە ئەگەر کامـڵ و تەواو بن، کەواتە لە حاڵەتی ـ کامـڵ ـ بووندا کەسـیان مـافی ـ ولايـة ـ بوونیان بەسەر ئەوی دیکەیاندا نیە، بەلاّم قورئان دوورتر لەمبابەتەش دەڕواو بە دەقـی {وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ}(التوبـة:٧١)ئـەوا بـۆ ئـەوەی هەریەکەیان (ژن و پیاو) لە کاتی پڕاکتیزەکردنی مـافی خۆیـدا دەستبەرداری ئەویتریان نەبێت و لە سنووری ئەخلاقی نەچنە دەرەوە داوا دەکات کـە پیـاو لـە کاتی پڕاکتیزە کردنی مافی خۆیدا بگەڕێتەوە بۆ لای ژن و ڕاوێژی پێ بکات و ڕێنوومایەکانی بە هەند وەربگرێت، هەروەها ئـافرەتیش لـە میانـەی پڕاکتیـزە کردنی مـافەکانی خۆیدا لە بواری دارایی و بگەڕێتەوە بۆ لای پیاوو ڕاوێژی پێ بکات و ڕێنومـاییەکانی بەهەند وەربگرێت .

بەلاّم (القوامة) بە مانای ئەوە دێت کەسێك هەستێت بە ئەنجامدانی کاری کەسێکی تر، بەلاّم لە رووی شەرعیەوە بەو مانایە دێت کە پیاو هەستێت بە چاودێری و پارێزگاری کاروباری ئافرەت و پاراستنی لە هەموو مەترسی و روبەروو بوونەوەی هەموو ئەگەرێکی خراپ کە روبەرووی ئافرەت دەبێتەوەو پشتگیری کردنی ئافرەت لە رووی مادی و مەعنەویەوە بە کورتی جیاوازی (القوامة) و(الولایة) لەوەدایە کە لە(القوامة)کەسایەتی ئەهلیەتی ئافرەت دوچار بە کەم و کورتی نایەت ، بەڵکو دەستبارو پشتگیری کردنی پیاوە لە دەرەوەی بازنەکە، بەلاّم لە(الولایة)دا پیاو دەبێتە دەمراست و وتەبێژی ئافرەت، کەم و کورتی ئەهلیەتی ئافرەت وەدەردەخات، لێرەوە جەنابتان دوچاری هەڵە دەبنەوە کەوا دەزانن کە پیاو بەهۆی بوونی(القوامة) دەتوانێت ببێتە خاوەنی هەق و لێرەوە هەرچی بە دڵی ئەو نەبێت هەڵی بوەشێنێتەوە، وە ئافرەتیش بەبێ پرسی پیاوەکەی نەتوانێت دەست بکات بەئاودا، کە ئەمەش بالاّ دەستی و کەڵەگایە نابێتە سیستی ژیانی ـ رحمە ـ و ـ مودە ـ کە قورئان داوای دەکات، کە تیایا ئافرەت کەرامەتی دەروشێت. ئێستا بۆتان روون بۆوە کە چەندە جیاوازی هەیە لە نێوان (القوامة) و(الولایة) کە هەرگیز (القوامة) بەو مانایە نیە کە ئێوە بیرتان لێ کردۆتەوە.

تریفە خان: بێدەنگی هەموانی بەدەرفەت وەرگرت، تا زیاتر مەسەلەکەی لەلا روون بێتەوە بۆیە پرسی:

باشە چی دەبێت (القوامة) بەدەست ئافرەتەوە بوایە ؟

وتم:

پێم خۆشە بۆ پرسیارەکە لەلای تۆوە بۆ منیش چاوەڕوانی ئاوا پرسیارێك بووم. بۆ وەلاّمی ئەم پرسیارە دەبێت پرسیارێکی جەوهەری بوروژێنین ئەو دەم وەلاّمی پرسیارەکەت گەر راستەوخۆش نەدەمەوە خۆت لێی هەڵ دەهێنجیت. ئایا هەریەکە لە پیاو ئافرەت کامیان توانای روبەرووبونەوەو دوورخستنەوەی مەترسیەکانیان هەیە کەماڵ و خێزان دوچاری دەبێتەوە ؟ پێش ئەوەی باس لە قورئان و ئایین بکەین ئەوا ژیان و یاساو کۆمەڵگە پێمان دەڵێن ئەوە پیاوانن بەهۆی ئەو جۆرە لە ئامادەباشیە دەرونیە، لاشەییەکەی کە هەیانە لە سەنگەری پێشەوەی روبەروونەوەی قەیران مەترسیەکانن کە خێزان و ماڵ و دوچار بە نارەحەتی دەکات.

ئایا ئەو دەمەی ژن و پیاو لە ماڵدا بە ئارامی لە نیوەی شەودا خەوتوون لەپڕ لە دەنگی تەپەی پێ و خزینگەی دەستە کلیل و تارمایی کەسی نەناسراو بەخەر دەبنەوە سەیر دەکەن دز هاتۆتە سەریان، دەیەوێت ماڵیان بدزێت، کێ خێرا رادەپەڕێت خێزان دەپارێزێت دزەکان راودەنێت ؟ ئایا کەس هەیە وەلاّمی ئەمە ئەزانێت ؟ رزگار بۆ ئەوەی کەش و هەواکە خۆشتر بکات و وتی:

لە ماڵی ئێمە بە هاتنە ژوورەوەی مشکێك فەوزا دروست دەبێت! چ جای دزێك ..!

هەموو پێکەنین ... .

وتم: دیارە پیاو بەهۆی ئەو - فطرة - دیەی کە تیایەتی بەم کارە هەڵدەستێت کە پاراستنی ماڵ و خێزانە لە مەترسی، بەلاّم ئافرەت خۆی دەداتە پاڵ پیاوەکەی و دەیکاتە پارێزەری خۆی، ئەمە - قوامە - یە کە شتێکی

سروشــتیەو لــە هــەموو دونیــادا بەرچــاوە. شــتێك نیــە قورئــان بیــسەپێنێت، لەلایەکی ترەوە جەنابت هەر ئەوەندەت باس کردو ئایەتەکەت تەواو نەکرد ..؟!

تریفە: هەر ئەوەندە بوو ..!

وتم: نا، ئایەتەکە کۆتایی دێت {...بِمَا فَضَّلَ اللّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ ...} کە ئەمەش دوو خاڵی گرنگ دەخاتە پێش چاو نابێت لێـی بێ ئاگا بین.

یەکــەم/ ئــەوەی کــە دەفــەرموێت: {بِمَا فَضَّلَ اللّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ} مەبەست لەوە نیە کە ئەمیان لـە خـواوە نـزیکترە، یـان ئـەمیان پلەوپایـەی لـە کۆمەڵدا لە ئافرەتان بەرزترە لەوانەیە ئافرەتێك لە زۆر پیـاو باشـترین لـە خـوا نزیکتر بێت وە لەوانەیە ئافرت پلەوپایەی وای هەبێت کـە نـەك زۆربـەی پیـاوان بگرە کەمێك لە پیاوانیش هاوتای نەبن. مەبەست لە ـ افضلیة ـ باس لە لاشـەو دەرون و ئامادەباشــیە کــە خــوای گــەورە بــەو دوو رەگــەزەی بەخــشیوە، کــە هەریەکەیان بۆ مەبەستێکی دیاری کراوە.

دووەم/ {وَبِمَا أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ}یاد خستنەوەی ئەوەیە کە مەسەلەی خەرجی و دابین کردنی بژێوی خێزان لە ئەستۆی پیاودایـە نـەك ئـافرەت، یاسـای نێـو دەوڵــەتیش دەڵێــت: ئــەوەی خــەرجی بکێــشێت سەرپەرشــتیش دەکــات. دنیــا هەمووی لەسەر ئەم سیستەمە دەڕوات کە ـ لازم و ملزوم ـ ی یەکترن بریتیە لـە خەرجی کێشان و سەرپەرشتی کردن.

دیار بوو تریفە خان سوربوو لەسەر ئـەوەی کـە ئـەم باسـە جـێ نەهێڵین تا هەرچی هەیەتی لەم بارەیەوە بیخاتە روو، بۆیە وتی:

لەوانەیە ئافرەت هەبێت زۆر لە پیاوان باشتر ماڵ لە ڕووبەڕوونەوەی مەترسی بپارێزێت و دەشێت پیاوی واش هەبێت ترسنۆك و بێ دەستەڵاتتر بێت لەوەی ڕووبەڕوی مەترسیەکان ببێتەوە، یان ئەوەتا هێندە فەقیرە کە ناتوانێت خەرجی ماڵ بکێشێت و بژێوی دابین بکات، ئەی بۆ ئەمەیان دەڵێی چی ؟

وتم:

قسەکەت جوانە بەڵام ئەگەر بزانیت جەنابت بۆ هەردوو وشەی(لەوانەیە، دەشێت) ت بەکار هێنا، کە ئەمانە ئاماژە بە ریزپەڕ ـ شاذ . بوون دەدەن، ئێمە قسەکانمان لەسەر ڕەوتە گشتیەکە بوو نەك ـ شاذ ـ بەڵام بابزانیت کە لە گەردووندا هەر یاسایەکت بدۆزیتەوە، ئەمەش لەناو یاساکانی گیانداران و سروشت و دەریاوانیدا بەرچاوە، هەروەك لە سروشتی هەموو کۆمەڵگایەکدا ئەم حاڵەتانە هەن .

لە حاڵەتی بوونی ـ شاذ . دا ئەوا حوکمی تایبەت بە خۆی بۆ دەردەکرێت، کەوابێت نەبێتە مایەی

دەستدرێژی کردنە سەر حوکمە گشتیەکە. ئەگەر لە خێزانێکدا پیاوێکی وا هەڵکەوت کە لە کەسایەتی و دەرونیدا لێوەشاوەیی و شیاوی نەبوو، وەهاوسەرەکەشی بە هەمان جۆر وێنەی ژنانی هاوشێوەی خۆی نەبوو ئەو خەسڵەتانەی کە بۆ بەڕێوەبردنی خێزان پێویستن لە ئافرەتەکەدا بوو ئەوا ئەو حاڵەتە ئافرەت ـ قوامە ـ وەردەگرێت، ئەمەش دیارە لە چانس بەرزی پیاوە کە لە ناو ئافرەتاندا ئەو خەسڵەتانەی لەمدا نین لە هاوسەرەکەی دا بوونی هەیە .

ئەمەش شتێکی دانسقەیە کە بتوانن هەموویان لەیەك خێزاندا کۆببنەوە، بەڵام من ئەم پرسیارە لە جەنابت دەکەم. ئایا پێتان ڕەوایە لەبەر ئەوەی نەوەك

حاڵـەتێکی دەگمـەن و دانـسقە هەیـە هەسـتین سـەراپای ڕێـسا گـشتیەکە هەڵوەشێنینەوە ؟

وەڵاّم: ..... .

ئەگەر ڕێسا گشتیەکە هێندە بەبەزەیی بێت چاوی لـەوە بێـت کـە حاڵـەتی دەگمەن و دانسقە ڕوو دەدەن ئەوا ئەم بە ئارامی وەڵاّمـی بداتـەوەو حـسابی بـۆ بکـات. ئەمـە چ لۆژیکێکـە کـە حاڵـەتی ـ دەگمـەن و دانـسقە ـ داوای سـەراپا گۆڕینی ڕێسا گشتیەکە بکات. ئایا ئەمە خۆی لە خۆیـدا جۆرێـك لـە ناهـەقی نیە .... .

کۆتایی ئەم باسە بـەوە دەهێـنم کـە مـادام ژیـان و گـەردوون هەیـە، ئـەوا هەردوو حاڵەتە گـشتی و دەگمەنەکـە بوونیـان دەبێـت ڕاستیەکە دەبێـت دانـی پیایا بنێین گەر خوازیاری ڕاستی و دادپەروەربین .

لەدەرگادانی دایکی کاك ئازادو هاتنە ژوورەوەی بە سینیەك چاوە، جۆرێك پـشێوی پـێ بەخـشین، هەسـتمان کـرد پـشویەکی پێویـست بـوو، تریفـە خـان ئیجازەی وەرگرت کە دەچێت یارمـەتی ـ پوری ـ دەدات بۆیـە ئـیتر ئێمـە هـەر چوارمان ماینەوە، لە سیمایاندا دیار بوو پرسیاری تایبەتیان هەیە بۆیـە کـاك ئازاد وتی:

لە ڕاستیدا من پرسیارێکم لە مێشکدا بوو، بەڵاّم حەزم نەدەکرد ڕووبەڕوی تریفە خان بیخەمە ڕوو، ئەویش ئەوەیە کاتێك قورئاندەخوێنیتەوە سەیر دەکەین لە زۆر وێنەی جیاجیادا باس لەوە دەکات کـە بەهەشـت جێگـای حەوانـەوەو بـە ئاکام گەیشتنی حەزەکانە، یەکێك لەوانە مەسەلەی ئافرەتە.

وەك رەگەزێکی سەرەکی لـە رەگـەزەکانی حـەزی مـرۆڤ ئامـاژەی پێـدراوە. بەلاّم لەبەرامبەردا ئەگەر ئافرەتان نەك وەك پیـاوان بگـرە دە ئەوەنـدەی پیـاوان چاکەکار بن ئەوا هیچ ئاماژەیەکی وای تیایا نیە کە ئەمانیش بواری تێرکردنی ئەو حەزەیان هەبێت، واتە بە کوردیەکەی حەزی ئافرەت پەردەپۆش کـراوە، وەك ئەوەی ئافرەت خۆی حەزی نەبێت بەلّکو تەنها جێگای حەزی پیاوان بێت .

وتم:

پێش ئەوەی وەلاّمت بدەمەوە سوپاسی زەوقـت دەکـەم. کـە هێنـدە ناسـکە دەزانیت کە هەریەکە لە رەگەزی نێرو مێ چەند تایبەتمەندیەکیان هەیە کە حـەز ناکەن ئـاوا بـێ پـەردەی زەق و ئـەدەب شـی بکرێتـەوە ئـەم تایبەتمـەن ناسینە جێگای رێزە، با نمونەیەکت بۆ بهێنمەوە لـەوێوە بـچنە نـاو باسـەکەمانەوە، وای دابنێن ـ إن شـاء الله کە هەر ئاواش دەبێت ـ تـۆ خێزانێکـت هەیـە چـەند کـوڕو کچێ لە هەڵسوکەوت و مامـەڵەوخوێندنیان رازیـت، تەمەنیـشیان لـە تەمـەنی ئەوەدایە کە هـەردوکیان بـچنە نـاو کـەژاوەی هاوسـەرداریەتیەوە، ئایـا هەسـت دەکەیت هیچ بەربەستێك هەبێت لەوەی کە بە کوڕەکەت بڵێی :

مادام ئاوا گوێڕایەڵیم دەکەیت و لە خوێندن و ژیاندا سـەرکەوتویت، حـەز دەکـەم کـچێکی باشـی جوانـت بـۆ بدۆزمـەوەو بیکەمـە هاوسـەرت تـا زیـاتر بەختەوەر بیت.؟

بێگومانم کە هەست ناکەیت هیچ بەربەستێکت لەبەردەمدا بێت بۆ ئەوەی ئەم قسەیە نەکەیت، وە کوڕەکەشت بـەم قـسەیە زۆر دڵخـۆش دەکەیت،بـەلاّم بـا بەڕاستی لەگەڵ ناخی خۆمان بدوێین.

جەنابت دەتوانی هەمان جۆر لەگەڵ کچەکەتدا دانیشیت و پێی بڵێی پیاوێکی باشی قۆزت بۆ دەدۆزمەوەو دەتدەم بە شو .

بێگومانم کە زەوق ناسکی و ـ هەستی بەرامبەر خوێندنەوەی بەرزت ڕێگرە لەوەی ئاوا ـ بێ پەردە ـ ئەم باسە لەگەڵ کچە خۆشەویستەکەتدا بخەیتە روو. چونکە لانی کەم خۆت کچەکەی خۆت دەناسیت ـ بابەدڵ حەز بکات ـ بەڵام لەباسکردنی روبەرویدا زۆر ـ ئیحراج ـ دەبێت و پێی خۆش نیە ئا بەم جۆرە خزمەتی بکەیت، خۆ ئەگەر یەکێك پشت لە هەموو ئەم ڕێساویاسایانە بکات و بیەوێت ڕاستەوخۆ لەگەڵیدا باس کات، ئەوا کچەکە لانی کەم سەردادەخات و جێی دەهێڵێت و وەڵام ناداتەوە.

دیارە لەمەوە بۆت دەردەکەوێت کە چەندە جیاوازی لە نێوان کوڕو کچەکەتدا هەیە. لەگەڵ کوڕەکەت ڕاستەخۆ دەکەویتە ئاخاوتن و کەچی لە باسکردنی ئەم بابەتە لەگەڵ کچەکەت خۆت دەبوێریت و ئیحراجی ناکەیت، یان ئەوەتا جەنابت هێندە هەستی بەرامبەر دەناسیت و روبەڕووی ـ تریفە خان ـ پرسیار ناکەیت. ئەمەش خۆی لە خۆیدا زانینی تایبەتمەندیەکی کەسایەتی و سایکۆلۆژی بەرامبەرە، ئیتر بۆ لەمەوە رەخنە لە قورئان دەگریت لە کاتێکدا ئێوە خۆتان وەك من دەزانن هۆکاری باسنەکردنەکە چیە، یان بۆ نایگێڕیتەوە بۆ ڕێزگرتن لە تایبەتمەندی و دەیخەیتە پاڵ ئەوەی کە قورئان ڕێز لە ئافرەتان ناگرێت. بەڵام بە هیچ جۆرێك لۆمەی خۆمان ناکەین ئەگەر بە هەمان شێوازی قورئان مامەڵە بکەین. بەخشش و ڕێزلێنانی خوا بۆ بەندەکانی بۆ هەردوو رەگەزەکەیە بەبێ جیاوازی لە دنیاو ئاخیرەتدا. جا ئیتر ئەمەی بە ئاشکرا باس کردبێت یان نا، خۆ ئەوانەی کە بۆ پیاوانی باسکردووەو باسی ئەوەی

نەکردووەکە ئافرەتانیش بەهەمان جۆر بەهرەمەند دەبن ئەوا تا فێری ئەوە ببێت کە چۆن بە زەق ناسکی و مامەڵەی شیاوە لەگەڵ ڕەگەزی بەرامبەرت بدوێت، خوای گەورە دەفەرموێت:{وَأُزْلِفَتْ الْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ غَيْرَ بَعِيدٍ (٣١) هَذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٍ (٣٢) مَنْ خَشِيَ الرَّحْمَنَ بِالْغَيْبِ وَجَاءَ بِقَلْبٍ مُنِيبٍ (٣٣) ادْخُلُوهَا بِسَلامٍ ذَلِكَ يَوْمُ الْخُلُودِ (٣٤) لَهُمْ مَا يَشَاءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ }(ق:٣١،٣٥) کەواتە لە بەهەشتدا هەریەکە لە پیاوان و ئافرەتان ئەوەی حەزی لێ دەکەن بۆیان بەردەست دەخرێت، هەروەك چۆن پیاوان ئەوەی حەزی لێ بکەن ئەوا بۆیان جێ بە جێ دەکرێت بەهەمان شێوەش ئەوەی ئافرەتان حەزی لێ بکەن بۆیان جێ بە جێ دەکرێت.

وە لە ئایەتێکی تردا زیاتر ئەم مانایەمان دەست دەکەوێت تا نەڵێن ئەوە قەناعەتی خۆتە. ئایەتەکە دەفەرموێت:{ يُطَافُ عَلَيْهِم بِصِحَافٍ مِّن ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ الْأَنفُسُ وَتَلَذُّ الْأَعْيُنُ وَأَنتُمْ فِيهَا خَالِدُونَ}(الزخرف:٧١) ـ الأنفس . كۆی ـ نفس ـ ە کە ئەمەش هەردوو ڕەگەزەکە دەگرێتەوە، ئیتر ئەوەی کە جەنابت کاکە ئازاد دەتەوێت بەدی بێت و قورئان باسی بکات ئەوا باسی هاتووە بەڵام بە شێوازێك کە پەرژین و قایمکاری لایەنی دەرونی و بەرز ڕاگرتنی شێوازی دواندنی بریندار نە کردنی هەست و سۆزی بەرامبەری لەخۆ گرتووە.

ئازاد وتی:

ڕاستە ئافرەتی لای ئێمە لە باس و خواسی لەم جۆرە خۆیان بە دوور دەگرن بەڵام ئافرەتی ڕۆژئاوا بەم جۆرە نیە، زۆر بێ باکانە ئەم باسە لەگەڵ دایك و باوکی دەخاتە ڕوو، بگرە زۆر ئاساییە بەلایەوە کە خۆی بەملاو لادا بگەڕێت تا کوڕێك بدۆزێتەوە کە خۆی بە دڵی بێت و بکاتە هاوسەری خۆی.

وتم: قسەکەی جەنابتان راستە، ئەمەش وا نەزانیت لە بەخت سپییەتی بگرە بەهۆی ئەم بارە خوازراوەوە دوچار بە زۆر گرفتی جۆراوجۆر بۆتەوە.

با بزانیت سروشتی رەگەزی ـ مێ ـ وایە لە هەر کوێیەك دابێت ئەوا ـ داواکراوە ـ نەك ئەوەی ئەو ـ داواکار ـ بێت، بەم چونە ـ داوالێکردنە ـ ی هەست بە جوڵەو خورپەی مێ بوونی خۆی دەکات و خۆی پێوە هەڵدەواسێت.

بەڵام ئەوەی ئەمڕۆ ئێمە لە رۆژئاوادا دەیبینین ئەوەیە کە ئاسانکاری و بەیەکگەیشتنی کوڕو کچ ـ مەبەست لایەنی سلبی ئاسانکاریە نە لایەنی ئیجابی ـ بەبێ ئەوەی هیچ مەسرەفێکی تێ بچێت و لەولاتر ئەو هەموو لادانە لە ئەخلاق و خۆبەستنەوە بە کاری نا ئەخلاقی جۆراو جۆر وای کردووە کە خواستی چونە ناو کەژاوەی هاوسەرگیری لە رۆژئاوا کەم ببێتەوە. لات سەیر نەبێت کە گۆڤاری News Week لە ژمارەی مانگی یەنایرساڵی ١٩٩٧دا لە میانەی لێکۆڵینەوەیەکی دوورو درێژدا بە ناونیشانی(مردنی هاوسەرگیری) باس لەوە دەکات کە ئەم قەیرانە چ بەڵایەکی بەدوای خۆیدا هێناوە هەروەك چ بەڵایەکی بەسەر خۆیدا هێناوە هەروەك چ بەڵایەکی بەسەر منداڵدا هێناوە، کاریگەری خراپی ئەم(مردنی هاوسەرگیریە) لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئافرەت بەو سروشتی خۆی حەز بە دایکایەتی دەکات و ئارەزوویەکە لە ناخیدا کڵپە دەدات. بەدی هاتنی ئەم خواستەی ئافرەتیش لە رێگەی هاوسەرگیریەوە دەبێت. هاوسەرگیریش بەو شێوەیەی کە گۆڤارەکە باسی دەکات بازاڕی روو لە کەساسیە، ئیتر ئافرەت بۆ جێ بە جێ بوونی یان بڵێین بەدەمەوە هاتنی ئەم حەزەی دەکەوێتە بەردەم دوو رێگا چارە:

یەکەم/ لە دەرگای - کور- بدات و داوای لێ بکات هاوسەرگیری لەگەڵ ببەستێت ئەگەر بەختی هێنای و چانسی گرتنی ئەوا باشە ئەگینا خاڵی دووەم چاوەڕێیەتی.

دووەم/ خۆی بدات بە دەست هەرکەسێکەوە کە خوازیاری ئەوەیە چێژ لە لاشەی وەربگرێت ئەمەش بۆ ئەوەی منداڵێك بەدەست بهێنێت تا حەزی دایك بوونی خۆی و تاسەی دایکایەتی پێ تێر بکات. کەواتە ئافرەت لە هەر کوێیەك بێت و هەر کێیەك بێت ئەوا - داوالێکراوە - نەك - داواکار - ئەو بارو دۆخە نەگونجاوەی رۆژئاوا وای کردووە کە - کوڕان - یش پشت بکەنە ژنهێنان چونکە هاوسەرگیری و پابەندبوون و بەرپرسیارێتی تیایاە ئەوانیش نایانەوێت سەری خۆیان بەو جۆرە کێشانەوە بهێشێنن، ئەمەش بۆتە مایەی ئەوەی ئافرەت لە سروشتی خۆی لابدات و بە ئاشکرا داوای پیاوان بکات.

با شتێکی خۆشتان بۆ بگێڕمەوە، خزمێکم کە چەند ساڵ لە ئەمەریکا ژیاوە، لەوێ لەسەر داخوازی ئافرەتەکە کە دەست پێشخەری کردووە خەرجیەکەی لە ئەستۆ گرتووە ئەمیش ژیانی هاوسەرگیری لەگەڵدا ئەنجامداوە دوای ئەوەی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بۆ سەردان هاتنەوە بۆ لای خۆمان، ئافرەتەکە سەیری کرد لای خۆمان شتەکە پێچەوانەی ئەوان و هاوتەریبی سروشتی ئافرەتە بەوەی کە پیاوان دەچنە داخوازی ئافرەتان، ئەم ئافرەتە تکاو داواکاری زۆری لە هاوسەرەکەی کرد کەوا بە هیچ جۆرێك لای خزمەکانی باسی ئەوە نەکات کە ئەم - واتە ئافرەتەکە - داوای کردووەو دەست پێشخەر بووە لەوەی خۆی داوای هاوسەرگیری لە ئەم کردووە ..... (پێکەنین).

کەواتە قورئان کە پەیامی خوایە سیفەت و خەسڵەتی هەردوو ڕەگەزی پیاو ئافرەت دەناسێت، وە هەر وەکو ئەوەی چۆن بگونجێت و بشێت ئاوا گوتار ئاراستەی هەردوو ڕەگەزەکە دەکات، هەردوو ڕەگەزەکەی دڵنیا کردۆتەوە کە بە هەست و هەموو ئەوانەی کە حەزی مرۆڤەکان خوازیاریەتی - بە ژن و پیاوە - بۆیان فەراهەم هێنراوە.

هاتنەوەی تریفە خان گۆڕانێکی تری بە دانیشتننەکەدا هێنا، داوای لێبووردنی کرد لەوەی کە ماوەیەك لێمان دابڕا .... ئەم دابڕانەی کردە پاساو بۆ ئەوەی چاوەڕێی ئەوە نەبێت ئاخۆ کەس پرسیار دەکات یان نا، بۆیە وتی:

شتێك کە من لێی بێزارم ئەوەیە کە لە قورئاندا لە ئایەتی{وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالأُنثَى}بە ئاشکرا دیارە کە ئافرەت لە دوای پیاوەوە دێت و هەرگیز پیاو وەك ئافرەتان نین.. ئەمە قسەی موفەسیرو بیرمەندی ئیسلام نیە تا ڕەتی بکەیتەوە ئەمە ئایەتی قورئانە.

وتم:

زۆر حەزم دەکرد لە بواری ڕەوان بێژی زمانی عەرەبی شارەزا بوونایە تا بتانزانیایە کە تەنها لە رووی ڕەوان بێژیەوە چەندە وردەکاری و ئاماژەی پێچەوانە بەو تەفسیرەی جەنابت بەدەستەوە دەدات، لە لایەکی تردوە جەنابت ئەم ئایەتەت لە شوێنی خۆی دەرهێناوەو بەجیا لە ئایەتەکانی پێش خۆی ڕاڤەی دەکەیت کە هەرگیز وانیە. لەسەر مەزهەبی - لا تقربوا الصلاة - بەلای باسەکەدا دەچیت.

یەکێك لە روخسارە درەوشاوەکانی ڕێزگرتنی ئیسلام لە ئافرەت بریتیە لە پێدانی ماف و بەخشینی ڕێزو کەرامەت وەکو ڕەگەزی بەرامبەر کە پیاوانە،

هەروەها ئیسلام هەستاوە بەلابردنی ئەو کۆت و بەندەی کە کرابۆوە گەردنی ئافرەت لە میانەی هەنگاوی چونە پێشی کۆمەڵگا بڕستی لێ بڕی بوو، قورئانی پیرۆز لەم بوارەدا ئاماژە بە زۆر لەو ئافرەتانە دەکات کە لە نمونەی بەرزو بێ وێنەن لە پەرستن، سیاسەت، کۆمەلایەتی، جهاد، .. هتد .

گەورەترین نمونەی ئافرەت کە خوای گەورە لە مێژوودا رێزی لێ نابێت حەزرەتی ـ مەریەم ـ ە کە خوای گەورە هەڵی بژاردووەو بە شێوەیەکی رەها فەزڵی داوە بەسەر ئافرەتانی تردا {وَإِذْ قَالَتِ الْمَلاَئِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللّهَ اصْطَفَاكِ وَطَهَّرَكِ وَاصْطَفَاكِ عَلَى نِسَاء الْعَالَمِينَ}(آل عمران:٤٢).

هەروەها پێغەمبەر(د.خ) لە فەرموودەیەکدا ئاماژە بە حەزرەتی ـ مریم ـ دەکات وە بە (خانمی ئافرەتانی بەهەشت) ناوی دەبات، وە چاکەو پەرستنی بە رادەیەك بووە کە خەڵکی دەوروبەری بە{يَا أُخْتَ هَارُونَ }(مريم:٢٧) ناویان دەهێناو قسەیان لەگەڵ دەکرد هەرچەندە جیاوازی کات لە نێوان حەزرەتی مەریەم و هارونی برای حەزرەتی موسادا زۆر دورر بوون لە یەکەوە، بەلام دیارە نەسەبی ـ روحی ـ لە نێوانیاندا زۆر نزیك بووە.

(بنی ئیسرائیل) بە نمونەو سەرمەشقی خۆیان سەیریان دەکردو باسیان دەکرد، تەنانەت منالٚ بوون و بوونە دایکایەتیشی بە شێوەیەك بوو کە جگە لە حەزرەتی ـ ئادەم ـ کە یەکەمین کەسە بەو شێوە ـ معجزة ـ ئاسایە لەدایك نەبووە.

بەم شێوەیە خواستی دایکی مەریەم گەورەتر لەوەی کە بیری دەکردەوە بەدی هات، کە ئەو خوازیاری کوڕ بوو بۆ ئەوەی بیکاتە خزمەتکاری پەرستگا بەوەی کە نەك بە تەنها بوو بە دایکی کچێك کە لە سەردەم و شوێنی

دیاریکراودا خەریکی پەرستن بێت، بەڵکو بوو بە دایکی کچێك کە لە باوەشی ئەودا گەورەترین ڕێپیشاندەر کە پێغەمبەر - عیسی - یە(سەلامی خوای لێبێت) گۆش بکرێت، بۆیە لەدایك بوونی - مریەم - بۆ دایکی، جێگای سەرسوڕمان بوو نەك لەبەر ئەوەی کە کچە، بەڵکو ئەم دایکە تەمەنی بەرەو پیر بوون دەڕۆیشت و منداڵی نەبوو حەزی دەکرد کە کوڕێکی ببێت و لەسەر خۆی - نذر - کردبوو کە کوڕەکەی تەنها بۆ بەندایەتی کردن و پەرستنی ناو پەرستگا تەرخان بکات و نەهێڵێت خەریکی ئاوڕدانەوە بەلای دنیادا بێت. {فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّي وَضَعْتُهَا أُنثَى وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالأُنثَى وَإِنِّي سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وَإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ} (آل عمران : ٣٦ )

ئەمە بە کورتی ئەو دیمەنە قورئانییەیە کە خوای گەورە لە چەند سورەتێکدا ئاماژەی پێداوە، جا خاڵی گرنگ و جێگا باس ئەوەیە کە هەندێ کەس(ئاوڕێکم بۆ لای تریفە خان دایەوە) دەیانەوێت بە زۆر ناڕاستەی تێگەیشتن لەم ئایەتە کە دەفەرموێت:{وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالأُنثَى}بۆ بەرژەوەندی ئایدلۆژی خۆیان بگۆڕن و بەزۆر مانایەکی بەسەردا بسەپێنن کە گوایە قورئان دەڵێت(رەگەزی نێر لە چاکەو باشی وەك رەگەزی مێ نیە لە کەموکورتی !!!) کەچی سەدلەسەد مەبەستی قورئان پێچەوانەی ئەم تێڕوانینەیە هیچ پەیوەندیەکی بەو دەرەنجامە سەقەتەوە نیە.

ئەو ئەرك و کارەی کە دایکی مەریەم لەلای خۆی گەلاڵەی کردبوو وای دانابوو کە تەنها بە کوڕ بکرێت بۆیە لە ئایەتی پێشتردا دەفەرموێت:{قَالَتْ رَبِّ إِنِّي وَضَعْتُهَا أُنثَى}بەلام خوای گەورە بە جەختکردنەوە - تأكید - وە وەلامی دەداتەوە{وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ}کە ئەمەش لە لای خوای گەورە بۆ بەرز ڕاگرتن

و بە نرخی و بەهای بەرزی ئەو کچەی کە پێی بەخشراوە هاتووە، بەلاَم دیارە دایکی حەزرەتی مەریەم وانابینێت کە ئەوەی ئەم بڕیارەی داوە لە خواپەرستی و ملکەچی و بەندایەتی کردن لەم کچەدا بە باشترین شێوە پیادە دەکرێت، ئەگەر بیزانیایە هەرگیز دلگران نەدەبوو، چونکە ئەوەی کە ئەم دەیەوێت زۆر زیاتر لەوە هاتۆتە دی، کەواتە ئەو کوڕەی کە داوات کردبوو بیکەیتە خزمەتکاری پەرستگاو خواپەرست ئەوا هەرگیز وەك ئەم کچە نیە کە پێت بەخشراوە لە بەرزی و خواپەرستی و بەندایەتی کردنیدا بۆیە ئەم کچەی کە پێت بەخشراوە لەو کوڕە باشترە کە داوات دەکرد {وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالأُنثَى}.

خاوەنی تەفسیری ـ الكشاف ـ دەڵێت:(ئەگەر بلێیت بۆچی دەڵێت:{إِنِّي وَضَعْتُهَا أُنثَى}و مەبەست لەمە چیە؟ ئەوا لە وەلاَمدا دەڵێم: هیواو ئاواتێك کە ئەم دایکە خۆی بۆ دانابوو بێتە دی، نەهاتە دی، چونکە ئەو کوڕێکی دەویست کە تەنهاو تەنها خەریکی خوا پەرستی بێت، کەچی ئەم ئاواتەی وەدی نەهات و کچی بووکاتێك کە خوای گەورە دەفەرموێت: {وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ}

ئەوا بە نرخی و گەورەیی ئەو کچەی کە پێت بەخشراوە زاترە لەو کوڕەی کە داوات کردووە دەردەکەوێت ئەو جۆرە رازو نیازەی دایکی حەزرەتی مەریەم هێندەی پێنەچوو کە ئارامی دڵنیا بوون و رازیبوون بە قەدەری خوا زیاتر لە دڵیدا جێگیر بوو).

ناوی مەریەم واتە ـ خوا پەرست ـ وەداوای کرد کە خوای گەورە چاودێری بکات، خوای گەورە نزاکەی لێ وەرگرت ویەکێك لە پێغەمبەران(ع.س) کە زەکەریایە ـ خستیە ژێر چاودێری خۆیەوە. بوو بە سەرپەرشتیارو بەخێوکاری، بە کورتی دەگەڕێنەوە بۆ ئایەتی:{وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالأُنثَى}دەڵێین کە هیچ

پەیوەندیەكی نیە بەو مانا داتاشراوەو هەڵبەستراوەی كە هەندێك بە زۆر دەیهێننە ناوەوە گوایە كوڕ فەزڵی بەسەر كچدا هەیە !!

ئەم ئایەتە لەگەڵ ئەو بەسەرهاتەی پێشوەوە بەستنەوەی بەو ئایەتانەی باس لە ئافرەت دەكات بەم دوو واتایە دێت:

یەكەم/ تایبەتمەندی: كە هەردوو ڕەگەزی نێرو مێ ناكرێت هەریەكە لەم دوو ڕەگەزە جیاوازە ببێتە بەدیلی ئەویتریان، بەلاّم لە بەرامبەریشدا كەسیان فەزڵیان بەسەر كەسیاندا نیە، دەگونجێت یەكێكیان بەكارێك هەستێت كە ئەویتریان نەتوانێت ئەنجامی بدات.

دووەم/ دڵنەوایی: بۆ دایكی مەریەم و ڕەواندنەوەی خەم و خەفەت كە بە هۆی نەهاتنەدی خواستەكەی دوچاری بوو، چونكە ئەم لای خۆی بۆ ئەو كارە ڕەگەزی كوڕی پێ باشتر بووە لە كچ !!

بەلاّم خوای گەورە ئەم تێڕوانینە ڕاست دەكاتەوەو گوتارێك ئاراستەی كۆمەڵگا دەكات كە نابێت خەفەتبار بن خوای گەورە نیعمەتێكی پێ بەخشیون زیاد لەوەی كە چاوەڕوان بوون بەمەش - إعتبار- ێكی گەورەی گێڕایەوە كە نەك تەنها بۆ ئەم كچە تازە لەدایك بووە بەڵكو بۆ سەرجەم ئافرەتان بە گشتی.

سەربەست وتی:

لە ئایەتێكی قورئاندا باس لەوە دەكات كە خوا ناهێڵێت ئاسمان بەر زەوی بكەوێت !!

ئێستا بەس من بە جەنابت و ئەم بەڕێزانەی ئامادەبوو دەڵێم: شتی وا چۆن دەبێت ئاسمانێك كەكەس نازانێت پانایی و ڕووبەری چەندە بەر زەویەك بكەوێت كە هێندە بچوكە لە ئاستیدا هەر بەراوورد ناكرێت؟

وتم: دیارە مەبەست لە ئایەتی{... وَيُمْسِكُ السَّمَاء أَن تَقَعَ عَلَى الْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِ إِنَّ اللَّهَ بِالنَّاسِ لَرَؤُوفٌ رَّحِيمٌ}(الحج : ٦٥)

بەڵام تۆ خۆت ئەم تێگەیشتنە لە ئایەتەکە وەردەگریت، کە مەبەستی سەرەکی ئەوەیە خوای گەورە زەوی لەو پارچە ـ نیازك ـ ئەستێرە جۆراوجۆرو کلکدارانە دەپارێزێت، دیارە ئەم باسە زانستیە ئێستا وەرە با بزانین ئاژانسی ئاسمانی ناسا چۆن باس لەوە دەکات کە ڕۆژانە یەك(طن/مترى) لە بەردو نیازك ... هتد دەکەوێتە سەر ڕووی مانگ کە زۆر ئاساییە بە هەمان شێوە بەر زەویش بکەون.

دکتۆر عبدالدائم کحیل دەڵێت:

لە ڕاستیدا وەختی خۆی من ئەم پرسیارەم ئاڕاستە کرا نەمزانی وەڵامەکەی چیە، تا ئەوە بوو پێگەی ناسای ئەمەریکی مەقالەیەکم بەم ناونیشانە بینی واتە The skyis Falling- کەوتنی ئاسمان ـ

زۆرم لا سەیر بوو کە ئەم دەزگا ئاسمانیە گەورەیە هەمان دەستەواژەی قورئان بەکار دەهێنێت، وەیان چۆن ئاسمان بەسەر مانگدا دەکەوێت.

Bill Cooke لە ئاژانسی ناسا دەڵێت:

ڕۆژانە یەك(طن/مترى)لە پارچە بەردو نیازك تەپ وتۆز بە خێرایی سەدان کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا دەکەوێتە سەر ڕووی مانگ.

کەشتیەوانانی ـ ئەپۆلۆ- چنسیان باش بوو کە بەریەك لە هیچ کام لەو تەنانە نەکەوتن، وە ئەوان دەڵێن کە دانیشتوانی زەوی بەهۆی بوونی بەرگە هەواوە کە بە توندی پارێزگاری گۆی زەوی دەکات هەست بە بوونی ئەو تەنانە

ناکەن، کەشتیەوانانی بواری ئاسمانی کەسەیری مانگیان دەکرد وایان زانی ئاسمانی بەسەردا کەوتووە.

ئیت کاك سەربەست ئەم ئایەتەی قورئان بۆچونێکی سادەو سەرپێی نیە بەڵکو راستیەکە لە راستیە زانستیەکان، ئەوەی مانگی لە نزیکەوە بینیبێت هەستی پێ دەکات، بۆیە قورئان لە سەردەمێکدا باس لەو نیعمەتە دەکات کە خوای گەورە زەوی دەپارێزێت ئەوا کەس ئەم باسەی بە بیردا نەهاتووە، پێغەمبەر(د.خ) پێش ١٤٠٠ ساڵ بێ باوەڕانی ئاگادار کردۆتەوە کە ئەگەری ئەوە هەیە خوای گەورە بێ باوەڕان بەهۆی تەنێکی بەردیەوە لەناو بەرێت. بەلاّم ئەوان گاڵتەیان پێ دەهات، ئەمڕۆش خەڵکانێك هەن هەمان قسەی بێ باوەڕانی پێشوو دوبارە دەکەنەوە، بەلاّم زانایانی ئێستا هەمان فەرموودەی پێغەمبەر(د.خ) جەخت لێدەکەنەوە. کە دەگونجێت نیازکێك کە(پارچە بەردێکی زەبەلاحە) بەر گۆی زەوی بکەوێتو ژیان لەسەر زەوی نەهێڵێت,

رزگار وتی:

مامۆستا خۆ فلیمی ٢٠١٢ کە لە ئەمەریکا بەرهەم هاتووە هەر باسی ئەمە دەکات کە تۆ باسی دەکەیت.

سەربەست داوای روخسەتی کردو وتی:

ببورن با ئەم پرسیارەش بکەم:

وتم: فەرموو.

وتی: ئەگەر جەنابت باش سەیری نەخشەی ولاّتانی شام و میسرت کردبێت نەك ئێستاش بگرەبە درێژایی مێژوو ئەوا دۆڵێك نادۆزیتەوە کە ناوی(الوادي الطوی) بێت، وەك ئەوەی قورئان لە سورەتی(طه:١٣){ إِنِّي أَنَا رَبُّكَ فَاخْلَعْ نَعْلَيْكَ

إِنَّكَ بِالْوَادِي الْمُقَدَّسِ طُوًى } باسی کردووه. من خۆم زۆرم سەیر کردووەو پرسیاریشم کردووه بەلاّم شتی وا بوونی نیه. ئیتر ئەم قسەیەی قورئان لە کوێوه وەری گرتووه .؟

وتم: ئەگەر فەسڵی بەهار برادەرەکانت پێش تۆ چوون بۆ سەیران تا جێگایەکی باش بگرن تەلەفۆنت بۆ کردن لە کوێن؟ وتیان لە بناری شاخە بەرزەکەداین. ئایا هەست دەکەیت کە ئەوانت ون کردبێت و نەزانی لە کوێن ؟

وتی: نەخێر.

وتم: دەی باشە خۆ لەم بەشەی کوردستانداو بەشەکانی تریشدا شاخێکمان نیە ناوی ـ شاخە بەرزەکە ـ بێت، ئەوە نەخشە بست بە بست سەیربکە شتێکی وا لەو جۆرە دەبینیت؟

وتی: شاخە بەرزەکە، دارە گەورەکە، گۆمە قوڵەکە، ... هتد . ئەمانە وەسفن بۆ شوێنێکی دیاری کراو، بۆیە لەسەر نەخشە دیاری ناکرێت تەنها ناویان دەنوسرێت.

وتم:

وشەی ـ طوی ـ کە لە قورئانداو لەم ئایەتەدا بەکار هاتووه، ئەوا پێشتر لە وەسفی ئاسماندا بەکار هاتووه کە دەفەرموێت:{ وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالأَرْضُ جَمِيعاً قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّموَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ }(الزمر:٦٧)

واتە خوای گەورە بالاّ دەستە بەسەر ئەوەی کە ئاسمانەکان بپێچێتەوە، هەروەك دەبینین لەم ئایەتە پیرۆزەشدا باس لە دەسەلاّتی خوای گەورە دەکات کە

زەوی و ئەم ـ دۆڵـە دەپێـچێتەوە ـ ئـەم کـارە گەورەیـەش گـەورەیی پـەروەردگار دەردەخات.

تریفەخان وتی:

لەڕاستیدا ئەوەندەی ئاگادار بم بزانم هیچ شتێك هێندەی ـ فرەژنی ـ قسەی لەسەر ناکرێتو هێندەش بە ڕۆژگارەکـە نامۆیـە کـە هەسـت دەکـەم ئـەم داب و نەریتە مایەی ئەوەیە لـەناو بـچێت، بـەڵام چـی دەکـەیت ئـەوە لـە قورئاندایـەو لەگەڵ ئەوەی باوەڕم بە قورئانە وەك کتـێبی پـیرۆز!!! بـەڵام هەسـت دەکـەم ئـەم باسە بەسەر چووەو کاتی خۆی باش بووە بەڵام ئێستا فرەژنی باوی نەماوە .؟!

وتم:

لە ڕاستیدا تۆ دەرگایەکت خستە سەر پشت و باسێکت هێنایە پێش کەوا هەست دەکەم زیـاتر بـە نەفسـیێکی ڕەقـەوە مـامەڵـەی لەگەڵـدا دەکـەیت زیـاد لەوەی وەك باسێکی مەوزوعی قورئان بخەیتە ڕوو.

جارێ با بزانیت مەسەلەی فرەژنی مەسەلەیەك نیە ئیسلام دایهێنابێـت و بە فەرزو پیرۆزی دانابێـت فـەرزی کردبێـت بەسـەر مـسوڵمانانـدا ئـەوە دەبوایـە بزانیت.

ئەم باسە ڕیشەیەکی مێژوویی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، کۆنی هەیـە، هـیچ کات پەیوەست نەبووە بە ئیسلامەوە، ئەمەش بۆیە وا ناڵێم کە تەسلیم بە واقیع و دروشمی ڕەنگاورەنگی نان پەیداکردنی هەندێك ڕێکخراو و ناوەندی ئـەملاولا بم. بـەڵکو دەزانم کـە قورئـان کاتێـك ئـەم باسـە دەخاتـە پـێش چـاو وەك چارەسەرێکی چەندین حاڵەتی جیاجیا کە دیـارە هۆکـارو پاڵنـەری جیـاواز لـە یەکتر دەبنە مایەی ئەم باسە بۆ هەندێك کەس ببێتە چارەسەرێکی حاڵەتەکەی.

تریفـە خـان: ئەگـەر بگەڕێیتـەوە بـۆ میـژوو سـەیری یاسـاکانی ژن و هاوسەرگیری تیایا بکەیت تا دەگەیتـە ـ کتـێبی پیرۆز ـ بـە تایبـەت ـ پـەیمانی کۆن ـ کە ـ تەوراتە ـ و پاشان ئەوانیش بگوزەرێنیت و بـچیتە لای یۆنانیـەکای سەدەکانی ٤ـ٥ پێش زایین سەیر دەکەیت یاسـای فرەژنـی کـارپێکراو بـووە، وە دوای شەڕی ـ ئەسینا ـ کە ڕێژەی پیاوان تیایا کەم بۆوە ئەوا بـوو بـە ئـەرکێکی نیشتمانی کـە پـەیمانی کۆنـدا ـ تـەورات ـ پێغەمبـەران لـە حالّـەتی فرەژنیـدا دەکاتە سەرمەشق کە نەك ٤ـ٥ ، بگرە دەیان و سەدان ژنیـان هـەبوو بـە راستـە ئەگەری دەستکاری ئەم دوو کتێبە لە ئارادایە، بەلاّم هـەرگیز ناتوانیـت بـوونی ئەم یاسایە بەرپەرچ بداتەوە.

فرەژنی پێش ئیسلام بە شـێوەیەکی رەهـا لـەناو عەرەبەکانـدا تـا دەگاتـە فارس و جولەکەکان بوونی هەبووە، میـژوو پێمـان دەڵێـت کـە دەسـتەلاّتداران فەرمـانڕەوایانی پێشوو(بە پێکەنینەوە) وەکو ئەوانەی ئەمڕۆ خانووی گـەورەیان دروست دەکرد تا دەگاتە ئەو رادەیەی جێگای هەزار کەس دەبـۆوە، ئەمـەش بـۆ ژن و کەنیزەکەکانیان بگرە هەندێ جار دەیانکردن بە دیـاری و بـۆ ئـەو پاشـاو میرو دەستەلاّتدارانەیان دەناردن کە دەیان ویـست لێیـان نزیـك ببنـەوە، لـەناو جولەکەدا فرەژنی لە شەریعەتیانداو تا ئێستاش بـوونی هەیـە کەسـیش پێیـان نالێت پشتی چاوتان برۆیە.

وە لاتان سەیر نەبێت گەر بڵێم ئێستا لە رۆژئاوادا فرەژنی وەك واقیـع زۆر بە توندی بوونی هەیە.

تریفەخان وتی:

لە رۆژئاوا ئەم شتە بە یاسا بڕاوەتەوە، قەدەغەیە. ئەوەی کە باسیشت کـرد ئەوا لە مێژوودا بووە ئەگینا دۆسیەی ئەوان شتێکی تیایا نیە ناوی ـ فرەژنی ـ بێت؟؟

وتم: تەواوە منیش چاوەڕێی ئەم قسەیەم دەکرد، بـەڵام بـا بزانیـت هەڵـەی جـەنابت لەوەدایـە کـە دێیـت پـرۆژە یاسـای رۆژئـاوام نیـشاندەدەیت کـە مەرەکەبێکەو لەلایەن یاسا دارێژەرانەوە بە جوانترین شێوەی خۆیان خستویانەتە سەر کاغەز منیش کـە باسـی ئەمـە دەکـەم بـاس لـە ـ واقیـع ـ ی کۆمـەڵگای رۆژئاوا دەکەم جەنابت هەقی خۆتە بڵێیت بـە یاسـا فرەژنـی بـوونی نیـە. بـەڵام دەبێت بزانیت کە هەرگیز ناتوانیت ئەوە بسەلێنیت کە ـ فرەژنی ـ بەڵام لە ژێر ناوی جیاجیا لە یەك گێڵ فرێند، عیشقە، هاوڕێ .... هتد.کە هەرچی هاوسـەر لەگەڵ یەکتری ئەنجامی دەدەن ئەمانیش ئەنجامی دەدەن، کەواتـە جیـاوازی چیـە لە فرەژنی، ئایـا لـە ـ فرەژنـی ـ دا بەستنەوەی پیـاو نیـە، بەچـەندین مـەرجی دارایی، دەرونی، ئامادەباشی، ... هتد.

ئەوسا دەتوانیت قسە لەسەر هاوسـەری دووەم بکـات، بـەڵام لـە رۆژئـاوادا دەرگا لەسەر پشتەو بێ هیچ مەرج و ئامادەباشیەك پیـاوان دەکەونـە دروێنـەی خەڵ و خەرمانی حەزو ئارەزوویان کـە تیایـا زەرەرمەنـد هـەر ئافرەتـانن، ئـاخر دروست کردنی رێکخراوی ـ دایکانی شوو نەکردوو ـ مانای چیە ؟

بەڕێزان ، لە ـ فرەژنی ـ ئیسلامدا مەسەلەکە بە ئاشکراو بە رەزامەندی نەك دوو کەس بەڵکو دوو بنەماڵەو خێزان ئەنجام دەدرێت، کە تیایا پیاوان هەموو بەرپرسیاریەتیەکی دارایی خێزانی تازە لە ئەستۆ دەگرن، ئەو منداڵەی کە لە دامێنی ئەم هاوسەرە تازەدا لە دایك دەبێت ماف و داواکاریەکانی وەك

هەر منداڵێکی تری ئاسایی پارێزراوە، بۆیە - فرەژنی - رۆژئاوا تێرکردنی ئارەزووی جنسیە بێ هیچ لە ئەستۆگرتنێکی بەرپرسیارێتی خۆدزینەوەیە لە یاساو راکردنە لە بەرپرسیارێتی ئیتر کامیان شایانی رەخنە لێگرتنە، رۆژئاوا یان لای خۆمان، ئەمەش بابزانیت من هەرگیز لەگەڵ ئەوەدا کە ئەم - بوار - پێدانەی ئیسلام بۆ هەندێ کەس بە مەرجی خۆیەوە لەلای هەندێك خراپ بەکارهێنراوە،ئەوە لە ئەستۆی خۆیانە بەڵام وەکو پرنسیپ و یاسا، کەس ناتوانێت رێگری لێ بکات.

قورئان خۆی باس لەوە دەکات کە - یسوع - ی مەسیح مردوی زیندو کردۆتەوە ، دیارە خۆ پێغەمبەرەکەی خۆتان قەد شتی وای نەکردووە مردوو زیندو بکاتەوە ؟ وە هەر بەدەقی قورئانیش ئەم شتە هەر خوا دەتوانێت ئەنجامی بدات { قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ }(يس: ٧٩) واتە ئەوەی کە زیندوی دەکاتەوە هەر ئەو دروستی کردووە. جا لەبەر ئەوەی - یسوع - مردوی زیندوکردۆتەوە کەواتە - خوایە - ....

وتم :

دیارە ئەم وەڵامەشت هەر لەسەر وەزنی - لاتقربوا الصلاة - وەرگرتووە . بۆیە ناتوانیت یان ناوێریت تەواوی دەقی ئایەتەکان لەم ڕووەوە بخەیتە ڕوو بۆیە هەر خۆت لەلای خۆتەوە خێرا شتێك هەڵدەپڕوزێنیت و ناوی دەنێیت بەڵگە.

ئاخر پێم بڵێ لەکوێ ی قورئاندا باس لەوە نەکراوە کەهەر باسی زیندوکردنەوەی مردوو کرابێت ئەوا لەگەڵیدا (بإذن الله) هاتووە. هەروەك لە ( آل عمران: ٤٩) دەفەرموێت: { وَرَسُولاً إِلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنِّي قَدْ جِئْتُكُمْ بِآيَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ أَنِّي أَخْلُقُ لَكُمْ مِنَ الطِّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْراً بِإِذْنِ اللَّهِ وَأُبْرِئُ

الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ وَأُحْيِ الْمَوْتَى بِإِذْنِ اللّهِ وَأُنَبِّئُكُمْ بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ } وە لـە (المائدة:١١) دەفـەرموێت: {} ئەمـە لەلایـەك، لەلایـەكی تـرەوە حـەزرەتی - مەسـیح - كـارو پیـشەی بـەردەوامی زیندوكردنەوەی مردوو نەبووە بەڵكو ئەو چـەند حاڵەتـە كـەباس دەكرێـت لـە ٣ حاڵەت زیاتر نی یە. كە ئەمـەش خوای گـەورە وەك موعجیزەیـەك نیـشانی ئـەو خەڵكەی داوە تا بڕوا بهێنن.

هەروەك پێغەمبـەرانی پێـشوو تـر لەئەمـەش هەریەكـەیان لـەلای خۆیـەوە جۆرێك — موعجیزەیان نیشانی خەڵكی داوە تا بڕوایان پێ بكەن. ئەوەش بزانە لەسەر دەمی - مەسـیح - دا مەسـەلەی زانینـی زانـستی پزیـشكی بڵاوتـرین جۆری زانست بووە كە خەڵكی عەوداڵی بون . خوای گەورەش هەر لـەو بـوارەی خۆیاندا كە بەدوایدا دەگـەڕان و پـێ ی سەرسـام بـون مـوعجیزەی بۆنـاردن تـا لـەبواری گرنگـی دان و بایـەخ پێـدانی خۆیانـدا دوچـار بەناسـینی توانـا و دەسەڵاتی خوای گەورە ببین.

دوبارە با ئەمەش بەس نەبێت دەبێت ئەوەش بزانیت كە هەر لە كتێبـی — پیرۆزدا — باس لەوە دەكات كە زیندو كردنەوەی مردوو. تەنها و تەنها تایبـەت نەبووە بە حەزرەتی - مەسیح -. بەڵكو ئەم جۆرە موعجیزەیە لەسەر دەسـتی — ( ئیـلیا و ئیایەشع وحزقیال) یش ڕوی داوە. كەچی هیچ كـام لـەم سـێ كەسـە بانگەشەی خودایەتیان بۆ خۆیان نەكردووە هـەر بـۆ نمونـە سـەیری (سـفر ملـوك الأول ١٧ : ١٧ — ٢٤ ) بكـەن بـزانین چـۆن بـاس لـە زیندوكردنـەوەی منـداڵێك دەكات لەسەر دەستی - ئیلیا - وەلە (ملوك الثاني ٤/ ٣٢ — ٣٥) باس لە ئیلیـا دەكات وەلە ( مزقیال ٣٧ — ١/ ١٠ ) باس لە زیندوكردنەوەی سوپایەك دەكات.

ئەمەش بزانە زانایانی موسوڵمان لایان وایە کە بون بە ـ مار ـ ی دارەکەی دەستی حەزرەتی موسا زۆر گەورەترە لە زیندوکردنەوەی مردوویەك چونکە ئەم کارە لەچاو گیان بەبەردا کردنی بێ گیانێك کە رۆژێك لە رۆژان جوڵەی نەبووە گەورەترە وەلەت بونی ئاوی نیل ،لەت بونی بەردێك ،هاتنەدەرەوەی حوشترێك لەو بەردە بێ گیانە هەروەك لەسەردەمی حەزرەتی ـ صالح ـ دا رویدا . وە دروست بونی ـ ئادەم ـ بەبێ بونی دایك و باوك هەموو ئەمانە ـ موعجیزە ـ یەکن کە جگە لە خوای گەورە کەسی تر ناتوانێت بەدیان بهێنێت ، وەکەسیش نەیوتووە کە ئەو خۆی ـ خوایە ـ. چونکە ئەم کارانەی ئەنجامداوە .

جا بەرێزەکەم ئەگەر جەنابتان پرسیارەکەتان وا کرد کەوا قورئان خۆی ئاماژەی بەوە داوە کە ـ مەسیح ـ خوایە (پەنا بەخوا) دەبوایە وەڵامی ئەوەت بزانیایە ئەی بۆچی قورئان ئەوانەی کە ـ مەسیح ـ دەپەرستن ـ بەکافر ـ ناو دەبات و حوکمی بێ باوەریان بەسەردا دەدات { لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ ....}(المائدة: ١٧)، دەبوایە ئەوەشت باش بزانیایە کە مەسیح رۆژێك لە رۆژان بەشایەتی کتێبی پیرۆز نەیوتوە کە ئەو خودایە...

یەکسەر وتی :

دەی باشە بۆچی خەڵکی کورنوشیان بۆ دەبرد؟

هەر چەندە لە راستیدا خەریکن لە ئەسڵی مەسەلەکەی خۆمان کە قسەکردنە لەسەر قورئان دور دەکەوینەوە بەڵام ناچارم وەڵامت بدەمەوە ئەگینا حەزدەکەم ئەم باسانە بۆ مەجلیسێکی تر جێ ی بهێڵین.

مەسەلەی کرنوش بردنی خەڵکی بۆ حەزرەتی ـ مەسیح ـ وەك خۆتان باسی لێ دەکەن و لاتان وایە بەڵگەی بەخوا بونە (پەنا بەخوا)دەبێت بزانیت لە

شەریعەتەکانی پێشودا ئیشێکی ڕێگا پێدراو بووە کە خەڵکی کڕنوش بۆ مرۆڤ ببەن. دیارە ئەمەش وەك ڕێزلێنانیانبوو. هەروەك براکانی یوسف و ئەنجامیاندا و لە کتێبی پیرۆزیشدا ئاماژە بە کوڕنوشی دایکی منداڵەکە دەدات بۆ ـ الشیع ـ وە باس لە کڕنوشی حەزرەتی سلێمان دەکات بۆ دایکی.

کاك سەربەست وتی:

لە قورئاندا لە سورەتی ـ الأعراف ـ کە باس لە ـ ثمود و مدین ـ دەکات کە قەومەکەی صالح و شوعەیب بوون هەروەك خۆتان دەڵێن . قورئان دەڵێت: {فاخذتم الرجفة} کەچی هەر ئەم سزادانە لە شوێنێکی تردا {فأخذتم الصحية} ناودەبات ئێستا دەبێت بزانین کامیانە:(الرجفة)یە یان(الصیحة) ؟

وتم: باجارێ بزانین(الرجفة)(الصیحة) واتای چی یە؟

الصیحة: واتە دەنگێکی زۆر بەرز یان ـ خۆمان وتەنی ـ زرمەو ناڵەیەکی گەورە .

الرجفة: واتە ـ ڕاچڵەکاندن ـ ڕاچڵەکاندنێکی گەورە. خۆشتان وەك من دەزانن ـ ڕاچڵەکاندن ـ لە ئەنجامی بیستنی زرمەو ناڵەیەکی گەورەوە دێت، لەڕوی زانستیشەوە سەلماوە کە دەنگی بەرز کاریگەری مەترسی دار لەسەر لاشە جێ دەهێڵێت. کە بەرەو لێواری مەرگی دەبات جا هەندێك جار ئایەتەکە باس لە پێشەکی دەکات و جارێکی تر باس لە دەرئەنجام دەکات.

یەکسەر وتی:

مەبەستت لە پێشەکی و دەرئەنجام، ئەگەر ڕونتر بدوێین .

وتم:

ئەگەر یەکێك تەقە لەیەکێك بکات دەرئەنجامی ئەم تەقەلێکردنـە کەسـی دووەم دوچاری بەخوێن لەبەر ڕۆیـشتن هـات و مـرد، ئـەوا ئەگـەر وتـت بـەهۆی تەقەلێکردنەوە مرد. قسەکەت ڕاستە، خۆ ئەگـەر وتیـشت لـە ئـەنجامی خـوێن لەبەر ڕۆیشتن مرد، هەر ڕاسـتە، ئەگـەر بڵێیـت بەفیـشەك مـرد ڕاسـتە چـونکە هۆکاری لەبەر خوێن ڕۆیشتنەکەیە، خۆ ئەگەر وتیـشت بـەخوێن لەبـەر ڕۆیـشتن مردووە ، هەر قسەکەت ڕاستە. چونکە باست لە دەرئەنجامەکە کردووە .

یان نمونەیەکی تر ئەو کەسەی کـە دڵـی لاواز بێـت لـە ئـەنجامی بیـستنی دەنگێکـی زۆر بـەرز دوچـار بەوەسـتانی دڵ دەبێـت. جـا ئەگـەر وتمـان بـەهۆی دەنگێکی بەرزەوە مردووە قسەکە ڕاستەو خۆ ئەگەر وتیشمان دڵی وەستاوە هەر ڕاستە. بێگومـان ئەم نمونانە بۆ نزیك کردنەوەی مانا قورئانیەکـە بـوو نـەك بـۆ بەراوردکاری.

تریفە خان ڕوی کردە ئەوان و وتی:

ببورن مـن لام وایە قورئان زەمەنی بەسەر چووە، واتە ئەگەر بەکەڵکی ئـەو سەردەمە هاتبێت ئەوا بەکەڵکی ئێستا نایەت، ناتوانێت لەم سـەردەمەدا بـژی ئەگـەر مـیرات لـەو سـەردەمەدا نیـوە بـۆ ئـافرەت وەرگیرابێـت، کـە هیـچی وەرنەدەگرت یان هەر خۆشی بەشە میرات بۆ دابـەش دەکـرا ئـەوا ناکرێـت لـەم سەردەمەدا هەر بە ١/٢ رازی بین.

ئیتر ئەوان هەر چواریان چـاویان تێـبڕیم و چـاوەڕوانی ئـەوەیان کـرد وەڵام بدەمەوە ... منیش وتم:

سەبارەت بەو قسەیەی جەنابت کـە دەڵێـت قورئـان زەمـەنی بەسـەر چـووە بێگومان لە ناو نوسـەران و توێـژەران، بەمێـژویی بـونی قورئـان یـان قورئـان

هاتووە بۆ کاتێکی دیاریکراو، ناوی دەبەن که دیارە هەمان ئەو مەبەستەیان هەیە کە جەنابت دەڵێی - بەکەڵکی ئێستا نایەت - لەگەڵ گلەیی ئەوەی کەمن ئەو نمونەی تۆ باست کرد من زۆر بەڕونی باسم لە میرات کرد. بەڵام دیارە جەنابت لەبەر هەر هۆکارێك بێت پشتیشت لە وەڵامەکەی من کردبێ ئەوەی ئەو دەمە هیچ تێبینی یەکت لەسەر وەڵامەکەم هەبێت. هیوادارم تەنها لە بیرچونەوەبێت و دەمارگیری لە پشتەوە نەبێت. بوارم پێ بدەن با بە دوو تێبینی وەڵام بدەمەوە:

یەکەم / ئەم قسەیەی - تریفەخان - کەلای وایە قورئان بۆ - مێژوو - بووە و کاتی بەسەرچووە. ئەوا قسەیەکی تازە نی یە، ڕۆشنبیرانی عملانی ڕۆژئاوا زۆر دەمێکە ئەم قسەیان داوەتە پاڵ - تەورات و ئینجیل - ئەوان لایان وابووە کە هەرچی چیرۆك و بەسەر هاتی ئەو دوو کتێبەیە ئەوا تەنها شتێکی - ڕەمزی - بن. بگرە لایان وابووە کە ئاین و ئاینداری شتێکە تایبەت بە قۆناغێکی دیاریکراوی مێژووی مرۆڤایەتی و بەس. ئەمەش بە قۆناغی - منداڵی - عەقڵی مرۆڤایەتی ناو دەبەن بە دوای ئەم قۆناغەشدا بەقسەی ئەوان ئەوا قۆناغی - میتافیزیکا - دێت کە ئەمیش نەماو قۆناغی نوێ - جێگای گرتەوە کەلای وایە زانست هەر ئەوەیە کەلە - واقیع - دایە جگەلە ڕێگای مەعریفەو عەقڵ و تاقیمانە هەستیەکان - التجارب الحسية - هیچ ڕێگایەکی تر نی یە وە ئیتر جگە لەمانە تەنها - بڕوایە - کە هەڵقولاوی ئاینە کە زادەی سەردەمێکی مێژووە و بەکەڵکی ئێستا نایەت مەگەر بۆ ئەوە نەبێت کە غەریزەی پێ کۆنترۆڵ بکرێت و بەس.

ئەمەیە قسە و باسی - بەمێـژوویی بـونی قورئـان - و دەقـە ئایینـەکان کـە زادەی فیکری عملانی ڕۆژئاوا و ڕێسنسیانسی ئەوروپایە.

جا بەڕێزان:

ئەگەر ئـەم قـسەو باسـەی ڕۆشـنفکرانی ڕۆژئـاوا سـەبارەت بـە ئایینەکـەی خۆیان بیانوی خۆی هەبێت و لە هەندێك ڕووەوە شیاو بێت بەتایبەت کە ئـاینی حەزرەتی موسا بۆ کاتێکی دیاریکراو بوو هـەتا ئـەوەی حـەزرەتی - عیـسا - هاتووە ، وە پەیامەکەشیان کە- تەورات و ئینجیل- ە بۆ گـەلێکی دیـاریکراو بووە کە - نەوەی ئیسرائیلن - ئەوا ئەگەر بەهەمان تەرازوو پێوانـەکاری بکرێـت ئەوا کارێکی زۆر نازانستی و بێ ئینسافیە بەرامبەر بە قورئان.

تریفە خان... دیارە لە هەوڵ ئەوەدا بوو بزانێت بۆ، بۆیە یەکسەر وتی:

بۆ فەرقیان چی یە دین هەر دینە، کتێبی پیرۆزیش هەریەکە قورئان بێـت یان تەورات وە یان ئینجیل...؟!

وتم: دەی ئاخر نازانستی بوون و بێ ئینسافی لەوەدایە کە جەنابت ئەمانـە تێکەڵ دەکەیت. قورئان تایبەتمەندی خۆی هەیە جیایە لەو کتێبانەی تر.

دوبارە وتی:

بۆ جیاوازە بزانم جیاوازیەکەی لە چی دایە؟

وتم:

قورئان دواهەمین کتێبی شـەریعەتە بـۆ مرۆڤایـەتی وە کۆتـا پەیامـە کـە دەرگای پێغەمبەرایەتی و پەیامی ئاسمانی داخـست، جـا ئەگـەر ئـەو ڕێـسایەی جەنابت باسی دەکەیت بێین جێ بە جێ ی بکەین ئەوا - بۆشـاییەکەی گـەورە - لە مەرجیعەتی ئاینیدا دروست دەبێت، چونکە لـە دوای پـەیامی ئیـسلامیەوە

هیچ پەیام و ئاینێکی تر بونی نی یە ـ وەحی ـ کۆتایی هاتووە، جا ئەگەر ئەم قسەیەی جەنابتان وەرگرین کە هەرگیز شایەنی وەرگرتن نی یە ئەوا ئەو دەم خەڵکی بە ئارەزوی خۆیان چیان بوێت دەیکەن. چیان بوێت وازی لێ دەهێنێت و نایکەن. بەبیانوی ئەوەی ئەوانە زەمەن تێی پەڕندون ، کەواتە شتێك نامێنێت کە ناوی رێگا نیشاندان و هیدایەتی مرۆڤەکان بێت بۆ چاکەو چاکە خوازی.

دووەم / مەسەلەی مێژوی بون و بەمێژوو بونی دەقە قورئانیەکان کەس لە بواری - پەرستن - دا بەکاری نەهێناوە، ئەوەی کە بەکاریان هێناوە تەنها لەبواری — مامەڵە و معاملات — دا قسەیان لەسەر کردووە، کە ئەمەش جێگای قسە لەسەر کردنە چونکە ئەوان هەڵەن گەر وابزانن لە بواری — مامەڵە و معاملات — دا پێویستیان پێ دەبێت چونکە قورئان زیاتر لەسەر لایەنی ( فەلسەفی ) و (گشتگیری) و( یاسا بنەڕەتی یەکان) و(تیۆرە گشتی یەکان) ی یاساکان وەستاوە. ئەو شتانەی کە جێگیرین ئەوا تەوتو شی کردۆتەوە، کە هەرگیز لە هیچ کات و شوێنێکدا گۆڕنیان بەسەر نایەت، وەك مەسەلە بەها بەرزو ئەخلاقیەکان، یاسا دەستوریەکان کە یاسای تری لێ وەر دەگیرێتەوە، حدود - ەکان کە پارێزەری خواستە گشتی یەکانی شەریعەتن.

ئیتر وردەکاری وردی ئەم بابەتانە بۆ فیقە جێ ماوە، ئەمەش وایکردووە کە بەردەوام لە نوێ بونەوەدا بێت بە پارێزگاری کردن لە مەبەستە سەرەکیەکەی خۆی لە هیچ کات و شوێنێکدا لە واقیع دا نابڕێت. ئەم باسەش تەنها تایبەتمەند ئیسلامیە کە دەقێکی نەگۆڕی ـ خوایی ـ و ـ فقە ـ یکی گۆڕاو ملکەچ بۆ تێگەیشتنی مرۆڤ بەهاوسەنگ رادەگرێت ناهێڵێت جێگیری و

نەگۆڕی دەقی خوایی بەهۆی تێگەیشتنی بەردەوام و گۆڕاوەوە بەردەوام دەق لەدۆگما بون و تێگەیشتنی نوێ لەبێ مەرجەعیەتی ڕزگار بکات.

بەڕێزان:

ئەگەر ئەوانەی بانگەشەی - مێژویی بون – مێژویی – دەقەکانی قورئان دەکەن . بەڕاستی ئەم بانگەشەیان لەلای خۆیانەوە بیێت و لاسایی خەڵکانی تر نەکەنەوە، ئەوا تەنها ئەوەندەی کە قورئان لەسەر لایەنی فەلسەفی و ڕێسا و بنەما گشتیەکان قسە دەکات و باقی وردەکارییەکان بۆ ـ اجتهاد ـ ی مرۆڤەکان جێ دەهێڵێت کە تا عەقڵی خۆیان بخەنە کارو بەس بوو تا ئەو قسەیان نەکردایە، چونکە ئەمە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە قورئان پێویستی بە چەمکی - مێژویی بون - ی ڕۆژئاوا نی یە ئەوەی لەبەرامبەر قورئاندا ئەم قسەیە دەکات ، قسەیەکی بێ بەڵگەیە لانی کەم وتنەوەی قسەی سەر زاری خەڵکانی ترە.

سەربەست وتی:

قورئان کە باسی هاوڕێیەتی دەکات ، جۆرێك ئاڵۆزی تیایە جارێك بە باش و جارێك بە خراپ، ئەوەتا لە (البقرة:٢٥٤) دا دەڵێت:{ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنفِقُوا مِمَّا رَزَقْنَاكُمْ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَ يَوْمٌ لا بَيْعٌ فِيهِ وَلا خُلَّةٌ وَلا شَفَاعَةٌ وَالْكَافِرُونَ هُمْ الظَّالِمُونَ }کەچی لە (الزخرف:٦٧) دا دەڵێت:{ الأَخِلاَّءُ يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلاَّ الْمُتَّقِينَ }

وتم:

ئەگەر پێش ئەمەت بڕیار نەدابێت کە وا ئەم دوو ئایەتە دژبە یەکن، ئەوا زۆر ئاسانی تێدەگەیت کە ئایەتی یەکەم باس لەوە دەکات ، کە هاوڕێیەتی

یەکەمیان بریتی یە هاورێی باش کە ناهێڵێت هاورێکەی دوچار بەخراپە و سزادانی لەسەر کردەوە خراپەکانی ببێنێتەوە. وە ئەگەر لە دنیادا فریایی یەکتر بکەون ، ئەوا لەرۆژی دوایدا فریای یەکتر ناکەون ، ئەم جۆرە لە هاورێیەتی یە باشە و پەسەندە، بەڵام جۆری دووەم ئەو هاورێیانەن کە تەنها ئارەزو بازی و بەسەر بردنی کات و رابواردن کۆی کردونەتەوە وگیانی ـ هاورێیەتی ـ یان بۆ یەکتری تیا نی یە ، ئەوا لەرۆژی دوای دەکەونە گیانی یەکتر هەر یەکەیان ئەویتریان بەسەر لێشوکار و گومراکاری خۆی دەزانێت و پەنجەی کەوتنە ناو گوناه و تاوانی خۆی بۆ هاورێکانی رادەکێشێت لێرەدا هەست بە پەشیمان بوونەوە دەکەن بە پێچەوانەی دەستەی یەکەم.

ئازاد وتی:

لە قورئاندا و لە سورەتی (الأنبیاء:١٠٥): { وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِنْ بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ } ؟

وە بە بەڵگەی ئایەتی (الحجر:٩){ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ } ـ محمد ـ نەیزانیوە قورئان لە دوای ـ الزبور ـ وە دابەزیووە؟

هەروا دوای پرسیارەکە وەستا و خۆی تێك نەدا ، بۆیە منیش کە زانیم بێ دەنگی یەکەی کۆتایی پرسیارەکەیەتی ـ تحدی ـ کردنی منە وتم:

جاریٚ کیٚ وتویەتی کە ووشەی ـ الذکر ـ تەنها و بەتەنها واتای قورئانە؟!

دەبێت بزانیت هەرچی پەیامێك لە خواوە بۆ مرۆڤایەتی دابەزیبێت ئەوا ـ ذکر ـ واتە: یادخستنەوە بۆ نمونە (الأنبیاء:٤٨) دەفەرموێت: { وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى وَهَارُونَ الْفُرْقَانَ وَضِيَاءً وَذِكْراً لِلْمُتَّقِينَ } هەر لە (الأنبیاء:٧) دا دەفەرموێت: { فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنتُمْ لا تَعْلَمُونَ } جا بەرێزم واتای ئایەتی: { وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي

الزَّبُورِ مِنْ بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِي الصَّالِحُونَ }واتـە لـەدوای تەوراتـەوە، نەك ئەوەی لەدوای قورئانەوە وەك جەنابت واتای بۆ دادەتاشێت.

ئەم جارەیان نەیهێشت وەلامەکـەم تـەواو بکـەم خێـرا وتـی، ئەگـەر بـوارم بدەیت و کەوانەیەکم بۆ بکەیتەوە پرسیارێك دەکەم. وتم:

فەرموو:

وتی:

مادام ئێوە لاتان وایە کە ـ ذکر ـ تەنها قورئان نی یە هەموو پەیامـەکانی تریش هەر ـ ذکر ـ ن، کەواتە بەقسەی جەنابتان بێت ئەوا ـ کتێبـی پـیرۆز ـ بـە کـۆن و نـویێ وە پـارێزراون ، کـە ئەمـەش پێـچەوانەی قـسەکانی ئێـستای جەنابتانە...؟!

وتم:

دەبێت بزانیت کە لە ئایەتی{ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ }وشـەی ـ ذکر ـ تەنها مەبەست پێی قورئانە، ئەم قسەیەش لە میانەی زیـاد لـە بەڵگەیـە کەوا دەکەم. ئەگەر سەیری ئایەتەکانی تری ئەم ئایەتەی هەمان سورەت بکـەین دەبینیـت دەفـەرموێت: { وَقَـالُوا يَـا أَيُّهَـا الَّـذِي نُـزِّلَ عَلَيْـهِ الـذِّكْرُ إِنَّـكَ لَمَجْنُـونٌ }(الحجر:٦) ئەمـە گوفتـاری بـێ بـاوەڕانی مەکـە بـووە ، وە پێغەمبـەر (د.خ) پێیانی ووتوە ئەی ئەوکەسەی کە ـ ذکر ـ ت بۆ هاتۆتە خوار .... ـ ذکر ـ ی ئەم ئایەتە هەمان ئەو ـ ذکر ـ یە کە لە ئایەتی دوایدا هاتووە کە مەبەستی پـێ ی قورئانە.

هەروەها سەبارەت بە مەسەلەی دەستکاری کردن و کەم و زیادکردنی کتێبەکانی پێشو(تەورات و ئینجیل.... ) خوای گەورە پەیمانی پاراستنی نەداون و وەك ئەوەی پەیمانی پاراستنی قورئانی داوە.

سەربەست وتی:

دەتوانم بڵێم بەکورتی و بەکوردی قورئان هیچی تازەی تیایا نیە ئەوەی کە باسی لێ کردووە هەر ئەوانەیە کە پێشتر ـ کتێبی پیرۆز ـ باسی کردووە؟

وتم:

منیش دەتوانم بڵێم ئەمە هەر هەمان پرسیارە کە پێشتر وەڵامم داوەتەوە، کە گوایە قورئان تەنها کۆکراوەی هەڵبژاردەی باسەکانی کتێبی پیرۆزە . بەڵام لە ڕاستیدا هەرگیز وانی یە و ئەم پرسیارە خۆی بەڵگەیە لەسەر نەخوێندنەوەو نەناسینی قورئان. جا پێش ئەوەی وەڵامتان بدەمەوە و بۆتان بسەلمێنم کە پرسیارەکەتان هەڵەیەو وانیە، ئەوا دوو تێبینی زۆر گرنگ لە بەرچاو بگرن ، ئەو دەم باشتر لە وەڵامەکەم دەگەن.

یەکەم/ ئێمە بڕوامان وایە ـ تەورات و ئینجیل ـ لە ئەسڵی خۆیاندا و پێش دەستکاری کردنیان هەردووکیان دوو پەیامی ڕێنومایی خوای گەورە بون بۆ شوینکەوتوانیان بۆیە هەرگیز دژایەتی کردنی لەنێوان پەیامەکانی خودا نی یە، بەڵکو تەواوکاری یەکترن ئەوەی ئێمە ئێستا قسەی لەسەر دەکەین، قسەکردنە لەسەر ئەم دوو کتێبەی ئێستا ـ تورات و ئینجیل ـ کە دەدرێتە پاڵ خوا. کە بەلای ئێمە زۆربەی هەرەزۆری دەستکاری کراوە.

دووەم/ دەبێت ئەوە بزانین کە قورئانی پیرۆز هاتووە جەخت لەسەر هەمان پەیام و داواکاری یەکانی کتێبەکانی ـ تەورات و ئینجیل ـ دەکات وە باس لە هەندێك باسی تر دەکات کە ئەوان باسیان لێ نەکردووە.

بۆ وەڵامی پرسیارەکەت دەبێ بڵێم ئەگەر یەکێك بەوردی و دور لەگیانی دەمارگیری جۆراو جۆر بەراوردێکی قورئانی پیرۆز و ئەو کتێبانەی تر بکات ئەوا لانی کەم لە ڕوانگەی ـ بیروباوەڕ ـ یاسادانان و پەرستش و مامەڵە...هتد دەزانیت جیاوازیەکی زۆر بەرچاو هەیە. لەبواری بیروباوەڕدا قورئان باسی یەکتاپەرستی دەکات لەسەرچاوەی بیروباوەڕی دروستە، تەنها خوای گەورە ـ الله ـ بەخودا بزانرێت و جگە لە ئەو هەموو شتێکی تر دروستکراوە، گەردون و دروستکراوەکان هەموو لەژێر فەرمانی خودای تاك و تەنها دان، بەلاّم ئەم بیروباوەڕە بە بەراورد لەگەڵ بیروباوەڕی جولەکە وەك نمونە دەبینین زۆر لەیەك جیان کە لەلای ئەوان خوا هەمان ڕەفتار و ئاکاری مرۆڤ دەکەن. بابڵێین لە باشترین حاڵەتدا لەلای ئەوان خوا ـ تەنها خوایەکی نەتەوەیەکی ـ تایبەتە کە جولەکەکانە و ئیتر خەڵکی تر هیچ. بەهەمان جۆر لەلای مەسیحیەکان کە جۆرەها بیرو باوەڕی تر کە پێچەوانەی یەکتاپەرستی یە هاتۆتە ناو وەك ـ ٣خوایی ـ، قوربانی دان ... هتد. ئەمانە هەموویان پێچەوانەی یەکتاپەرستین ، پاشان هەر لەم بوارەدا بەڕێزتان سەیر بکەن بزانن ئەم کتێبانە باس لە زیندوکردنەوەی لاشە لە ڕۆژی دوایدا دەکەن؟ باسی بەهەشت و دۆزەخ دەکەن؟ کە چی لە بەرامبەردا قورئانی پیرۆز پانتاییەکی فراوان بۆ ئەم بوارە جێ هێشتووە.

وە ئەگەر سەیری بواری ـ یاسادان ـ بکەین دەبینین قورئانی پیرۆز ـ شەریعەتێکی واقیعی ـ هێناوە ، کە تیایە بە هاوسەنگی سەیری بەرژەوەندی هەردوو دنیا دەکات وە بەیەکسانی سەیری خواستەکانی لاشەو گیان دەکات، ئەمەش لە کاتێکدا مەسیحیەت داوای ـ ڕەبەنی ـ و پشتگوێ خستنی داواکاریەکانی لاشە دەکات و داوا دەکات لە ژیان کەنار بگرن و دنیا بەکەم و بێ مانا بزانن.

کە ئەمەش خۆی پەرچە کرداری ئەو ڕۆچونە ناو دنیایەی جولەکەکانی پێش هاتنی مەسیحیەت بوو. قورئانی پیرۆز ئەم هەڵوێستەی مەسیحیەکان سەرکۆنە دەکات و بەکارێکی نا پەسەندی دادەنێت. {... وَرَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَامَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ إِلاَّ ابْتِغَاءَ رِضْوَانِ اللَّهِ ....}(الحديد:٢٢) دەتوانین بڵێین شەریعەتی ئیسلام هاودەم و هاوڕای ئێستا و داهاتوە، خۆ ئەگەر سەیری بواری پەرستن ـ عیبادات ـ بکەین قورئان ئەم ووشەیەی عیبادە بە وشکی و کوت و بەندکراوی چەند هەڵسوکەوتێکی دیاریکراو نابینێت، بگرە پانتایی ژیانی مرۆڤی کردووە بە ـ عیبادەت ـ مەبەست لە ژیان لەلای قورئان عیبادەتە{ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ }(الذاريات: ٥٦)

هەروەك جێگایەکی تایبەتی دیاری نەکردووە کە هەر بەتەنیا لە وێدا عیبادەت بکرێت بەڵکو هەموو شتێکی سەرزەوی یە شوێنی عیبادەت داناوە. لە وانەیە بزانیت کە لە ئاینەکانی تردا ئەمە وانی یە.

تۆ دیسان ئەگەر سەیری بواری مامەڵەکردن بدەین، ئەوا دەبینیت کە زۆر بەڕونی قورئان جیاوازی زۆر بەرچاوی هەیە لەوانە:

١ـ بواری خێزان: تەورات ئـافرەت بـە سەرچـاوەی خـراپ دەزانێـت، بـەلاَم قورئان بەیەك چاو سەیری پلەو پایـەیان دەكـات. بـەگوێرەی توانایـان ئـەركیان بەسەردا دەدات { وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ }(البقرة: ٢٢٨)

٢ــ بـواری ئـازادی و ڕێزگـرتن لـە كەرامـەتی مـرۆڤ: دەبیـنین لـەلای مەسیحیەكان گوێ ڕایەڵی كردنی فـەرمانڕەوا! هەرچـۆنێك بـن وەك گوێڕایـەڵی كردنە حەزرەتی مەسیح، دادەنێت، بەلاَم قورئان مرۆڤ بەكەسـێكی ئـازاد و دور لە هەموو كۆت وبەندێك دەژمێرێت و خاوەن كەرامەتی خۆیـەتی { وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً }(الإسراء: ٧٠)

٣ـ لەبواری شەڕ و ئاشتیدا: قورئان ئەوە جـەخت دەكاتـەوە كـە ئەسـڵ لـە ژیاندا ئاشتی و پێكـەوە ژیانـە. { يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ادْخُلُوا فِي السِّلْمِ كَافَّةً وَلا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ }(البقرة: ٢٠٨) بـەلاَم شـەڕ بەشـێكی كاتی و ناچار دەزانێت ئەمیش بۆ لابردنی دەستی زاڵم و لەسـەر مـەزڵومان و بەرگریكردن لە هەق و ڕاستی دژ بەناهەقی و زوڵم كە ئەم باسـە لـە لـە هـەمو ئایینەكەی تردا بوونی نی یە.

٤ـ لە بواری ماڵ وداراییدا: ئەوسا و ئێستاشی لەگەڵدا بێت لـە لای ئـەم دوو ئاینە سوو خۆری ـ ربا ـ پایەیەكی ئابوری گرنگیـان بـووە. زیـادە ڕۆیـمان نەكردووە گەر بڵێین پارە بۆتە پەرستراو یان بە هەر ئامرازێكی هەق و ناهـەق و چاك و خراپ بێت. لە هەوڵی بەدەست خستنیشیدان.

بەڵام قورئان جارِی شەڕی دژ بە ـ ربا و سووخۆری ـ داوە لەبەرەی مـەزوڵم دژ بە چەوسێنەرانی ئابوری و یاریکردن بەقوتی خەڵك وەستا، وە قورئان ماڵ و سامان بە موڵکی خوا دەزانێت، وە مرۆڤ تەنها ماوەیەکی زۆر کەم ئـەم مـاڵ و سامانەی دەکەوێتە دەست و لـەو دواتـر ورد حـسابی ئـەم مـاڵ و سـامـانەی لێ دەکـەین کەچـۆن پـەیای کـردوە و چـۆن سـەرفی کـردووە{ وَأَنْفِقُوا مِمَّا جَعَلَكُمْ مُسْتَخْلَفِينَ فِيهِ }(الحديد:٧) نمونەی زۆرمان لایە . بەڵام با بەس بێت کە شـایەتی قسەکانم.

تریفە خان کە تا ئەو دەم بـێ دەنگـی هەڵبـژاردبوو زیـاتر گـوێی دەگـرت ئەویش جارێکی تر ئەسکوتی لە باسەکەدا وەرداو وتی:

قورئـان لـە (النـساء:٣) دەڵێـت:{ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ذَلِكَ أَدْنَى أَلاَّ تَعُولُوا } کەچـی هـەر لـە هـەمـان سـورەتدا دەڵێـت:{ وَلَنْ تَسْتَطِيعُوا أَنْ تَعْدِلُوا بَيْنَ النِّسَاءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ }(النساء: ١٢٩) ئا ئەمە خـۆی ڕێگـا گرتن نی یە لە زیاد لە یەك ژن کە پێشتر ئاماژەی ڕێگا پێدانی پێ دابوو...؟

وتم:

دیارە پرسیارەکەت ئاڕاستەی من کرد منیش لە وەڵامدا دەڵێم نەخێر.

تریفـە خـان ئـەو دەرئەنجامـەی جـەنابت لـە خوێندنـەوەی ئایاتەکـەی تێـی گەیشتویت هەڵەیە ئەنجامی دروست ئەوەیە کە ئایەتی یەکەم باسـی چـەمکێکی گەورەو ڕەهای وەك ـ دادپەروەری ـ دەکات لە میانەی مامەڵەکردن لەگەڵ بونی زیاد لەیـەك هاوسـەر . ئەمـەش کـە ئـەو بڕوادارانـە وردیـان کردۆتـەوە بەسـەر مامەڵەی ڕۆژانەو بگرە ناو و هەناوی ناخی خۆیان دا بەشیان کـردوە هەسـتیان کردووە . زۆر گرانە لەگەڵ چەمکی ـ داد پـەروەری ـ بـەو مانایـەی ئـەوان تێـی

گەیشتوون مامەڵە بکەن بۆیە خوای گەورە لە میانەی ئایەتی دووەمدا کە جەنابت بەپێچەوانەی تێدەگەیت ئەو بارگرانی یە دەرونی یە یان لەسەر لادەبات بەوەی بۆیان روون دەکاتەوە کە چەمکی ـ داد پەروەری ـ ئەوەیە کە تۆ مامەڵەی رۆژانەت لەگەڵ هاوسەرەکانت لە دابین کردنی پێداویستی خواردن و پۆشاك و ماڵ و کەل و پەل دەبێت رەچاوی دادپەروەری تەواویان بکەین یەکێکیان بەخزمەت و ئەویتریان بێ خزمەت نەکەیت. یەکێکیان هەموو پێداویستیەکی بۆ دابین بکەیت و ئەویتریان لە حاڵەتێکی ناجۆر کە نە ئەوەیە بێ هاوسەر بێت و ئازاد بیت ، وە نە ئەوەشە خاوەن هاوسەر و پێداویستی جێ بە جێ کراو بێت، لەو نێوەندا جێ ی بهێڵیت، دەبێ ئالێرەدا چەمکی ـ دادپەروەری ـ باس بکرێت . ئەگینا لە دڵدا یەکێکیان لەوی تر خۆشتر بوێت ئەمەیان پەیوەندی بەناخ و هەناو وهەڵچونەوە هەیە. بۆیە ئەم خۆشەویستی یەکێکیان لە بەرامبەر ئەویتریان نابێت کاریگەری بکاتە سەر جیاوازی کردن لە دابینکردنی خۆراك و ئەرك و ماڵ و پێداویستی ئەمەیان وەك مامەڵە دەبێت بەجوانی لە گەڵیاندا مامەڵە بکەین.

کاك سەربەست وتی :

* لە(النساء: ٩٢) دەڵێت: { وكان الله عليماً حكيماً} وە لە (الأحزاب:٢٥) دەڵێت: { وكان الله قوياً عزيزاً} وە لە(النساء: ٩٩) دەڵێت:{وكان الله غفوراً رحيماً}وە زۆر ئایەتی تر هەن کە (کان) سیفاتی خوا ئاوابوو بۆخۆشت دەزانی (کان) بۆ رابردوو بەکاردێت کەواتە دەشێت خوا لە رابوردودا ئاوا بووبێت.

وتم:

ئـەم پرسـیارەی جـەنابت ڕاسـتە لەسـەر قورئـان، پرسـیار دەكـەیت بـەڵام بەشێوەیەكی سەرەكی پەیوەستە بە ـ كات ـ وە دەبێت لە كات تێ بگەین ئەوەم ئاسانە كە قورئان ئەم دەستەواژەیە چۆن بەكار دەهێنێت بۆیە بۆ وەڵامی دەبێ بگەڕێینەوە سەر زانیاریەكانی سەردەمی خوێندنی سەرەتایی و بڵێین: زەمـەن لە بەدوایەكدا هاتنی شەو و ڕۆژ و مـانگ و ساڵ دروست دەبێـت، بـە خولانـەوەی زەوی بەدەوری خۆیدا شەوو ڕۆژو بە دەوری زەویدا وەرزەكان دروست دەبێت، وە بە خولانەوەی مـانگ بەدەوری زەویدا مـانگ و ساڵەكانی لێ دەكەوێتەوە . باشـە پرسیـاری سەرەكی ئەمـەیە پێش دروستكردنی ئەمـانە ـ زەمەن ـ لـە كـوێ بـووە دیارە پێش ئەمانـە شـتێك نـی یـە نـاوی كـات و شـوێن بێـت، كـات و شـوێن دروستكراوی خوای گەورەن، نەك ئەوەی لە پـێش ئـەودا بـن، رابـوردو ئێـستا و داهاتوو . بۆ ئێمە كـە لـەناو سیـستمی شـەو و ڕۆژ و مـانگ و زەویـدا دەژیـن گۆڕانكـاری و گـۆڕان سـیفەتی مەخلەقـە نـەك خـالق وشـەی (كـان) بـۆ ئێمـە رابـردووە بـەڵام بـۆ خـوای گـەورە بـەردەوامی دەگەیـەنێت، واتـە خـوای گـەورە سـیفاتی لـە ئەزەلـەوە ئاوایـە و هـەر واش دەمێنێتـەوە ، بـەڵام ئێمـە و مەخلوقەكانی تر لەژێر كاریگەری رابوردو ئێستا و داهاتوودایین.

وتی: جەمـاعەت ڕێگام بدەن بـا هەنـدێ پرسـیارم هەیـە بیخەمـە ڕوو، وا هەست دەكەم ئەم پرسیارانەم زیاتر لەلا گرنگتر بوو.

بەزەردەخەنەیەكەوە وتم:

دیارە تا ئێستا سەر بەرەكەت خستە ڕوو بزانین ژێر بەرەكەت چی تیایە؟

وتی:

قورئان بە ئاشکرا باس لەوە دەکات کە شوێنکەوتوانی – مەسیح – بەمانا و وشە بڕوایان پیێ ی هەیە، { وَإِنْ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلاَّ لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ قَبْلَ مَوْتِهِ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيداً }(النساء:١٥٩) بەلاّم پێغەمبەرەکەی ئێوە خۆی گومانی هەبووە وەك پێغەمبەرایەتی خۆی بە بەلّگەی قورئان کە دەلّێت:{ وَإِنَّا أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَى هُدًى أَوْ فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ } (سبأ:٢٤) ئێستا دیارە کە کێ جێگای باوەڕو کێش جێگای گومانە.

زانیم کە ئەم جۆرە پرسیارانە مانای ئەوەیە کە هیچی بەدەستەوە نەماوەوە ، بۆیە وەك دواهەمین فیشەك هەلّی گرتووە بۆیە بواری بە هاوڕێکانیشی نەداوە کە پرسیار بکەن سەیریکم کردوو وتم:

دەبوایە باشتر راڤەی ئەم ئایەتە پیرۆزەت بخوێندایەتەوە، ئەگەر خوێندبێتەوە، ئەوا دەتزانی ئەم ئایەتە بە دوو مانا دێت کە هەردووکیان دورن لە دەر ئەنجامی کە تۆی پێ ی گەیشتویت:

یەکەم: هەموو کەسێکی – مەسیحی – لەسەرە مەرگدا بۆی ڕون دەبێتەوە کە – عیسی – بەندەو پەیامبەری خوایە، ئیتر ئەو دەم بۆی دەردەکەوێت کە پەرستنی ئەو جگەلە شوێن کەوتنی – باطل – هیچی نەکردوە چونکە لە مردندا ڕاستیەکان ڕون دەبنەوە . ئەو دەم دەزانیت ئاخۆ کام ڕێگای گرتۆتە بەر بەهەشت یان جەهەنەم.

دووەمیان: ئەوەیە کە ڕاناوەکە دەگەڕێتەوە بۆ حەزرەتی – عیسی( علیه السلام) – دوای ئەوەی لە ڕۆژی دواییدا دێتە سەر زەوی، مەسیحیەکان دەزانن کە ئەمان چەندە هەلّە بوون ، کە ئەو واتە– عیسی ( علیه السلام) – جگەلە بەندەیەکی ڕەوانەکراوی پەروەردگار زیاتر شتێکی تر نی یە، ئەم ئەوە نەبوو،کە

ئەوان بانگەشەیان دەکرد ، ئەمە وەڵامی بەشی یەکەمی پرسیارەکەت.بەڵام بۆ بەشی دووەمیان دەبوایە جەنابتان ئەوەتان باش بزانیایە کە ئایەتی ـ ٢٤ ـ سورەتی (سبأ) کە دەفەرمویێت { وَإِنَّا أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَى هُدًى أَوْ فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ } باس کردنە لە ئەدەبی گفتوگۆو پەیڤین لەگەڵ یەکتر نەك ئەوەی باسکردن بێت لەوەی کە خۆی بەگومان بێت. ئەم ئەدەبی گفتوگۆ کردنە کە ئومێد دەکەم من لەگەڵ ئێوە و هەرکەسێکی تردا بەرچاوم گرتبێت جۆرێکە لە ڕێزلێنانی بەرامبەر هەرچەندە لەگەڵیشیدا تا تەباو را جیاوازبن. ئایەتەکەش بەو مانایە دێت کە تۆ لەگەڵ بەرامبەرت دەئاخڤیت دەڵێیت: لەوانەیە یەکێکمان ڕاست بێت و ئەویترمان هەڵە ناکرێت هەردووکمان هەر ڕاست بین ، ئایا تۆ کە ئەم قسەیە لەگەڵ بەرامبەر دەکەیت بەدگومانی لە خۆت؟

بەئیشارەتێك و سەر راوەشانێکەوە وتی:

نەخێر.

وتم:

تەواوە بەڵام ئەوەیە کە جەنابت ئەدەبی قسەکردن لەگەڵ بەرامبەردا بەکاردەهێنیت، بۆ ئەوەی بکەویتە بیرکردنەوەو بە ڕاوێژکاری تا یەکێکیان هەڵبژێریت کە ڕاسترینیانە؟ ئایا ئەمە باشتر نات گەیەنێتە ئامانج وەك لەوەی تۆ ڕای خۆتی بەسەردا بسەپێنیت؟ زیاتر لەمەش لە ئایەتی دوای ئەمەدا ، دەفەرموێت: { قُلْ لا تُسْأَلُونَ عَمَّا أَجْرَمْنَا وَلا نُسْأَلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ } باشە بڵێ ی بانگەوازی پێغەمبەر (د.خ) بۆ یەکتا پەرستی ئەخلاق پەسەندی — جرەم — بوبێت؟

کاك ئازاد وتی:

*هەرچەندە کاتەکە درەنگە و ماندوشمان کردی بەلاّم حەزدەکەم ئەم پرسیارەم وەلاّم بدەیتەوە.

ئازاد وتی: لە سورەتی (المائدة: ٩٠)دا دەلێت: { يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ }

کە ئاماژە دەدات بەوەی - عەرەق - حەرامە کەچی لە سورەتی (محمد:١٥)دا دەلێت: {مَثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ فِيهَا أَنْهَارٌ مِّن مَّاء غَيْرِ آسِنٍ وَأَنْهَارٌ مِن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ وَأَنْهَارٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّارِبِينَ ..... }

کەچی لێرەدا باس لەوە دەکات رۆژی دوایی لە بەهەشتدا مەی دەخورێتەوە، ئیتر حەرام کردن وحەلاڵ کردن لە پای چی؟ ئەگەر ئەمە دژبەیەکتر نەبن !

وتم: نازانم تۆ لە چ رەهەندێکەوە بۆ مەسەلەکە دەچیت. ئەم دووباسەی جەنابت زۆر لە یەك دوورن هەر حوکمەیان بۆ دنیای تایبەت بە خۆیەتی.

وتی: من قسە لەسەر - عەرەق - دەکەم کە حەرام بێت لە دنیادا ئیتر چۆن لەو دنیا حەلاڵە یان بە پێچەوانەوە کە حەلاڵی ئەو دنیا بێت بۆ لەم دنیادا حەرامە؟

وتم : لەوانەیە بە نمونە قسە بکەین باشتر لە مەبەست تێدەگەیت، تۆ ئەگەر منالەکەت یان برا بچوکەکەت بچێت بۆ قوتابخانە ئەوا پێی دەلێیت: بابە گیان لەسەر عەرەبانەو دەستگێرەکان - لەفە - مەخۆ. ئەگەر حەزت کرد ئەوا لە رێستۆرانتەکەی نزیك شەقامەکە - لەفە - بکرە. دیارە تۆ خۆت دەزانی کە لانی کەمی مەرجە تەندروستیەکانی خواردەمەنی لە یەکەمیاندا بونی نیە بۆیە

ئامۆژگاری دەکەیت کە خۆی بگرێت با لە هەردوکیشیان ناویان ـ لەفە ـ بێت بەلاّم ناوەڕۆکیان زۆر جیاوازە.

جا بەڕێزم ئەمەی کە خوای گەورە حەلاّلی کردووە لەو دونیا زۆر جیاواز ترە لەمەی لەم دونیایەدا خەڵکی دەیخۆنەوە لایەنی کەم زەرەرو زیانی کۆمەلاّیەتی ، دەرونی ، تەندروستی، ئابوری ، ڕێگاو بان...هتد لای کەسمان شاراوە نی یە.

دوای ئەم وەلاّمە بێ دەنگیەك كەوتە نێوانمان ، وا هەستم کرد پرسیارەکانیان تەواو کردبێت، چاوەڕێی قسەکردنێکی ترین یان یەکێکی تریان پرسیار بکات، بەلاّم ئاگادارکردنەوەی کە ئەوەی — نان — ئامادەیە، کەش و هەواکەی گۆڕی جارێکی تر هەموومان ڕومان کردە ژوری نان خواردن. دوای نان خواردن بەپێویستم زانی دوا قسەی خۆم بکەم بۆیە ڕوم تێکردن و وتم:

بەڕێزان:

دەزانم لەوانەیە هەندێکتان وا هەست بکەن هەندێ پرسیار مابێت قسەمان لێ نەکردبێت و بەڕێزتان نەتان خستبێتە ڕوو، بەلاّم خۆشتان دەزانن ئەوەی لای خۆتان بە پرسیاری گرێ کوێرە و پرسیاری بێ وەلاّم بوون هیچیان وا نەبوون، بەڕێزتان بەهەڵە تێگەیشتون. دیارە کەمن ئاوا قسە دەکەم لەڕوانگەی دەمارگیریەوە نیە چونکە لای من دەمارگیری یەکێکە لە خەسڵەتە ناپەسەندەکان کە کەسایەتی مرۆڤ لەکەدار دەکات ،بەڵکو لەڕوانگەی قورئان کە خۆی ئاماژە دەدات و دەفەرمێت: { ذَلِكَ الْكِتَابُ لا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِلْمُتَّقِينَ } و { الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنزَلَ عَلَى عَبْدِهِ الْكِتَابَ وَلَمْ يَجْعَلْ لَهُ عِوَجَا } لەماوەی ئەم ١٤٠٠ ساڵەوە هەرچی وتراوە لە بوختان و گومان و وەهم زیاتر نەبوون کە دژ بە

قورئان نوسراون و وتراون، بۆیە داواتان لێ دەکەم وەك برایەکی خۆتان کە چیدی تۆمەت و گومانی ئامادەکراوی خەڵکی بەبیردۆزی زانستی وەرمەگرن.

کەسی زیرەك و زانست دۆست – خۆش باوەڕی – زیان بەلایەنی زانستی دەگەیەنێت، لاتان سەیر نەبێت کە ئەو پرسیارانەی جەنابتان بەرەو ڕووی منتان کردووە منیش خۆم ئەم پرسیارانەم خوێندۆتەوە ، بەڵام تاکە جیاوازی من لەگەڵ ئێوە کە وای کردووە من لە پرسیارەکارەوە بکاتە وەڵامدەرەوە ئەوەیە کە هەرگیز بەقسەی کەس بڕوام نەکردووە و لەسەر چاوە سەرەکیەکەوە بەدوای وەڵامدا گەڕام.

لە ڕوانگەی کتێبی تەفسیر و زمانەوانی بۆ ماناکان شۆڕ بومەتەوە..

بەڕێزان:

ئەو کەسەی کە ژیانی هەر لە تاریکیدا بەسەر بردبێت و هەرگیز ڕوناکی نەبینیبێت ، ئەوا دەبێت بڵێین مافی خۆیەتی کە لەخەیاڵی خۆیدا وا گومان بەرێت کە خۆر تروسکایی ڕۆشنایی لێ دەرناچێت, چونکە خەیاڵی ئەم نابێتە مایەی ئەوەی خۆر ڕۆشنای خۆی بەسەر زەویدا پەخش نەکات، ئەویان خەیاڵە بەڵام تیشکی خۆر واقیعە.

والحمد لله رب العالمين

عبدالقادر علی

سلێمانی: ٢١ / ٦ / ٢٠١٠

## سەرچاوەکان

١. قورئانی پیرۆز.

٢. القرآن هو ونقض مطاعن الرهبان. د.صلاح عبدالفتاح الخالدي . طبع الأولى- دمشق- ٢٠٠٧

٣. شبهات وردود حول القرآن الكريم. محمد هادي معريفة. طبعة الثالثة ٢٠٠٦ قوم.

٤. شبهات حول القرآن. د.غازي عناية. دار مكتبة هلال- بيروت طبعة الأولى ١٩٩٦.

٥. لايأتيه الباطل. د.محمد سعيد رمضان البوطي طبعة الأولى ٢٠٠٧ دار فكر دمشق.

٦. يغالطونك إذ يقولون . د.محمد سعيد رمضان البوطي [illegible] فارابي – دار إقرأ – طبعة ثالثة ٢٠٠٠

٧. المرأة في الحضارة الأسلامية بين [illegible] والواقع المعيشي. د.علي الجمعة [illegible]



ئەم کتێبە:

★ وەڵامدانەوەی ئەو شبهاتانەیە کە لێرەو لەوێ لەسەر قورئان بە شێوازی جۆراوجۆر بڵاو دەکرێتەوە.

★ خستنە ڕووی ئەو دەرەنجامە هەڵانەیە کە هەندێك کەس و لایەن لە میانەی بڕیاری پێشوەختی خۆیان سەبارەت بە قورئان دەیخەنە ڕوو.

9 642016 101091

١٤٣١ ٢٠١٠